

یادەوەری

# تێکۆشان لە پێناوی مانەوەدا

نووسینی:
حەمەکەریم قەرەچەتانی

یادەوەری

# تێکۆشان لە پێناوی مانەوەدا

## بیرەوەرییەکانی حەمەکەریم قەرەچەتانی

کەریم عەلی محەمەد قەرەچەتانی

٢٠١٩

سلێمانی

**پێناسەی کتێب**

**ناوی کتێب: تێکۆشان لە پێناوی مانەوەدا**
**نـــــووسەر: حــەمەکــەریم قـــــەرەچــەتانی**
**بــــــابــەت: یادەوەری**
**تـــــــایــپ: رەحیم کـەریم عەلی**
**دیـزاینی ناوەرۆك: ئالین دیزاین**
**دیزاینی بەرگ: هـەرێم عوسمان**
**تــــــیـراژ: ٥٠٠ دانە**
**نۆبەتی چاپ: یــــەکەم**
**چاپـــخانە: سەردەم**

**ژ. ســپاردە: لە بەڕێوەبەرێتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمــارەی ســپاردنی ( ١٠٥٧ ) ی ســالّی ٢٠١٩ پێدراوە.**

## نووسەر لە چەند دێڕێکدا

- کەریم عەلی محەمەد، ناسراو بە حەمەکەریم قەرەچەتانی.
- لە ساڵی ١٩٤٥ لە گوندی قەرەچەتان لە دایکبووە.
- لە ساڵی ١٩٦٠ چۆتە ناو بزوتنەوەی کوردایەتی، لە هەمان ساڵدا لە لایەن حکومەتی عەبدولکەریم قاسمەوە بۆ ماوەی ساڵێك گیراوە.
- لە ساڵی ١٩٦٣ بووە بە پێشمەرگە لە ماولیانی لای ڕەواندوز.
- لە ساڵی ١٩٧٤ دوو جار بریندارکراوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ لە دائیرەی ڕەی سلێمانی دامەزراوە.
- لە ساڵی ١٩٧٨ جارێکی تر چۆتەوە خەباتی نهێنی.
- لە ساڵی ١٩٧٩ دووبارە بۆتەوە پێشمەرگە لە (خڕی ناوزەنگ.)
- لە ساڵی ١٩٨٥ پەیوەندیکردووە بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە، تا ئەنفالەکان لە ناوچە ڕزگارکراوەکان درێژەی بەخەبات داوە.
- دوای ئەنفال و لەگەڵ کشانەوەی هێزی پێشمەرگە، بە ماڵەوە لە سەردەشت نیشتەجێ بووە تا ڕاپەڕین. لەگەڵ دەستپێکردنی ڕاپەڕیندا بە نامەی کاك نەوشیروان مستەفا چۆتە میحوەری چوار.
- لە ساڵی ١٩٩٣ دوای دروستبوونی وەزارەتی کاروباری پێشمەرگە لە (لیوای ٢٢) بووە بە ئامرسریە لە فەوجی یەکی بازیان.
- لە ساڵی ١٩٩٤ چۆتە ناوەندی کۆمەڵایەتی سلێمانی وەك ئەندام ناوەند، پاشان بۆتە کارگێڕی ناوەندی کۆمەڵایەتی، ئێستاش ئەندامی ئەنجوومەنی مەکتەبی کۆمەڵایەتییە.
- ساڵی ٢٠١٥ کتێبێکی بەناونیشانی (قەرەچەتان بەدەوری ڕەشکیدا) بەچاپ گەیاندوە.

**پێشەکی:**

لە سادەترین پێناسەدا بیرەوەری بریتییەلە نووسینـەوەی چـەنـد یادەوەرییەك لە لایەن کەسێکەوە دەربارەی سات و قۆناغە جیاجیاکانـی تەمەنی خۆی، لەگەڵ ئەو رووداوانەی خۆی بینیویەتی یان خۆی یـەکـێـك بووە لەو کەسانەی لەناو رووداوەکەدا بـوون، و دەکـرێـت رووداوەکـان تایبەتی یان گشتی بن.

نووسینەوەی بیرەوەری جۆرێکە لە نـووسـیـنـەوەی مـێـژوو، کـە پەیوەندییەکی توندوتۆڵی لەگەڵ یاداشتە کەسییەکاندا هەیە، ئـەمجـۆرە لە هونەری نووسین مێژوویەکی یەکجار کۆنی هەیە، رەنـگـە سـارگـۆنـی ئەکەدی (٢٣٧١ پ. ز – ٢٣١٦ پ. ز) یەکەم کـەس بـێـت لـە مـێـژوودا یادەوەرییەکانی خۆی نووسیبێتەوە و لەسەر تـاتـەقـورپـیـنـەیـەك بـاسـی چۆنێتی لەدایکبوون و گەورەبوونی خۆی دەکات، کـە چـیرۆکـی ژیـانـی سارگۆنی ئەکەدی لەگەڵ چیرۆکی لە دایکبوون و گەورەبـوونـی مـوسـادا زۆر لە یەکدەچن! سارگۆن لە بیرەوەرییەکەیدا دەڵێت: مـن سـارگـۆنم.. پاشای گەورەی ئەکاد، دایکم بە من دوو گـیـان بـوو، بـە نـهـێـنی لـە دایکبووم، لە سەبەتەیەکدا داینام کە لە گەڵای چنار دروستـکـرابـوو، بـە قیر سەبەتەکەی سواغ دا. خستمییەناو رووبارەکـە، نـەکـەتمـەژێـر ئـاو، رووبارەکە بردمی ... هتد.

لە دوای سارگۆنی ئەکادییەوە نووسینەوەی بیرەوەری لـە لایـەن پاشا و دەسەڵاتدار و نـووسـەرەکـانـەوە بـەردەوام بـوو، یـەکـێـك لـە بەنـــاوبانگترین بیرەوەرییەکـــان، بیرەوەرییەکانی یۆلیۆس قـــەیسـەرە (١٠٠ پ. ز – ٤٤ پ. ز) لـەسـەر شـەڕی گـالـەکـان، بـەنـاونـیـشـانـی (روونکردنەوە دەربارەی شەڕی گال). ئەم بـیرەوەریـیـانـەی یـۆلـیـۆس

قەیسەر دەربارەی ئەو رووداوانەیە كە لە نێوان سالآنی (٤٩ و ٤٨ پ. ز) روویانداوە.

لە سەدەكانی ناوەڕاستیشدا هەر یەك لە (فیلاردوین و جۆینڤێل و كۆمینس) بیرەوەرییەكانی خۆیان نووسیوەتەوە، هەروەها لە كۆتاییەكانی سەردەمی رێنیسانسیشدا (مۆنتلوك و مارگرێت ئۆف فالیوس) بیرەوەرییەكانیان نووسیوەتەوە، مارگرێت یەكەمین ژنە كە یادەوەرییەكانی خۆی بەشێوەیەكی نوێ نووسیبێتەوە. یەكێك لە بیرەوەرییە بەناوبانگەكانی رۆژهەلآت لە سەدەكانی ناوەڕاستدا بیرەوەرییەكانی تەیموری لەنگە.

لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە نووسینەوەی بیرەوەرییەكان پەرەیانسەند. بەشێكی زۆر لە پلەدارە بەشداربووەكانی شەڕ و سەرۆكی ولآتان یادەوەرییەكانی خۆیان نووسیوەتەوە، وەك بیرەوەرییەكانی چەرچلێ سەرۆكوەزیرانی بەریتانیا. لە كوردستانیش بە تایبەتی لە دوای راپەڕینەوە، بەشێك لە نووسەران و ئەو كەسانەی بەشداربوون لە خەباتی چەكداریدا، بیرەوەرییەكانی خۆیان نووسیوەتەوە، ئەم پەرتووكەی بەردەستی تۆی بەڕێزیش دەچێتە خانەی ئەو بیرەوەرییانەی كە لە دوای راپەڕینەوە لە لایەن ئەو كەسانەوە نووسراونەتەوە كە لە شۆڕشی چەكداری شاخدا بەشداربوون.

كاك حەمەكەریم قەرەچەتانی بە زمانێكی سادە و دوور لە هەر ئاڵۆزییەك بیرەوەرییەكانی نووسیوەتەوە، لە كاتی خوێندنەوەیدا هەست دەكەیت لە شانۆییەكدا دانیشتوویت و تێكەڵ بە رووداوەكانی دەبیت. من تا ئێستا چەند كتێبێكی بیرەوەریم خوێندۆتەوە، لەناویاندا بیرەوەرییەكانی ئەكتەری كۆمیدی چارلی چاپلن، یەكێك بوو لەوانەی

کاریگەری گەورەی لەسەر دانام، بەڵام ئەم بیرەوەرییانەی ئەم پێشمەرگەیە هێندەی ئەوەی چاپلن و زیاتریش کاریگەری خۆی لەسەر دانام، بەشێوەیەك هەستم دەکرد، منیش یەکێك بم لە کەسایەتییەکانی ناوی، لە زۆر شوێندا ناچار دەبووم دووبارە بیخوێنمەوە، تا وردتر رۆبچمەناو رووداوەکان و هەست بە ژینگەی کاتی رووداوەکان بکەم.

ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە، کاك حەمەکەریم زۆر بە وردی ساڵ و شوێن و کەسەکانی ناو رووداوەکانی ئاماژە پێکردووە، لە زۆر شوێندا وەسفی شوێنی رووداوەکانیشی کردووە، ئەمەش وا لە خوێنەر دەکات تەواو بچێتەناو رووداوەکان و هەست بکات مێژوویەکی راست و دروست دەخوێنێتەوە.

حکمت معروف
١٩ / ٩ / ٢٠١٨
سلێمانی

لە ساڵی ١٩٥٤ تا ساڵی ١٩٥٥ ئەو زەوییانەی فەقێ ڕەشیدی قەشان لە خدراوا و حاجی خەلیفە و بەردەڕەشان هەیبوو دەکەوتەناو مقاتەعە دووی چەرمەگاوە لای گردی جەباری، لەسەر ئەو زەوییانە کێشەی لەگەڵ (حاجی براهیمی چەرمەگا) هەبوو، کە پێیناخۆش بوو لەوێ زەوی کڕیوە، قەرەچەتانییەکان زەوییەکانیان بۆ تووتن و مەرەزە بەکاردەهێنا، بە تایبەتی بنەماڵەی ئێمە و مام حەسەنۆك، کاتی شریت لێدان بوو، شەو چەرمەگاییەکان هاتبوون هەموو توتنەکانی قەرەچەتانیان بە داس هەڵبڕیبوو! بەس تووتنی ماڵی ئەحمەدی حەمەی جومعە نەبێت، کە لەسەر تووتنەکەی کەپری لێدابوو، بەڵام باشیان لێدابوو، فەقێ ڕەشید هات کە جێبێکی کورتی پێبوو بۆ سەردانی زەوییەکان، بەڵام دوای سکاڵای یاسایش هیچی بۆ نەکرا بوو، دوای ئەوە فەقێ ڕەشید یارمەتی جووتیارەکانی قەرەچەتانی دابوو، چونکە کێشەکە لەگەڵ ئەو بوو نەك قەرەچەتانییەکان، ڕۆژی وا هەبوو کە دەهات و دەگەڕایەوە لە چەرمەگاوە تەقەیان لێدەکرد، ناچار باوکم و عەلی سۆیلەی ئامۆزای لەگەڵی دەچوون تا گردەبۆر، بۆ ئەوەی چەرمەگاییەکان ئازاری نەدەن، لەوکاتەدا کێ ئازابووایە زەوی و ئاوی میری داگیر دەکرد و دەیکرد بە هی خۆی.

لە منالێمدا لە گوندی قەرەچەتان لە ساڵی ١٩٥٦ تا ساڵی ١٩٥٩ تا چواری سەرەتاییم لای مامۆستا مستەفا کە ناسرابوو بە (مچەی قالە سوور) خوێندووە، پیاوێکی حولحولی بوو، ساڵی ١٩٥٨ داوای هێلکە و شیر و ماست و داری لێ دەکردین، دەیووت: دەبێت هەر منداڵەی چلێك دار بێنێت کە بەڕێوبەرایەتی پەروەردەی ئەوسا ئەوشتانەی بۆ خوێندنگەکان دابین دەکرد، ئێمەش نەدار بووین لەماڵەوە، نە هێلکەیان

دەداینێ و نە چڵەدار، ناچار لەگەڵی بەشەڕ هاتین بە هاندانی ڕیشسپییەکانی گوندەکە، بەیانی کە هات بۆ پۆل داوای شتەکانی کرد ئێمەش دەستمان کرد بە لێدانی و زۆرمان لێدا، ژنەکەی لە خوێندنگەی کچان مامۆستا بوو ناوی فەخری بوو ژنێکی ژیر بوو، بەگریانەوە وتی: ئێمە غریبین بۆیە وامان لێدەکەن! ئێمەش وتمان: مێردەکەت غەدرمان لێدەکات، داوای شتمان لێ دەکات، لە ماڵەوە نامان دەنێ! بۆیە لێمان داوە!؟ ئێمەش چووینەناو ڕەشکی لە ترسی ماڵەوە تا ئێوارە لەوێ بووین. دوای ئەوە چوون بۆ سورداش بۆ سکاڵا، بەڕێوبەری ناحیە هات بۆ ناودێ و لەگەڵ ڕیشسپییەکان کۆبووەوە و وتی: سکاڵایان کردووە، دەبێت منداڵەکان بێن بۆ ناحیە. ڕیشسپییەکان پێیانوتبوو: ئەو غەدریان لێدەکات و پارەی دار و هێلکە دەخوات، کە معاریف پارەکەی دەدات! کە چووین بۆ ناحیە، شێخ فەتاحی عەوەڵانی لێبوو، منی دەناسی وتی: خێرە چی دەکەن لێرە؟ وتمان: مامۆستا مستەفا سکاڵای کردووە لێمان. بانگی کردین چەند خوێندکارێك چووین و شێخ فەتاح هاتەژووری لەگەڵمان و وەزعەکەمان بۆ باسکرد و لێمانتێگەیشت و شێخ فەتاح وتی: ئەمانە کوڕی ئازان غەدر قبوڵ ناکەن. بەڕێوەبەری ناحیە وتی: منیش گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتە کە تاوانی مامۆستایە، بەڵێنی پێداین و وتی: وا سەری ساڵە هەرچۆنێك بێت ئەمساڵ تەواو بکەن، بۆ ساڵی داهاتوو مامۆستاتان بۆ دەنێرم. لەو خوێندکارانەی هاوبەش بوون لە لێدانی مامۆستا بریتی بوون لە من و صاڵح حسەین و تەیفوری مام عومەر و شەوقی کوێخا وەسمان و نامیق حسەین، بۆ ساڵی ١٩٦٠ مامۆستا مەحمود و مامۆستا یاسینی بۆ ناردین زۆر باشبوون.

ئەم ژیانەم لە منداڵیمدا هەمووی ناخۆش بوو، چۆن مرۆڤ بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشی و دەربەدەرییە دەگرێت! ؟ هەر لەسەرەتاوە کە لە دایك بووم جەنگی دووەمی جیهانی بوو، گرانی بوو ئەوکاتە باوکم جلی لە گوێنی بۆ کردبووم، ئەویش بە بیتاقە لەگەڵ شەکر و چا وەریگرتبوو! لە دوای نەمانی دایکم، ئایشەی پوورم کابانمان بوو، ئەویش شووی کرد، دواتر خزمان یارمەتیان دەداین. ئەحمەدی برام پورزایەکی مارەکراوی هەبوو، باوکم بۆی هێنا، بەڵام ئەویش منالْ بوو هیچی نەدەزانی، لەدوای ئەوە ئەحمەدی برام چوو بۆ سەربازی وەزعمان زیاتر رووی لە خراپی کرد، دوو هێسترمان هەبوو جووتم بۆ خەڵکی بەکرێ دەکرد، یان کاتی گێرە، گێرەم دەکرد، بەوە ژیانمان بەڕێ دەکرد، لەوکاتەدا کە دایکم مرد من و عومەر و حەلاوەی خوشکم منالْبووین، ئایشە و ئەحمەدی برام گەورە بوون، دەچوون بۆ ئیشکردنی تووتن و من لای ئەم دوو منالْە دەبووم، نەماندەزانی تا دێنەوە چی بخۆین! ماڵی حسێنی مامە سوورە هاوسێمان بوون، مینای ژنی زۆر بۆمان باش بوو، زۆر نیوەڕۆ دۆی دەداینێ لەگەڵ نانی گەرم. ماڵی خونچەی دایکی حەسەنی قادری ئامۆزام دەچووین دەری دەکردین! خەجێی خوشکی عەلی سۆیلە بۆمان باش بوو سەری لێ دەداین و جارجاریش خواردنی بۆمان دەهێنا، ماڵی قالە گوڵە ئەویش باشبوون، ژنەکەی دۆی بۆ دەهێنااین بە نانەوە ئەمانخوارد. من لەسەرەتاوە ژیانم بەوجۆرە بەسەر بردووە، ماڵی فاتمی ژنی حەسەن ملبۆری ئامۆزام باش بوون، کە دەچووین دەرینەدەکردین، خواردنی دەداینێ، ماڵی مام عومەری ئامۆزام باش بوون، کچەکانی کە ئاردمان دەبرد بۆیان دەکردین بە نان.

لە زستانی ساڵی ١٩٥٥ لەگەڵ باوکم چووم بۆ راو بۆ شاخی پیرەمەگرون، لای شانی رەبەنە پێیدەگووترا باسکی دیوار، کە شوێنەوارێکی گرنگی ناوچەکەیە، باوکم روانگەیەکی لەوێ دروست کردبوو، ئێستا پێیدەووترێت: روانگەی ئەلە بە ناوی باوکمەوە ناونراوە، چونکە ئەو جێگایەی بۆ راو دروستکرد بوو. لە نزیکی روانگەکە تەڵەی دانابوو ئێمەش لە روانگەکەوە خۆمان مات کردبوو، لەوکاتەدا رێوییەکی فێڵباز هات بە دەوری تەڵەکەدا دەسوورایەوە و بە کلکی گۆشتی سەر تەڵەکە لابرد و خواردی، ئێمەش تا ئێوارە لەوناوە ماینەوە هیچی نەگرت، ناچار باوکم گوژمە مێووژی دەرکرد و خستیەسەر تەڵەکە و هاتینەوە بۆ ناودێ. بۆ رۆژی دواتر چووبووەوە بۆ سەر تەڵەکە چالەکەیەکی گرتبوو هێنایەوە خواردمان. پیشەی راوکەر وابوو ئەگەر تەڵەی بنایەتەوە دەبووایە هەموو رۆژێك بچوایە بۆ سەر تەڵەکە، تا بزانێت هیچی گرتووە یان نا.

لە هاوینی ساڵی ١٩٥٥ بەیانی زوو بەرخەلم لێدەخوڕی بۆ ئەوەی لە نزیکی شاخی پیرەمەگرون بلەوەڕێن، لەبەردەم ماڵی مام عومەر صاڵحی ئامۆزامان بینیم چەند رەشە وڵاغێك هەموو پێکەوە ئاڵقەیان دابوو (واتا سەریان نابوو بەیەکەوە) دەیانبۆڕاند و چاویان زەق دەکردەوە و سەریان نەوی کردبوو بۆ سەر خوێنی وڵاغێکی تر کە پێشتر سەربڕابوو، منیش نەمزانی چییە ترسام و رامکرد بۆ ماڵەوە و وتیان چیبوو؟ بۆچی هاتیتەوە؟ وتم: لەبەردەم ماڵی مام عومەر، رەشەوڵاغ کۆبۆتەوە و دەبۆڕێنن! باوکم هات دەستی گرتم و بردمی بۆ لایان و کە بینی وتی: مەترسە ئەمە گابۆڕە چاویان بە خوێنی وڵاغی تر کەوتووە و گابۆڕ دەکەن، وەکو پرسەی گاگەل وابوو بۆ خوێنی هاوەڵەکەیان، ئیتر دوای ئەوە نەترسام و چووم بەرخەلەکەم برد بۆ لەوەڕ.

ساڵی ١٩٥٩ ئەوكاتە بەڕێوەبەرایەتی كشتوكاڵ تۆوی چەوەنەری شەكری بەسەر جووتیارانی ئەو سەردەمەدا بۆ تاقیكردنوە دابەش كردبوو، من و چەند خوێندكارێكی گوندی قەرەچەتان دەچووین بۆ شیلەخان، پاچەكۆڵەی چەوەنەرمان بۆ شێخ قادری شیلەخان دەكرد رۆژی بە ٥٠ فلس. بیست رۆژ ئیشمانكرد پارە نەبوو بمانداتێ، دوای بیست رۆژەكە لە چەمی شیلەخانەوە بۆ ناودێی شیلەخان كەوتینەڕێ بۆ ئەوەی پارەمان بداتێ، بەڵام شێخ قادر نەهات بۆ ماڵەوە و خۆی شاردەوە و ژنەكەی نانی بۆ دانایین، كە چووینەناو گوندەكە چووین بۆ ماڵی كاكە شێخ، بەڵام كاكە شێخ پیاوێكی زۆر سەغی بوو، كە پارە دەهاتە دەستی بۆ برادەری خەرج دەكرد، بەڵام هەر چۆنێك بێت نیوەڕۆ لەماڵی ئەوان نان خورا و زانی نارۆین هاتەوە ماڵەوە، هەر دڵخۆشی دەداینەوە بۆ ئەوەی رازیمان بكات بەبێ پارە بماننێرێتەوە! بەڵام ئێمە دوای نانخواردن هەندێكمان خەوی لێكەوت، من و چەند برادەرێكی تر ماینەوە و نەخەوتین، كاكە شیخ بە منی وت: ئێوە تاكەی لێرە دەبن؟ منیش بەبێ ئەوەی بۆچوونی برادەران وەربگرم وتم: تا ئەوكاتەی پارەمان دەدەیتێ! وتی: ئەی ئەگەر پارە نەبوو!؟ وتم: هەر لێرە دەبین! ئێمەش نزیكەی ١٠ تا ١٢ كەس دەبووین، خاڵە شیخ چووەدەرەوە، رۆژ ئاوابوو هەر نەڕۆیشتین، دوای چەند كاتژمێرێك هاتەوە وتی: رۆژ ئاوابوو هەر نەڕۆشتن!؟ وتمان: نەوەڵا.. هەم خاڵە شیخ ون بوو هەم رۆژ ئاوابوو! دوایی هاتەوە وتی: بخەون خوا گەورەیە تا بەیانی. بەیانی پارەی دەستكەوتبوو دیار بوو شتی فرۆشتبوو، دوایی زانیمان مانگایەكی فرۆشتبوو پارەكەی بە زیادەوە داپێمان. بەیانی دوای نانخواردن بەرەو گوندی قەرەچەتان بەڕێكەوتین، لە رێگا تووشی مەلا

محەمەدی ژنبرای شێخ یوسف بووین بە سواری گوێدرێژێکەوە وتی: ئەوە لە کوێ بوون؟ وتمان: لە شیلەخان. وتی: خێر بوو؟ ئێمەش وەزعەکەمان بۆ باسکرد، وتی: وەرن بۆ من پاچەکۆڵە بکەن ئەو چەندی داوە پێتان؟ وتمان: رۆژی ٥٠ فلس. وتی: من رۆژی ٦٠ فلستان دەدەمێ، بەلاَم ئەو هەموو رۆژێ رۆژانەکەی دەداینێ، من ئەو پارەیەم لە کوپەیەکدا شاردبووەوە، ئەحمەدی برام لێیبردم دابووی بە کەلوپەل و پێداویستی ماڵ و کە پێمزانی دەستم کرد بەگریان وتم: کاکە پارەکەم؟! لێمتووڕە بوو وتی: داومە بە شەکر و چا، ئیتر منیش نەچوومەوە بۆ پاچەکۆڵە. مەلا محەمەد وتبووی: حەمەکەریم بۆ نەهاتووە بۆ ئیش؟ وتبوویان: کاکی پارەکەی بردووە خەرجی کردووە بۆیە نایەت!؟ ئەویش وتبووی با بێتەوە پارەکەی چەند بووە من دەیدەمەوە بەس بێت بۆ ئیش، چونکە من کرێکارەکانم بۆ دەنارد بۆ ئیش وەکو چاودێر وابووم. کە چوومەوە پێیوتم: پارەکە چەندە؟ وتم: ١٥ پەنجایی. ئەویش دەستی کرد بە گیرفانیدا وتی: هانێ ١٠ رۆپیێ!؟ زۆرم لا سەیر بوو، چونکە نەمدەزانی ١٥ پەنجایی ١٠ رۆپێیە. بەو پارەیە چووم بۆ بازاری سلێمانی قاتێك جلم لێکڕی بە نیو دینار و ئەوی ترم خەرج کرد، یەکەم جارم بوو کە شەرواڵ و مرادخانی بە تازەیی لەبەر بکەم پێشتر هەر هی باوکم و ئەحمەدی برامیان بۆ کورت دەکردمەوە!؟

لە ساڵانی ١٩٥٠ بە دواوە دەرەبەگایەتی گەشەی کرد، کارخانەی بچووك دروست بوو بۆ پیشەسازی لۆکە و خوری بۆ قوماش و کارخانەی جگەرە لە سلێمانی دروست بوو، کە پێویستی بە توتنی سامسۆن هەبوو جووتیار بەرهەمی بێنێت. کۆمەڵێك دەرەبەگ لە شار دروست بوون و پەلیان بۆ گوندەکان هاویشتبوو، دەستیان کردبوو بە سەلەمکردنی

توتن و پەموو، کاتێك جووتیار پارەی نەبووایە دەچوو بۆ لای ئەم دەرەبەگانە پێیدەووت: پارەی دوو فەردە تووتنم بەرێ بە سەلەم، دوای بەرهەمهێنانی تووتن لە ئینحیسار تووتن بە ١٢ دینار وەربگیرایە ئەو بە ٥ دینار لێی سەلەم دەکرد. کاتی فەحسی تووتن ئەگەر ١٠ فەردە تووتنی بەرهەم هەبووایە و ٥ فەردەی سەلەم بکرتایە هیچی بۆ نەدەمایەوە و بە گیرفانی بەتاڵ دەهاتەوە بۆ ماڵەوە!؟

له ساڵی ١٩٥١ لەگەڵ باوکم سواری هێسترێك بووین نزیکەی ٦ ساڵان دەبووم، باوکم زۆری خۆشدەویستم لە رێگا پێیاندەووت: کاك عەلی بۆ کوێ دەچیت؟ دەیوت: دەچم بۆ گولیچە شێخ جەلالی حەفید چەند بنکێك چناری داوە پێم دەچم دەیبڕم، کە چووینە ئەوێ لە سێبەرێك دانیشتم باوکم دەستی کرد بە چنار بڕین، کاتی نیوەڕۆ بوو نان و ماستمان خوارد، دوایی چنارەکانی لە هێسترەکە بارکرد و منیشی خستەسەر چنارەکان، زۆرم پێخۆش بوو، گەڕاینەوە بۆ قەرەچەتان. ئەو چنارانەی بۆ خانوو دروست کردن بوو، لەوکاتەدا دیواری بەرد و قوڕیان دروست دەکرد، کاك حسەینی پورمەنیج و کاك پیرۆت وەستا بوون، کاك پیرۆت دیوارەکەی بۆ دروستکردین لەناو حەوشەی ماڵەکەمان، بۆ دروستکردنی ژوورێك وەکو ژووری میوان وابوو، بۆ یەکەم جار زۆپای دارمان تێدا دانا پێشتر ئاگرمان دەکردەوە. لە ژوورێك پێیاندەگووت نیشتمان کە شوێنی نان کردن و خەوتن بوو، لەو شوێنەدا ئاگر دەکرایەوە بۆ نان دروستکردن و دوایی ئاگرەکەی بۆ رووناکی و خۆگەرم کردنەوە بەکاردەهات تا کاتی نووستن، دوایی لەسەر کەپرێك لە نیشتماندا دروستکرابوو زووڕناتکی خرابووە سەری لەگەڵ بەڕەیەك دەخەوتین لەسەری تا بەیانی. زۆرمان پێخوش بوو کە ژوورێکمان هەیە

زۆپای داری تێدایە! لەوکاتەدا عەلی چەرچی هەبوو نەوتی دەفرۆشت، بتڵی دەدا بە ١٠ فلس، بە کارماندەهێنا بۆ چرا و زۆپاکە. دوای گرانی شەڕی دووەمی جیهانی وردە وردە ژیان خۆش بوو، مام حەمەڕەشیدی ئامۆزام گڵی بانی بە بار بۆ مزگەوت دەهێنا، منیش دەچووم لەگەڵی تێرکەکەم بۆ دەگرتەوە بۆ ئەوەی سواری کەرەکەم بکات! ئەویش دڵی نەدەشکانم سواری دەکردم.

لە ساڵی ١٩٥١ نەنکم لە گوندی باڵخەوەهاتبوو بۆ ماڵی ئێمە، مێووژ و دۆشاوی بۆمان هێنابوو، سەرما بوو بۆ بەیانی زۆپا نەبوو ئاگر دەکرایەوە بۆ نانخواردن، دوایی هەموویان دەچوون بۆ ئیش، من و نەنکم لەبەر بەرۆژی ماڵەوە دانیشتبووین، بەڵام هەور بەری ئاسمانی گرت، دوایی وتم: نەنە رۆژ دەرکەوت، ئەویش وتی: ساڵێك هەور بەری ئاسمانی گرت پاییز بوو تا بەهار دەرنەکەوت، کە دەرکەوت سەگەلی ئاوایی پێی دەوەڕین! لەوکاتەدا کە رۆژ دەرکەوت لە خۆشیدا هەڵدەپەڕیم و گۆرانیم دەووت!؟

لە ساڵی ١٩٥١ لە نیوەشەودا لە گوندی قەرەچەتان خەومبینی لە خەودا داڵێکی گەورە هەڵیگرتم بۆ ئاسمان و من چوومەسەر پشتی داڵەکە، لە پڕ بەریدامەوە بۆ خوارەوە لە جێگایەك کەوتم هەمووی بەفر و سەربازگە بوو، خەبەرم بۆوە و هاوارم کرد وتم: دایە داڵەکەرخۆرە هەڵیگرتم بۆ ئاسمان! دایکم وتی: بسم الله .. بسم الله بە خوا کوڕەکەم شێت بوو شێت نەبێت باشە! چوو ئاوی هێنا کردی بە دەممەوە و هۆشم هاتەوە و قسەی خۆشی بۆ کردم تا خەوەکەم بیر بچێتەوە. دوای ٣٦ ساڵ چووم بۆ بەرگەڵوو لەوێ کاك هەڵۆ وتی: بچۆ بۆ ناوچەی زەڵێ لای قاسمەڕەش بۆ جێگاکەی قادر خەبات و پارەم لە مامۆستا نازم وەرگرت

بۆ میوانخانەكە، منیش چووم بۆ شاقوڵی لەوێ كۆپتەری ئێرانی هات من و چەند خزمێكی هەڵگرت، لە كاتی سواربووندا ئەو خەوەم بیركەوتەوە، كاتێك دابەزیین وەكو خەوەكە بەفر و سەربازگەی لێبوو! ؟

لە قەرەچەتان یەك مەتر زەوییان هەڵدەكەن گڵە سوورێكی هەبوو بۆ سواخی دیوار بەكاریاندەهێنا، دوو گڵێنجان هەبوو، یەكێكیان لای ماڵی نەجم ئەحمەد بوو، ئەویتریان لای ماڵی خالید حاجی حەسەن بوو. لە ساڵی ١٩٥٢ منداڵ بووم ئایشەی خوشكم گڵی هەڵدەكەند بۆ سواخی دیواری ماڵەوە، حەلاوەی خوشكم گاگۆڵكەی دەكرد، من و حەلاوەی خوشكم لای بووین، بەڵام من دوور بووم، گڵێنجان رووخا و ئایشە و حەلاوە بوون بە ژێرەوە! هاوارمانكرد خەڵكی گوندەكە لێمان كۆبوونەوە، ئایشە سەری دیار بوو هاواری دەكرد، بەڵام حەلاوە دیار نەمابوو بە تەواوی ژێر گڵێنجانەكە كەوتبوو، عەلی سۆیلە زۆر ئازا بوو لەگەڵ گەنجەكانی ناودێ هاتن لە ژێر گڵێجانەكە دەریانهێنان، ئایشە قاچی شكا و حەلاوەش دەستی.

لە ساڵی ١٩٥١ دوای جەنگی دووەمی جیهانی، باوكم چوو بۆ خوار كەركوك بۆ ناوچەی تكریت بۆ هێنانی جۆ، چونكە گرانی تینی بۆ هێنابووین، من منداڵ بووم لە برسا دەگریام باوكم دەستی گرتم بردمی بۆ خوار گوندەكە، كاتی ئەوە بوو جۆ ببێت بە فەریك، چەپكێكی بۆ كردم و برژانی وەكو قەرەخەرمان هەڵیووڵی و خواردم، ئەوە بووەهۆی ئەوەی باوكم بچێت بۆ خوار كەركوك بۆ هێنانی جۆ! كە هاتەوە باصێكی داری هێنا بوو پڕی كردبوو لە جۆ رەش، دایكم نەیدەزانی چۆن بیكات بە نان، كاتێك دەیدا بە تەنوورەكەدا بەردەبووەوە ناو تەنوورەكە، ئەویش بە كۆڵەوشكە دەریهێنا و فڕێی دەدایە دەرەوە، ئێمەش لە برسا

پەلامارمان دەدا و دەمانخوارد. دایکم دەستی بە گریان کرد و کەوڵ و کاسەی کۆکردەوە و چوو ساجێکی هێنا و ئاگری خستەژێری و هەویری دەکرد بە خەپلە و دەیخستەسەر ساجەکە تا دەبرژا و دەیخستەبەر دەممان و ئێمەش دەمانخوارد، واماندەزانی باقلاوەیە!؟ باوکم بەشی خۆمانی دانا و ئەویتری بە خەڵکی ئاوایی فرۆشت، کە یەك تەنەکە بە یەك دینار بوو پارەی گایەکی جووت بوو! لەو سەردەمەدا کچ دراوە بە شوو بە دوو تەنەکە جۆ! کە دوایی باس دەکرا و دەیانووت فلانە ژن دراوە بە شوو بە دوو تەنەکە جۆ. دوای پێگەیشتنی جۆ وردە وردە خەڵك لە برسێتی نەجاتی بوو ئەوەی هەیبووایە.

لە مانگی چواری ١٩٥٢ بەفرێکی زۆر باری کەس ئالیکی نەما بیدات بە ئاژەڵ، گرانی پەیدابوو تەنەکەیەك کا بوو بە یەك دینار! لۆرییەك کا لە کەرکوکەوە دەهات بۆ تاسلوجە و خەڵکی ناوچەکە دەچوون دەیانکڕی، ئێمە دووجار چووین بۆ کا کڕین، زۆربەی ئاژەڵەکان لە برسا مردن، ئێمەش مانیێکمان هەبوو تۆپی و کۆمەڵێك بزنمان هەبوو باوکم بە هەرزان فرۆشتبوونی بزنی بە ٣ پەنجایی، ئەو ماڵەی دەوڵەمەند بووایە کای هەبوو دەیفرۆشت بە چارەکە و بە گوێنی، ئەو ساڵە دەوڵەمەنەکان باڵەخانەیان دروست دەکرد بە نانەسکێ واتە (ئەوەی ئیشی بکردایە نانیان دەدایە)، خەڵك زۆربەی فەقیر بوون لەسەر شوانی و گاوانی شەڕیان دەکرد بەرامبەر نان کۆکردنەوە! دوای مانگی پێنج کە بەفر نەما ئەوەی ئاژەڵی مابوو دەیبردە لاقەدی بەر بەرۆژەکان کە گیاکەی کەمێك سەوز دەبوو، دوای ئەوە ئاژەڵەکان لە برسێتی نەجاتیان بوو.

لە پاییزی ١٩٥٢ لۆکە و خوری پارەی باشی دەکرد، حەمەئەمین حاجی عەلی و شێخ محەمەد سەرگەڵوویی خوالێیانخۆش بێت دەهاتن بۆ کڕینی لۆکە و خوری، ئێمەش ڕۆژانە دەچووین بۆ قازیاوا و بەلەکاوێ بۆ هێنانی پەموو لە زەوییانەی کە بەڕەڵا کرابوون، ڕۆژی ٢-٣ کیلۆ پەمووومان دەهانی و بە ئەوانمان دەفرۆشت، بە پارەکەی دەچووین نقووڵ و مەسکەتمان دەکڕی کە زۆر دڵمان پێیخۆش بوو، ئەوانیش دەیانزانی منداڵین پارەی زیادەیان دەداینێ، خۆیان بە ٢٠ فلس دەیان کڕی، بەڵام لە ئێمەیان دەکڕی بە ٥٠ فلس.

لە ساڵی ١٩٥٣ لۆتی دەهاتن لە سلێمانییەوە مەیموون و ورچیان پێ بوو، پارەیان پێ پەیدا دەکرد، دانیشتوانی گوندەکە زۆر لایان سەیر بوو، لە دەوری مزگەوتەکە لێیانکۆدەبوونەوە، ئەوانیش دەستی ورچەکەیان دەکرد و لەگەڵیدا هەڵدەپەڕین، خەڵك پێیانپێدەکەنی، لۆتییەکە بە ورچەکەی دەووت: ژن چۆن تەشی دەڕێسێت؟ ورچەکەش دەستێکی بەرز دەکردەوە و دەستەکەی تری بە قاچیدا دەهێنا!؟ یان بە مەیمونەکەیان وت: پیاو لە ژنەکەی بدات ژنەکە چی دەکات؟ مەیموونەکە بە هەردوو دەستی خۆی دەڕنییەوە! لەوە دەچوو لە ئێرانەوە هاتبن، چونکە پاش ماوەیەك نەمان.

لە ساڵی ١٩٥٦ خوێندکاری پۆلی یەك بووم، مامۆستا مستەفا ئێمەی کۆکردەوە بردینی بۆ سەرجادەی سلێمانی دوکان و پارەی لێمان کۆکردەوە بۆ کڕینی دوو ئاژەڵ، بۆ ئەوەی لە کاتی پێشوازیکردنی مەلیکدا لەبەر پێیدا سەریبڕن، لەسەر جادە ریزمانی کرد و چاوەڕوانی مەلیك بووین، کارمەندانی خوێندنگەکە بە چەقۆوە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی کە هات لەبەر پێیدا ئاژەڵەکان سەربڕن، کاتی نیوەڕۆ دوو

ئۆتۆمۆبێل هاتن، یەکێکیان ئۆتۆمۆبێلێکی چەکدار بوو کە کۆمەڵێك چەکداری تێدابوو، ئەویتریان قەمەرە بوو مەلیك و سکرتێرەکەی لەگەڵدابوو، کە پیاوێکی بالآبەرز بوو دەمانچەیەکی دە تیری بە لاقەدەوە بوو، و دارێکی بە دەستەوە بوو لە پێش مەلیکەوە دابەزی و دەرگاکەی بۆ کردەوە، مەلیك دابەزی و کارمەندانی خوێندنگەی قەرەچەتان دەستیان بە سەر برینی ئاژەڵەکان کرد، مەلیکیش یەکە یەکە تەوقەی لەگەڵ مامۆستا و خوێندکارەکان کرد و بە عەرەبی قسەی کرد، بەلآم ئێمە نەمانزانی چی دەڵێت، مەلیك گەنجێکی باریکەلەی رەشتاڵەی لچ ئەستوور بوو، تەمەنی نزیکەی ٢٠ ساڵ دەبوو زۆر رووی خۆش بوو، دوای مانەوەی ١٠ خولەك سەرکەوتن و چوون بەرەو دوکان بۆ کردنەوەی بەردی بناغەی بەنداوی دوکان، بەلآم ئێمە نەمانزانی بۆچی دەچن. کارمەندێکی کوردی لەگەڵدا بوو بە مامۆستاکەی وت: بۆ خەڵکی گوندەکە نەهاتوون بۆ داواکاری خزمەتگوزاری گوندەکە! چونکە تەنها مامۆستا و کارمەندان و خوێندکاران لەوێ بوون هیچ کەسێکی گوندەکە نەهاتبوو، هۆکارەکەی نەزانراوە. دوای ئەوە خۆشگوزەرانی کەوتە ناوچەکە بەهۆی بەنداوەکە و جادەی سلێمانی دوکانەوە.

لە زستانی ساڵی ١٩٥٥ کارێزگەندێك هەبوو لە سلێمانییەوە لە لایەن باوکم و حسەینی مامە سوورە و کوێخا وەسمانەوە هێنابوویان بۆ قەرەچەتان، پێیاندەووت نۆ موسوڵمان، چونکە ئەرمەنی بوو تازە ببوو بە ئیسلام. ویستبوویان بیرێك لێبدەن بۆ دروستکردنی کارێز بۆ ئاودێری لە وەنەوشان نزیك قەبرستانی ئێستای گوندەکە، بۆ ئاودێری بۆ زەوییەکانی شیوی باغی کە هی ئێمە بوو، لەگەڵ زەوییەکانی پشت کارێز کە هی حسەینی مامەسوورە بوو و وەنەوشانیش هی کوێخا

وەسمان بوو، دوو بیریان لێدا بە قوولی ٢٠مەتر، بەڵام بەداخەوە نەگەیشتە ئاو، ناچار پڕیان کردەوە، دوای راپەڕین کاك سەمیع بانگی کردم وتی: ئەو شوێنە شوێنەواری کۆنی لێیە منیش بیرمکەوتەوە کە ئەو شوێنە پڕکراوەی بیرەکانە نەك شوێنەوار، تێمگەیاندن بۆ ئەوەی نەکەونە هەڵەوە کە من نەبوومایە وەکو شوێنەواری کۆن سەیر دەکرا لە لایەن خەڵکی گوندەکەوە، منیش باسی چۆنییەتی رووداوەکەم بۆ کردن زۆریان پێخۆش بوو.

لە ساڵی ١٩٥٥ باوکم بەرچنەیەك هەنجیری پێدا ناردم بۆ کۆکە بۆ ماڵی عەلی حاجی حسەین، کاتێك لەبەر کێشەی کۆمەڵایەتی هاتبووە ئەوێ، چووم ماڵیانم دۆزییەوە زۆر رێزیان لێگرتم دیار بوو ژنەکەی لە بەگزادە دەچوو، کاتی تەماتە بوو گوندی قەرەچەتان تەماتەی نەبوو، بە خێزانەکەی وت: بچۆ بەرچنەکەی بۆ پڕ بکە لە تەماتە بۆ ماڵی کاك علی، لەوەتەی لە کۆکەم یەکەم جارە برادەر دیاریم بۆ بنێرێت، ژنەکەی چوو بەرچنەکەی پڕکرد لە تەماتە و دوای نانخواردن بەرێی کردم چوومەوە بۆ قەرەچەتان.

لە ساڵی ١٩٥٥ سەردانی ماڵی مامە رەزام کرد لە کلکە سماق کە مامی باوکم بوو، کە چوومە ئەوێ مامە ڕەزا لە خانەقاکە بوو، بینیم جۆرێ یەکسانی و تەبایی هەبوو کە زۆر خەڵکی لێقەوماو رووی لەوێ کردبوو، کاتێك پەیوەندیم کرد بە حیزبی شوعییەوە زیاتر شارەزای ئەو خانەقایە بووم، کە دوو کوڕی مامە رەزا سەرۆکی بزوتنەوەی حەقە بوون و پەیوەندییان بە حزبی شوعییەوە هەبوو، بە ناوی کاك حەمید و مام تەها خوا لێیانخۆش بێت، ئەم دوو بەڕێزە ئازارێکی زۆریان چەشت لەسەر حیزب. لەم بزوتنەوەیەدا جۆرێك ئیشتراکی هەبوو لەناویان

هەموویان یەك خواردنیان دەخوارد، هەر کەسێك نانی دروستبکرتایە ئیشی نەدەکرد، ئەوەی داری بهێنایە هەر داری دەهێنا، ئەوەی جووتیار بووایە هەر جووتی دەکرد، ئاشیان هەبوو ئەوەی ئاشەوان بووایە هەر ئاشەوانی دەکرد، بەوجۆرە هەر کەسە و کاری خۆی دەکرد، بە بێ کێشە. من کە چوومە ئەوێ و دەگەڕامەوە قسە و باسی تر دەکرا لەسەریان لە ناو خەڵکدا، بەڵام دیار بوو ئەم بزوتنەوەیە جوڵانەوەیەکی شۆڕشگێڕانە بوو، بۆیە ئەوانەی قسەی خراپیان لە دژیان دەکرد لێیانتێنەگەیشتبوون! ئەم بزوتنەوەیە لە سەردەمی شۆڕشی ئۆکتۆبەردا سەریهەڵدابوو بۆیە پڕوپاگەندەی خراپیان بۆ دەکرد و باش باسیان نەدەکرا، تەنها ئەوانەی لەوێ بوون قسەی خراپیان نەدەکرد، هەر کاتێك حیزبی شیوعی لێیان بقەومایە روویان لەوێ دەکرد بۆ خۆ پاراستن. منیش بە لامەوە سەیرە بۆ لە حەقە کەوتنە تەقە!؟ وەك دکتۆر مستەفا عەسکەری دەفەرمووێت، کاتێك مامۆستا رەئوف زوهدی کە مامۆستا بوو لە سووررداش و عومەر مەعروفی کە سەقزی بوو ئەم بزوتنەوەیان بە بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی سەردەمی پاشایەتی ناساندووە، بۆ ئاگاداری خەڵکی بێ ویژدان کە پڕۆپاگەندەی خراپیان کردووە، با بزانن ئەوەی پەیوەندی بەم بزوتنەوەیەوە هەبووە هەمیشە لە بەرخوداندا بوون دژی رژێمە یەك لە دوای یەکەکانی عێراق، تا ئێستا رابووردویان پاکە و بە هیچ جۆرێك لە جۆرەکان بەرامبەر پارە و پەرژەوەندی تاکەکەسی هەڵنەخەڵەتاون، فەوجی جاشیان نەبووە، لە شۆڕشی نوێدا شێخ عومەر سەرتیپ بوو، لە کاتی کۆچڕەودا کاکە حەمە هەموو پیر و پەککەوتەکانی هێنا بوو بۆ ئێران، بۆ ئەوەی ژیانیان پارێزراو بێت، ئێستاش کە سەردانی کلکە سماق دەکەم بە جۆرێك ئاسوودە دەبم وا دەزانم

نوێبوونەوەی سەردەمی شیوعییەتە، زۆر خۆشحاڵم بە بینینی نەوەكانی مامە رەزای سەرۆكی بزوتنەوەی حەقە. رۆژێك سەردانی كلكە سماقم كرد لەگەڵ شێخ بابا تایەر خوالێیخۆش بێت و شێخ مەحمود و برادەرانی كۆمەڵایەتی، كاتێك شێخ هاوڕێ لەگەڵمان بوو لە كۆمەڵایەتی، سەردانی خانەقامان كرد، كاتێك كاكە حەمە لە ژیاندابوو، شێخ هاوڕێ موریدەكانی نیشاندان هەر كەسە و لە ژووری خۆی بوو بە پاك و خاوێنی خزمەت دەكران، هەرچەندە بە سالاچووبوون، نێوانم لەگەڵ نەوەكانی مامە ڕەزا زۆر خۆشە بە تایبەتی شێخ عومەر و شێخ هاوڕێ و ئامانج و كرمانج و كوڕەكانی صالح عەسكەری كاتێك لە زەرگەتە بوون سەردانم دەكردن، جێگای سەروەرییە بۆیان كە تا ئێستا خانەقای شەدەڵە و كلكەسماق سەر بە شۆڕشن، لەگەڵ نەوەكانی شێخ عبدولكەریمی شەدەڵەش نێوانم خۆشە بە تایبەتی شێخ عبدولكەریم و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد، ئەم نەوانەی شێخ عبدولكەریم و مامە ڕەزا پێشمەرگەی دێرین و دانەبڕاو بوون تا راپەڕین لە خەباتدا بوون.

لە ساڵی ١٩٥٥ باوكم و عەلی سۆیلەی ئامۆزای لەسەر كێشەی زەوی بەرجادە قاچاخ بوون، دوایی بە ئیدارە مەلیكی ساڵێك بەندكران و لەگەڵ پەنجا دینار سزا، بۆ پەنجا دینارەكە هێسترێكمان هەبوو فرۆشتمان بە ٤٦ دینار، بۆ چوار دینارەكە هەموو گوندەكەمان كرد كەس ئامادە نەبوو بە قەرز بماندادتیّ، ناچار شێخ جەلالی حەفید و حەمەی فەرەجە فەنی بۆیان پەیدا كردین! عومەری برام تازە لە دایك ببوو باوكم منی خۆشدەویست وتبووی: حەمەكەریم بێنن چاوم پێیبكەوێت، ئەحمەدی برام منی برد بۆ لای بۆ چاوپێكەوتن و چاوم بە باوكم و عەلی سۆیلە كەوت لە كونێكەوە، عەلی سۆیلە دەستی سووتابوو، وتبوویان دوو

برادەری سلێمانی گاڵتەیان پێکردووە، لەبەر ئەوەی پاڵتۆیەکی شڕی لەبەر بووە و جامانەی کردبوو بە لەچك، ئەویش توورە ببوو یەك مقەڵی ئاگر و پشکۆی هەڵگرتبوو کردبووی بە سەروچاویاندا، لە ئەنجامدا دەموچاوی ئەوان و دەستی عەلی سۆیلە سووتابوو!؟ شەو لە ماڵی فەقێ عەلی حاجی قادرماینەوە کە ناسیاوی خۆمان بوو، ئەحمەدی برام کەڵەشێرێکی سووری بە دیاری بۆ هێنابوون، ئەحمەدی برام چوو بۆ بازاڕ و منیش لەگەڵ منداڵەکانی خەریکی یاریکردن بووم و ماڵیان لە نزیك بازاڕی دۆلارەکەی ئێستا بوو، بۆ بەیانی سەیارە کەم بوو تا نیوەڕۆ چاوەڕێمان کرد، دوایی قەمەرەیەکی رەش هات سواری بووین چوو لە بەنزینخانەی لای بەریدەکە بەنزینی تێکرد و بەڕێکەوت بۆ دوکان، ئێمەش لە ئیشارەتەکەی قەرەچەتان دابەزیین و کاکم تەنەکەیەك رۆن و کۆڵێك کەلوپەل و باوەشێك سلقی پێبوو، منیش بە دوایدا دەرۆیشتم، بۆ ئێوارە چووینەوە بۆ ناودێ. دوای ئازادبوونی باوکم لە بەندیخانە، جارێکیتر بە تۆمەتی وڵاغ دزینی عەرەب بەند کرا، چونکە باوکم مامەڵەی وڵاغەبەرزەی لەگەڵ ئاغاکانی پشدەر هەبوو، کۆمەڵێك وڵاغەبەرزەی بە ئەوان فرۆشتبوو، عەرەبەکان چووبوون وڵاغەکانیان هێنابووەوە و وتبوویان ئەمانە هی ئێمەیە، ئاغاکانی پشدەر سکاڵایان لە باوکم کردبوو بۆ پارەکەی، بەڵام باوکم ئامادە نەبوو ئەو پارەیەیان بداتەوە لەسەر ئەوە بەند کرابوو، دوایی هیچی لەسەر ساغ نەبووەوە و ئازاد کرا. لەوماوەیەدا دایکم بەسەردا مرد و ئایشەی کچی پورم بەخێوی دەکردین وەکو خوشکمان وابوو، دایکم بەخێوی کردبوو، دوای ئەوەی ئایشە شووی کرد بێ کابان ماینەوە تا باوکم کچی گوڵانی مام مەولەی بۆ ئەحمەدی برام خواست کە پێشتر مارە بڕاوی بوو لە بری نازداری

خوشكی باوكم كە دابووی بە مام مەولە، ئەویش مندالّ بوو كابانی باش نەدەزانی دوای سالّی ١٩٥٧ تۆزێك وەزعمان باشتر بوو لە جاران كە بە هیوای دراوسێ و خزم بووین نانێكمان بەنێ یان ئیشێكمان بۆ بكەن.

دوای ئازادبوونی باوكم لە بەندیخانە لە هاوینی سالّی ١٩٥٥ لە چەرمەگا تووتنمان كرد، كاتی شریت لێدان بوو دەبووایە هەموو رۆژێك نانی گەرم و ماست و هەنجیرم ببردایە بۆ سەر ئیشەكە، چونكە ئەوان شەو دەمانەوە لەسەر كەپرەكە، بۆ ئەوەی بەیانی زوو هەلّسن بۆ گەلاّڕنە كە پێیاندەووت هەلّەڕنە، دەبوو پێش هەتاوكەوتن و بە فێنكی ئەو كارەیان تەواو بكردایە، دوای هەتاوكەوتن هەلّەڕنە ناخۆش بوو، چونكە كە هەتاوی لێبدایە پەلكەكەی سیس دەبوو بۆ لێكردنەوەی ناخۆش بوو، من دەبووایە بەیانی بە تاریكی هەلّسم لە خەو بۆ ئەوەی زوو بچم بۆ لایان، بە سواری هێستر دەچووم بەسەر هێسترەكەوە خەوم لێدەكەوتەوە و جاری واهەبوو دەكەوتمە خوارەوە و خەبەرم دەبووەوە، كە دەچوومە ئەوێ پێیاندەگوتم: بۆ درەنگ هاتووی؟ دوای نانخواردن دەستیان بە شریت لێدان دەكرد، منیش لەگەلّیان تا ئێوارە شریتم لێدەدا كە وام لێهاتبوو لە هەموویان زیاتر شریتم لێدەدا، رۆژی دەگەیشتە ٢٠ شریت كە ئەحمەدی برام تەنها ١٢ شریتی لێدەدا، بۆ ئێوارە من دەگەڕامەوە بۆ قەرەچەتان بۆ ئەوەی بەیانی زوو خواردنیان بۆ بەرم، بەلاّم ئەوان دەمانەوە بۆ شریت لێدان، بەیانیان ئەوان گەلاّڕنەیان دەكرد و من نەمدەكرد.

لە سالاّنی ١٩٥٦ مالّی پورم لە گردەبۆر بوو، ناوی گولاّن بوو ژنی مام مەولود بوو، كە چاودێر بوو لە كۆمپانیای ئینشائات كە جادەی سلێمانی دوكانی قیرتاو دەكرد، ئێمە دەچووین بۆ مالّیان و پورم مردبوو

ژنی تری هێنابوو ناوی مریەم بوو. لە خوار گردەبۆر مام مەولود چایخانەیەكی دانابوو، پیاوێكی هێنابوو بۆ چێشتلێنان ئەرمەنی بوو ناوی قەرەلەمبۆ بوو، شارەزابوو لە چێشتلێنان، نیوەڕۆیان هاواری دەكرد وەرە بۆ بیلاو بە گۆشتی حەیوانی كێوی، كرێكار لەوناوە ئیشی دەكرد دەچوون لەویَ نانیاندەخوارد برنج و شلە بە ۳۰ فلس و بە گۆشتەوە ٥٠ فلس، لەوكاتەدا باوكم دەهات بۆ چایخانەكە بە چەكێكەوە كە پێیاندەگووت سدی یاهود واتە دژەجولەكە، زۆر حەزمان كە بیستنی تەقە بوو دەچووین ۱۰ فلسیمان دادەنا بۆ باوكم تەقەی لێدەكرد، لە شێرەكەی دەدا زۆرمان پێخۆش بوو ڕامان دەكرد بە چەپڵە دەمانگووت ئەرەوەڵا لێیداوە، دیار بوو باوكم كە دەچوو بۆ راو ئەگەر ئاژەڵی كێوی بكوشتایە دەیبرد بۆ ئەویَ و بە قەرەلەمبۆی دەفرۆشت. ئێمە لە گردەبۆر توتنمان دەكرد كە بیَ ئیش بووینایە دەچووین بۆ چایخانەكە نانیشمان دەخوارد و پارەیان لێمان وەرنەدەگرت، سەگێكمان هەبوو پێماندەگووت بۆرە، كە دەچووینەوە بۆ قەرەچەتان نەدەهاتەوە لەگەڵمان لەبەر ئەوەی ئەو ئێسقانەی لە دەوروپشتی چایخانەكە هەبوو لە قەرەچەتان نەبوو، كە دەچووینەوە بۆ گردەبۆر سەگەكە دەهات بە پیرمانەوە و خۆی تێهەڵدەسووین تا ماوەیەك لەگەڵمان بوو دوایی دەگەڕایەوە بۆ دەوری چایخانەكە.

لە ساڵ ١٩٥٦ بەدواوە خەڵك وەزعی بەرەو باشی دەڕۆی بەهۆی قیرتاوكردنی جادەی سلێمانی دوكان، كە چەند كۆمپانیایەك بەڕێوەیاندەبرد، كۆمپانیایەكیان لە تابین بوو ناوی ئینشائات بوو، لە هەمانكاتدا كۆمپانیای زێڕەندۆڵ و دۆمیزبالۆ كاریان لە بەنداوی دوكان دەكرد، خەڵكی گوندەكان بە زۆری كاریان بۆ دەكردن رۆژی بە ٦

پەنجایی. گەڵابە دەهات بۆ قەرەچەتان بۆ بردنی زبڵ بۆ باخەكانی دەوروبەری كەمپی كۆمپانیاكان. ئەحمەدی برام دەچوو بۆ ئیش بۆ دوكان زۆرجار شەو نەدەهاتنەوە، دەچوونە ماڵی حەمەی ئەوڕەحمان كە پورزای خۆمان بوو لە كلكە سماق، وەزعی ئێمەش باش ببوو وەكو هەموو خەڵك.

لە ساڵی ١٩٥٦ كاك حسەینی مامە سوورە دراوسێمان بوو منی خۆشدەویست، ژنی تازەی هێنابوو، ژنەكەی تری ناوی گوڵیل بوو خوشكی محەمەد قادر چاوەش بوو حەزی نەدەكرد بچم بۆ ماڵیان كە دەچووم پێیدەووتم: یاڵە یاڵە بۆ ماڵی خۆتان، بەڵام ژنە تازەكەی دایكە مەنە بوو كە ناوی مینا بوو، دەستی دەگرتم دەیبردم بۆ لای مەشكەكە و پێیدەووتم: دابنیشە تا مەشكەكە دەژنم، دوای مەشكەژەنین بابۆڵەیەك نان و كەرەی دەدامێ، ئیتر منیش هەموو بەیانییەك دەچووم بەرامبەر مەشكە دادەنیشتم بۆ خواردنی نان و كەرە، دایكە مەنە ژنێكی زۆر باش و بەڕێزی گوندەكە بوو، منالی خۆشدەویست و حەزی دەكرد دڵی مندالْ خۆش بكات، بە داخەوە كە خۆی نەزۆك بوو.

لە ساڵی ١٩٥٦ خەڵكی گوندی قەرەچەتان زۆربەیان ببوون بە شۆفێر، ماڵی حاجی گوورون پیكابێكی سێ ڕۆبعیان هەبوو لە عارف ئاغای چەمچەماڵیان كڕیبوو، نوری كوڕی بوو بە شۆفێری، دوای ئەو صدیقی حاجی كەریم و لە دوای ئەو محەمەدی كوێخا عوسمان، لەو سەردەمەدا باوكم پیكابێكی لەگەڵ سەید عەولكەریم كڕی و برادەرێكی سلێمانی ئیشی بۆ دەكردن تا سەید عەولكەریم فێری شۆفێری بوو، لەگەڵ باوكم هەمیشە پێكەوە بوون، جاری وا هەبوو باوكم نەدەهاتەوە ئەگەر بچوونایە بۆ شوێنی دوور، پاش ماوەیەك جیابوونەوە وەزعی

باوكم تێكچوو سەیارە نەما، دوای ئەوە كوڕەكانی مەولود چەتەی ئامۆزام فێری شۆفێری بوون، لە ساڵی ١٩٦٠ زیاتر لە ٥٠ كەس لە گوندی قەرەچەتان فێری شۆفێری ببوون و پیكابیان هەبوو. خولیای ئەم گوندە بۆ شۆفێری زۆر باش بوو، چونكە هەرگیز ڕووداوی گەورەیان لە دەست رووی نەداوە لەبەر شارەزاییان. بەیانیان دەچوون بۆ سلێمانی و ئێوارە دەگەڕانەوە. ئەم شۆفێرانە كرێكاریان دەبرد بۆ زێڕەندۆڵ بۆ كار و ئێواران دەگەڕانەوە بۆ ناودێ.

لە ساڵی ١٩٥٧ سەرژمێر هات بۆ نفوس (ناسنامەی باری شارستانی) تازەكردنەوە، لە سنووری ناوچەی ئێمە مامۆستا مستەفا و مامۆستا شێخ كەریم ئەوكارەیان دەكرد، مامۆستا مستەفا و مامۆستا شێخ كەریم لەگەڵ كوێخا وەسمان بانگیان كردم بۆ خوێندنگەی قەرەچەتان، چونكە ئەحمەدی برام و باوكم لە دوكان خەریكی گێرەكردن بوون، لەوێ ناوی هەموو خێزانەكەیان نووسین و منیان كرد بە سەرۆكی خێزانەكە، چونكە ئەوان لە كاتی سەرژمێردا ئامادە نەبوون و ناویان نەنووسرا، دوایی چووبوون بۆ سووسێ ناوی خۆیان نووسی، موالید (ساڵی لە دایكبوون)ی منیان كرد بە ١٩٤٩ بۆ ئەوەی ناوم زوو نەیەتەوە بۆ سەربازی و مامۆستا مستەفا وتی: حەمەكەریم موالیدێكت بۆ دەنووسم كە چوویت بۆ سەربازی قەفی سمێڵت گەورە بێت، بۆ ئەوەی نەتكەن بە موراسیل!؟ پێشتر لە سەرژمێری ١٩٤٧دا بە موالیدی ١٩٤٥ دانرابووم، هەروەها پێیوتم: بەیانی ماینەكەتانم بۆ زین بكە لەگەڵم وەرە دەچین بۆ بیران، مامۆستا شێخ كەریمیش بە عومەر حسەینی وتبوو، كە چووینە بیران كوێخا فەتاح وتی: خاوەن ئاژەڵەكان نەڕۆن با لێرە نان بخۆن، دوایی بچن بۆ سووسێی ئاڵەمەرە، ئێمە چووین بۆ نانخواردن بۆ

خواردنی گۆشتی ئاژەڵی کێوی، دوای نانخواردن لەگەڵیان چووین بۆ سووسێی ئاڵەمەرە، ئەوانمان دابەزاند و خۆمان گەڕاینەوە، پاش نیوەڕۆ بوو هەموو منداڵی گوندەکە بەردبارانیان کردین، ئێمەش دامان لە ئاوزەنگی ئاژەڵەکان و پێمان لێ توند کرد و سووسێمان بە غار بەجێهێشت و گەڕاینەوە بۆ قەرەچەتان. منداڵەکان بە دواماندا رایان کرد وازیان لە بەردباران نەدەهێنا، بەڵام تۆزی ئێمەیان نەشکاند بۆی دەرچووین. ساڵی ١٩٧٠ چووم بۆ بەغداد بۆ دەرهێنانی جنسیەی عێراقی، لەوێ پێیانوتم: تۆ دوو موالیدت هەیە کامیان هەڵدەبژێریت؟ ئەو قسەیەی مامۆستا مستەفام بیرکەوتەوە کە منی بە موالیدێکی بچووك نووسیبوو. منیش موالیدی ١٩٤٩ م هەڵبژارد، موالیدی ١٩٤٥ کە موالیدی رەسەنی خۆمە وازم لێهێنا و هەموو بەڵگەنامەکانی خۆم کرا بە موالیدی ١٩٤٩.

لە هاوینی ١٩٥٧ ڤایرۆس دابووی لە چاوی ئایشەی خوشکم ماوەیەك کوێر ببوو، هەموو شەوێك دەمانبرد بۆ ماڵێك ئەگەر منداڵی شیرەخۆرەی هەبووایە بۆ شیر تێکردن بۆ چاوی، شەوێك چووین بۆ ماڵی گوڵان رەشید بۆ ئەوەی شیری بۆ تێبکات، کە گەڕاینەوە لای ماڵی وەلید سەعید سەگەل تێمان پەربوو، من رامکرد و ئەوم بەجێهێشت، ئەویش بە پەلە کووتە خۆی کێشابوو بە دیوارێکدا، کە چوومەوە بۆ لای هەموو دەم و چاوی خوێن بوو، دەستی کرد بە گریان و وتی: بۆچی بەجێتهێشتم؟! وتم: سەگەل دەیخواردم! کە چووینەوە بۆ ماڵەوە دەستیان کرد بە کووتانم دەیانووت: بۆ دەستت باش رانەکێشاوە، تا تێگەیشتن وازیان لێهێنام.

لە ساڵی ١٩٥٧ پیاوێك هات بۆ ماڵمان لە قەرەچەتان ناوی حەمە صدیق بوو، کوڕی کوێخا تەهای کانی کوردە بوو لە دەشتی کۆیە، حەمەی پوورزای باوکم لە کلکە سماقەوە ناردبووی بۆ لای باوکم لەگەڵی بچێت بۆ سلێمانی بۆ بەڕێوەبەرایەتی ئیشپێکردن و نەقابەی کرێکاران، بۆ ئەوەی هەوییەی نەقابە و ئیشپێکردنی هەبێت، تا لە زیرەندۆڵ لە دوکان کار بکات، بۆ بەیانی باوکم بردی بۆ سلێمانی هەوییەی بۆ دەرکردبوو، لەم دواییەدا کاکە حەمە لە سەردەشت بینیم هەر باسی پیاوەتی باوکمی دەکرد کە چۆن زوو ئیشەکەی بۆ تەواو کردووە.

لە ساڵی ١٩٥٧ ماڵی شێخ فەتاح لە سووسە کۆن بوو، باوکم قاچاغ بوو لە ماڵی ئەوان بوو، ڕۆژێك چووم بۆ لای وتی: لێرە لای من بمێنەرەوە، منیش زۆرم پێخۆش بوو، بووم بە شوانی بەرخەلی ماڵی شێخ فەتاح، ماڵی عوسمانی حاجی عەلی چەند کارێکیان هەبوو دایکی دەیویست لەگەڵ من شوانی بکات و بەرخ و کار تێکەڵ بکەین، ئەو بەهار و هاوینە لەوێ بووم، بۆ زستانەکەی چوومەوە بۆ قەرەچەتان بۆ خوێندن، لەو کاتەی لە سووسە کۆن بووم، عەلی تورکە لە ماڵی شێخ فەتاح جووتیار بوو، ئێرانی بوو دەچوو بۆ دارهێنان، باوەشێ چیلکەی لەسەر دارەکە دادەنا بۆ ئەوەی ئاگری پێبکەنەوە، لە کاتی بەرخەلەوانیدا ڕۆژێك لای چاڵەخەزێنەی ڕێگاکەی سووسێی سەیدان بۆ سووسە کۆن لە سێبەری دارێك دانیشتبووم، نزیکەی عەسر بوو پیاوێك هات کەوا و سەڵتەیەکی شینی جوانی لەبەردابوو لەگەڵ جامانەیەکی خەت گەورەی شین، لام سەیر بوو لە خەڵکی ئەو ناوچەیە نەدەچوو، هات لە لام دانیشت و کەوتە پرسیارکردن و منیش وەڵاممدەدایەوە، پێیوتم: ئەم بەرخانە هی خۆتن؟ منیش وتم: شوانی ماڵی شێخ فەتاحم و

خەڵکی قەرەچەتانم. وتی: عەلی حەمەی فاتە خان لێرەیە، منیش وتم: من کوڕی ئەوم! هاتە پێشەوە سەری ماچ کردم و وتی: من لە بەندیخانە بووم پورزای باوکتم ناوم مەجید چەتەیە و حەوت ساڵ لە بەندیخانە بووم! ئێوارە چوومەوە لای باوکم دانیشتبوو، دوایی بانگیان کردم بۆ لای خۆیان و چیرۆکەکەی خۆی گێرایەوە. شەو لای باوکم بوو بۆ بەیانی رۆیشتەوە بۆ ناوچەی خۆیان لە قۆچەلەر، باوکم دوایی پێیوتم: ئەم مەجیدە کوڕی رابیعەی پورمە و زۆر ئازایە و لەگەڵم چەتە بووە، بۆیە پێیدەڵێن مەجید چەتە. ئەو هاوینە من تێر تەماتە بووم، چونکە هەموو ماڵێك دێراوێك یان دوو دێراو تەماتەی هەبوو، بەڵام لە قەرەچەتان تەماتە نەبوو. ماڵی شێخ فەتاح بە سەبەتە تەماتەیان بۆ دەهات. دوای شۆڕشی ١٩٥٨ ماڵی شێخ فەتاح باری کرد بۆ عەوەڵان و ئامۆزاکانمان چوونەسەر ماڵی شێخ فەتاح، چونکە شێخ فەتاح لەگەڵ جووتیارەکانی سووسە کۆن نێوانی تێکچوو بوو، دائیرەی کشتوکاڵ زەوییەکانی سووسە کۆنی دا بە جووتیارەکان و نەیدا بە شێخ فەتاح، لەبەر ئەوەی زەوییەکان هی میری بوون، بەڵام شێخ فەتاح لەگەڵ بنەماڵەی ئێمە کێشەی نەبوو.

کاتێك لە قەرەچەتانەوە چووم بۆ سووسە کۆن لای کارێزی سەعید چایخانەیەکی لێبوو، لەوێ کوێخا گوروونی لێبوو بانگی کردم و وتی: وەرە کوڕە بۆ کوێ دەچیت، تۆ لە منداڵی ئەم گوندە ناچیت؟ وتم: دەچم بۆ سووسە کۆن بۆ لای باوکم. وتی: باوکت کێیە؟ وتم: عەلی حەمەی فاتەخانە. وتی: وەرە با بڕۆین، دەستی گرتم بردمی بۆ ماڵی خۆیان، لەوێ بانگی ژنێکیانی کرد کە ناوی معبوب بوو ئامۆزای خۆی بوو، وتی: وەرە ئەمە خزمی تۆیە نایناسیت؟ کە هات سەیری کردم وتی: ئەم کوڵەبۆرە کێیە؟ وتی: کوڕی عەلی فاتەخانی خزمتە و خورماوڕۆنێکی

بۆ بکە و پڕی بکە لە هێلکە بۆمان، دوای ئامادەکردنی لەگەڵ کوێخا گوروندا تێرمان خورما و هێلکە خوارد، تا ئێستاش کە خورماوڕۆنمان هەبێت ئەو ڕۆژەم دێتەوە یاد.

لە بەهاری ١٩٥٨ بەفرێکی سوور باری کە بووە هۆی نەمانی ئالف لە ماڵە هەژارەکاندا، خەڵك پەنای دەبرد بۆ گەڵا و گسك لە چەمی سووسێ، بە تەوراس وردیان دەکرد وەکو کا بۆ ئاژەڵەکان، هەژاری وا هەبوو ماڵی دەوڵەمەندی خزمی هەبوو دەچوو کای بە قەرز دەهێنا لایان، ئەم بەفرە وەکو خوێن وابوو، دوو ڕۆژ بەردەوام بوو، زەوی داپۆشی بە بەرزی ئەژنۆیەك، کە هەتاو دەرکەوت توایەوە و گیا دەرکەوت و لەبەر بەڕۆژەکان ئاژەڵەکان بەشی خۆیان دەخوارد. بەهۆی ئەو بەفرە سوورەوە هەرچی مەڕە سوورە کێوی ئەو ناوچەیە لەناوچوون تا ئێستا نەماون، پێشتر بە ٥٠ سەر لە دەشتاییەکاندا لە دەوری چەمی ڕەزان و گڵەزەردەی پشتی یەلانقۆز دەبینران، بەڵام بزنە کێوییەکان لەناو نەچوون لە ناوچە شاخاوییەکانی پیرەمەگرون ماونەتەوە و تا ئێستا ماون.

پێش شۆڕشی چواردەی تەمووز پیاوێك لە قەرەچەتان دەمایەوە پێیاندەگووت پیاوە غەریبەکە بە باوە سەید یان سەید محەمەد بانگیان دەکرد، ئەویش چەند وشەیەك کوردی دەزانی و ئەوەی تێنەگەیشتایە بە پێکەنین تەواوی دەکرد، نزیکەی دوو مانگ مایەوە و جارجاریش گوندەکەی بە جێدەهێشت، لە کاتی نوێژدا نەیدەزانی دەست بگرێت پێیاندەگووت گوناهە و ئەویش گوێی پێنەدەدا، ئەم پیاوە لەوە دەچوو ئاسەوارناس بێت یان جاسووسی ئینگلیز بووبێت، کۆڵێکی گەورەی بە کۆڵەوە بوو کە کیسەی خەو و کەلوپەلی خۆی تێدابوو لەگەڵ فانۆسێك

کە بە دوو ڕۆژ جارێك نەوتی بۆ دەکڕی، بە دوو ڕۆژ جارێك فڕوجێکی دەکڕی دەچووە ماڵی هەژارێك لەویٚ بۆیان لێدەنا و ران و سنگەکەی دەخوارد و ئەوەی دەمایەوە دەیدا بە ماڵە هەژارەکە، چەند ڕۆژێك جارێك نانی لە شوانەکان دەکڕی و دەچووە ئەشکەوتەکان دەمایەوە و دەخەوت لە زستاندا، شەو ئێمەش دەچووین هاوارمان دەکرد دەمانووت: باوە سەید چی دەکەیت لەویٚ؟ ئەویش چراکەی دەکوژانەوە و دەستی دەکرد بە پۆڵەپۆڵ. دەمانووت: لەگەڵ جنۆکە قسە دەکات لە ترسا ڕامانددەکرد. بە هاوینان دەچووە قەبرسانەکان یان دار و شەخصەکان شەو دەمایەوە. دوای شۆڕشی ١٤ ی تەمووز باوە سەید ڕۆی و نەهاتەوە. سەیر لەوەدابوو دەچووە ماڵە هەژارەکان کە هیچیان نەدەزانی، نەدەچووە ماڵێك کە شت بزانن و پرسیاری لێبکەن. ئەم پیاوە لای گوندەکە وەکو پیاوێکی ئایینی سەیر دەکرا نەك شتی تر.

ساڵی ١٩٥٨ ماڵی قادری ئامۆزام لە کلکە سماقەوە گەڕانەوە بۆ قەرەچەتان، زۆرمان پێخۆش بوو، دارێکی پێبوو قایشی تێکردبوو وەکو تفەنگ کردبوویە شانی بۆ بەرگریکردن لە خۆی بەکاریدەهێنا، ئەم نەریتەی لە کلکە سماقەوە هێنابوو، لەویٚ پێیاندەووت: دارە قوڵە، تەنها کوڕێکی هەبوو ناوی عەبدوڵڵا بوو، هاوڕێی منداڵیم بوو، ئەو زستانە بەفریاری بوو خەریکی شەڕەتۆپەڵ بووین، من و عەبدوڵڵای کوڕی قادرمان دابووە بەر تۆپەڵ، ڕقی لێمان هەڵسا دەیوت: لە بری لەسەرم بکەنەوە ئێوەش تۆپەڵم تێدەگرن! لە کاتێکدا لەگەڵ گوندەکەدا خەریکی شەڕەتۆپەڵ بوو، ئێمەش لە دواوە لێماندەدا، کە ئاوڕی دایەوە ئێمەی بینی تووڕە بوو دوامانکەوت و دەیووت: لەبری لەسەرم بکەنەوە ئێوەش پێمدادەکێشن!؟ ئێمە ڕامانکرد چووین بۆ لای باوکم ئەویش بە

دواماندا، باوکم لێی تووڕە بوو وتی: بزانە نایانکوژی وازیان لێبێنە، دواتر گەڕایەوە بۆماڵەوە.

لە هاوینی ١٩٥٨ ئێمە و ماڵی مام قادری ئامۆزام لە جۆگەی سەعیدە فەنی تووتنمان کردبوو، رۆژێك باوکم پێوتم: لەگەڵ مام قادر بچۆ بۆ کۆڵەکە چەرداغ، منیش لەگەڵی چووم من بە هێستری خۆم و ئەویش بە هێستری خۆی بۆ دۆڵە بی، وتی: بەس تۆ بۆم بکێشەرەوە بۆ لای وڵاغەکان، ئەو ئەوەندە بە هێز بوو دارەکەی دەبڕی و هەڵیدەدا و دەیکرد بە کۆڵەکە چەرداغ و هەڵی دەدایە خوارەوە، فریای نەدەکەوتم بیبەم بۆ لای وڵاغەکان. ئەو ساڵە چوو بۆ سەربازی و قەرەچەتانی بەجێهێشت، چوو بۆ سلێمانی لە گەڕەکی مەڵکەندی نیشتەجێ بوو، لەبەر ئەوەی تاقانە بوو کرا بە موعینی ژنەکەی تەسریح بوو، بۆ زستانی ١٩٥٩ چووم بۆ ماڵیان مام قادر قەزوانی لەبەر دەرگی سەرا دەفرۆشت.

لە ساڵی ١٩٥٨ رەحمانی مام عومەری ئامۆزام لە شاخی پیرەمەگرون بەردی گەورە خل بووەوە بەر سەری کەوت بەهۆی ئەوەوە گیانی لە دەستدا، لە کاتێکدا لەگەڵ هارونی برای چووبوو بۆ دارهێنان بۆ سووتاندن، خزمان زۆر نیگەران بوون بەو رووداوە، ساڵێك بوو ژن بە ژنی کردبوو لەگەڵ سەلامی ئامۆزای، ژنەکەی دووگیان بوو بە محەمەدی کوڕی، ئەم سەلامە پیاوێکی ئازابوو بەرامبەر ناحەزانی چۆکی دانەدەدا و دەستی خۆی دەوەشاند، بە داخەوە ساڵی ١٩٦٩ بە نەخۆشی گورجیلە کۆچی دوایی کرد.

ماڵی مام عومەر لە قەرەچەتان مابوونەوە کەریمی کوڕی هاوکاری زۆری کردووم بە تایبەتی لە کاتی پێشمەرگایەتیدا، کە بووە هۆی ئەوەی هاتوچۆی سلێمانی نەکات، چونکە بەعسییەکانی گوندەکە ناویان دابوو

كە هاوكاری من دەكات، لە رێگەی كوێخا مەجیدەوە بانگ كرابوو بۆ سەربازگەی سووسێ، بەڵام نەچوو بوو، چونكە ئەوەی نانی بدایە بە پێشمەرگە رژێم بانگی دەكرد.

لە ساڵی ١٩٥٩ سینەمایەكی سەفەری هاتبوو بۆ قەرەچەتان، لای خوێندنگەكە جێبێكی بچووك دەوەستا و پەڕۆیەكی خامی بە دیواری خوێندنگەكەدا هەڵواسی بوو، كامێرایەكی سینەمایی لەسەر جێبەكە دانرابوو وەكو قەوانی چایخانەكان وابوو، كە دەستی بە ئیشكردن دەكرد وێنەی پیاوێكی نیشان دەدا شەڕی دەكرد، خەڵكی گوندەكە زۆربەیان رایدەكرد، دوایی وردە وردە دەهاتنەوە بۆ سەیركردنی تا فلیمەكە تەواو دەبوو!؟ دوای رۆیشتنی جێبەكە خەڵك هەر باسی فلیمەكەیان دەكرد كە زۆر گرنگ بوو لایان، ئەم جێبە بۆ هەموو گوندێك نەدەچوو تەنها بۆ ئەو گوندانە دەچوو كە خوێندنگەی تێدابوو، چونكە بەڕێوبەرایەتی پەروەردەی ئەوسا دەینارد بۆ خوێندنگەكان بۆ چاوكردنەوەی خوێندكاران، كە ئیشی دەكرد خەڵكی تریش دەهاتن بۆ بینینی.

لە بەهاری ١٩٥٩ لەگەڵ ماڵی مام عومەر كە ئامۆزای خۆمان بوو دەمانویست زەوی ئامادە بكەین بۆ تووتنكردن لە جۆگەی حاجی خەلیفە، باوكم و من و هارونی ئامۆزام چووین بۆ جووتكردن، باوكم بە هارونی وت: وریابە كەڵەمە و نیر و هەوجار نەشكێنی، بەڵكو زەوییەكە خۆش بكەین بۆ دێراو هەڵدان بۆ بەیانی، چەند خولەكێكی پێنەچوو هارون وتی: بەخوا كاك عەلی مژانەكە شكا! ئەوە بۆ ناچی بۆ چەرمەگا مژانێكم بۆ پەیدا بكەیت؟ باوكم لێی تووڕە بوو وتی: بە خوا سووكەڵەی خۆی دۆزیوەتەوە! بۆچی من بەردەستی تۆم!؟ ئەی بەیانی نەمووت وریابە مژانەكە نەشكێنیت!؟ وتی: لە ماڵەوە شكا بوو. باوكم وتی: بۆ

هێنات ئەگەر شکابوو؟! کەرتێکی مژانەکەی هەڵگرت و دووانی پێداکێشا و هارون وتی: مەکە مەکە.. زانی زیاتری پێدادەکێشێت رایکرد. باوکم وتی: رانەکەیت بە خوا بەم چەکە دەتکوژم، ناچار ترسا و دانیشت، باوکم وتی: گاکان بەربدە با بچنەوە بۆ قەرەچەتان، تۆش بچۆ باراشێکم لە ئاشی قازیاوایە بۆم بێنەرەوە، هارون چوو بۆ قازیاوە و باراشەکەی بردەوە بۆ ماڵمان لە قەرەچەتان، باوکم دەستیکرد بە جووتکردن بە هێسترەکان و تا شەو بەردەوام بوو تا تەواو زەوییەکەی کێڵا، ئینجا جووتی بەردا و سوار بووین و گەڕاینەوە بۆ قەرەچەتان بۆ بەیانی چوون بۆ دێراوهەڵدان.

لە سەرەتای ١٩٥٩ چوومە ریزی حیزبی شیوعی عێراقەوە، لە رێگەی حەسەن محەمەد قادر کە خزمی خۆم بوو، ئەوکاتە ماڵمان لە گەبە بوو، مامۆستا رەئوف زوهدی کە مامۆستا بوو لە سووررداش و مامۆستا رزگاری لەگەڵ بوو، مامۆستا رەئوف دەهات بۆ سووسە کۆن بۆ کۆبوونەوە پێکردنمان، ئەوکاتە حەمە سۆیلە و حەسەن محەمەد قادر ئەندامی ناحیە بوون، کە پێشتر لە کاتی مەلیکدا لە بەندیخانە ببوون بە شیوعی، لە قەرەچەتان نوری حاجی گوورون و یاسینی حاجی حەسەن ئەندام بوون، لە گەبە حەمەئەمین ئەحمەد ئەندام بوو، لە موخاخ کوێخا مەحمودی ئامۆزام ئەندام بوو، کە زۆربەیان کۆچی دواییانکردووە خوا لێیانخۆش بێت. شانەکەی ئێمە پێکهاتبوون لە من و حەمەمینی فەتحە و حەسەن کاکی و نوری حاجی گوورون و حەسەن مام رەشید، دواتر حەمەئەمین ناسرابوو بە زەعیم لە کەرکوکەوە هاتبوو. لەو سەردەمەدا عەبدولڕەحمانی صاڵحی خدر کە سەرۆکی کۆمەڵەی هەرەوەزی بوو لە سلێمانی، پێیاندەووت: ئەوڕەحمانی خلە بن جوو، دیار بوو لە بنەڕەتدا

جوولەكە بوو، جارجار بۆ سووسە كۆن بۆ كاری كۆمەڵەكەی دەهات سەردانی دەكردین. عەبدولڕحمان بن جوو دواتر جەماعەتی (كانی ماسی) شەهیدیان كرد و تەرمەكەیان سووتاند، هەروەها فەقێ عەزیزی بەنا كە خەڵكی سووسێی ئاڵەمەرە بوو، ماڵی لە سلێمانی بوو سەردانی دەكردین.

لە زستانی ١٩٥٩ ئایشەی خوشكم شووی كرد بە كاك صدیقی كوڕی حەمەی ئەوڕەحمانی پورزای باوكم و بردیان بۆ كلكە سماق، لەوكاتەدا من و حەلاوەی خوشكم و عومەری برام منداڵ بووین و دایكم نەمابوو، تەشتمان بە ماڵانەوە دەگەڕا، ئەو ساڵە باوكم مەلێحەی كچی مام مەولودی بۆ ئەحمەدی برام خواست، ئەویش هیچی نەدەزانی چونكە منداڵ بوو ئەویش دایكی نەمابوو باوكی بە ئیشی چایخانە بەخێوی كردبوو، ئێمە وەزعمان زۆر خراپ بوو بە تایبەتی ئەوكاتەی ئەحمەدی برام چوو بۆ سەربازی تا چووینە گەبە كەمێك وەزعمان باشتر بوو.

لە ساڵی ١٩٥٩ لە موقاتەعەی چەرمەگا زەوییەكمان هەبوو ٩٣ دۆنم بوو، ئێستا بووە بە ناوچەی پیشەسازی پیرەمەگرون و شارەوانی دەستی بەسەرداگرتووە و هیچ بەرامبەرێكمان وەرنەگرتووە لەسەری، لە كاتێكدا خاوەنداری ئێمەیە بە موڵكی سەرف، بەم زەوییە دەگووترێت زەوییە درێژ، لەو ساڵەدا كرابوو بە گەنم، باوكم منی نارد لەگەڵ دوو پیاودا بۆ ئەوەی زەوییەكەیان نیشان بدەم كە بە نیاز بوون بە سەپانی بیدوورنەوە، كە گەیشتینە ئەوێ پێمووتن: ئەمە زەوییەكەیە، یەكێكیان دەستی لە پشت چاوی دانا و وتی: تەماشا دەڵێیت بە كەروێشك چاندوویەتی! ئەمە چۆن بە ئێمە دەدوورێتەوە؟! بە جێیانهێشتم و منیش گەڕامەوە بۆ لای باوكم بە تەنیا، باوكم وتی: سەپانەكان جییان

لێهات، بۆ نەهاتنەوە؟ منیش بۆم گێرایەوە کە وایانووتووە، باوکم وتـی: بە خوا ترساون لێی بۆیە نەهاتوونەتەوە.

لە زستانی ١٩٥٩ عومەری برام ون بوو لە قەرەچەتان، هەموو رەز و کانی و ئاوەکانی بۆ گەڕاین، خزمەکانمان هەمووی وەکو مام عومـەر و حەسەن ملبۆر کەوتنە گەڕان، تەمەنی ٥ ساڵ دەبوو، بەڵام مـنـداڵـێـکـی وریا بوو، ئەو ئێوارەیە چوو بوو بۆ زێویێ، شـەو شـوان گـەڕایـەوە کـە غەریبی سەعید جۆلا بوو وتی: منـداڵـێـکـم دیـوە بـە شـیـوی کـارێـزدا سەرکەوتووە بەرەو دەربەندی زێویێ، من و مام حەسەن فانۆسێکمان برد و چووین بۆ زێویێ، بە مام حەسەنم وت: پێش چەند رۆژێك چووین بۆماڵی حەمەڕەشید خدر بۆ هێنانەوەی هێسترەکەمان لەوانەیە چـوو بـێـت بـۆ ئەویێ. کە چووینە ماڵی حەمەڕەشید خدر بینیمان عومەری برام لەوێیە و دانیشتووە قسەی زلیان بۆ دەکات! و ئەوانیش منداڵـی وردیـان نـەبـوو زۆریان پێخۆش بوو کە چووە بۆ ئەویێ. وتمان: عومەر بـۆ هـاتـووی بـۆ ئێرە؟! وتی: هاتووم بۆ مەشکەکە کە پێشتر بەڵێنیان پێدابووین، شـەو لەویێ ماینەوە و بۆ بەیانی هاتینەوە بۆ قەرەچەتـان. لـە رێـگـا وتـمـان: عومەر بۆ ناچیتەوە بۆ زێویێ یەکسەر مەشکەکەی دانـا و خـەریـك بـوو بڕوات، مام حەسەن دوو شەقی تێهەڵدا و وتی: جارێکیتر بچـیـتـەوە بـۆ زێویێ گوێت دەبڕم. کە هاتینەوە هەموو دێیەکە پێیانزانیبوو کە ون بووە و زۆریان پێ سەیر بوو منداڵێکی وا بەو ئێـوارەیـە بـۆ زێـویێ بچـێـت!؟ دوایی زانیمان بۆچی چووە بۆ زێویێ، پێشتر چووبووین نان و دۆشـاومـان خواردبوو لەویێ، عومەری برام حەزی لێکردبووەوە دیسانەوە ملی رێگـای گرتبوو بۆ نان و دۆشاو خواردن!؟

لە ساڵی ١٩٦٠ لەگەڵ ئەحمەدی برام و رەحیم مام رەسوڵ و مەجید مەنە رۆژانە بە کرێ جووتی گا و هێسترمان دەکرد، بۆ ماڵی حاجی ئەمینی گەبە ڕۆژی بە ٦ پەنجایی، ئیشی دێراو راکێشان و گیادروون و دیوارکردن و بەرد کێشان و کەروبەردکێشمان بۆ دەکردن، دیار بوو حاجی ئەمین پارەی زۆر بوو، زوو زوو پارەی دەداینێ، ئێمەش بۆ خەرجی رۆژانە بەکارماندەهێنا، هەر لەوێ حاجی ئەمین شوێنی ١٠٠ دێراو تووتنی دابوو پێمان بە سێ یەك، کە بەشێکی بۆ ئەو و دوو بەشی بۆ ئێمە، لەگەڵ ئەوەشدا پارەی بە قەرز یان سەلەم دەدا پێمان، زۆر ژیانمان ناخۆش بوو، ئەحمەدی برام لە من بەکارتر بوو دەچوو بۆ شەریکەی زێڕاندۆڵ لە دوکان بۆ کرێکاری، کاتی خەرمان باوکم و ئەحمەدی برام دەچوون بۆ دوکان و کلکە سماق بۆ گێرە بە جەنجەڕ و بە رۆژانە وەزعمان کەمێك باشتر بوو، بەڵام لە پڕ ئەحمەدی برام گیرا بۆ سەربازی وەزعمان بەرەو خراپی رۆی.

لە سالانی ١٩٦٠ بە دواوە کۆمەڵێك دەرەبەگ ناویان لە مێژووی چەوسانەوەی جووتیار تۆمارکراوە، وەکو حاجی عەبە کلاش و رەشید جەنجەر کە شارەزووری کۆنترۆڵ کردبوو، حاجی حسەین لە ناوچەی سووررداش، بەڵام شێخانی حەفید ئەو کارەیان نەدەکرد بە حەرامیان دەزانی، بەڵام ئەو دەرەبەگە بچووکانەی لەسەر زەوییەکانی ئەوان بوون کاری سەلەم و سوویان دەکرد بەبێ ئاگاداری ئەوان، خۆیان کردبوو بە ئاغا و دەرەبەگ. هەندێك کەسی تر زەوی میرییان بە کرێیەکی کەم وەردەگرت و خۆیان کردبوو بە دەرەبەگ بە جووتیاریان دەدایەوە بە سێ یەك، بە تایبەتی لە زەوییەکانی کرژە و جەرمەگا و چالاخ و سووسێ کۆن. کۆمەڵێکی تر هەبوون تازە لە سلێمانی دەوڵەمەند ببوون لەگەڵ

ئاژەڵدار و مەڕدار پەیوەندییان هەبوو دەستیان کردبوو بە سەلەمکردنی کار و گیسك، کاتێك گەورە دەبوو لێی وەردەگرت و خۆی دەیفرۆشت و قازانجی زۆری دەکرد، هەروەها رۆنی کوردی و خوری و لۆکەیان سەلەم دەکرد. دوایی سەلەم کەم ببووەوە، دەوڵەمەندەکان بە شێوەیەکی زیرەکانە مامەڵەیان دەکرد ئەگەر یەکێك شۆفێری بزانیایە سەیارەیەکی بۆ دەکڕی پێیدەگووت مایەکەی دەربکە لە ئیشی شۆفێرییەکەی دوایی دەتکەم بە هاوبەشی خۆم، ئەو بەستەزمانە خۆشی نانی لێنەدەخوارد، بۆ ئەوەی مایەکەی دەربکاتەوە و ببێت بە هاوبەشی. ئەم کارە زیاتر حەمەی شێخ بەکری سەرگەڵو دەیکرد.

لە ساڵی ١٩٦٠ بە دواوە تووتن باوی بوو، لە دوای شۆڕشی ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ کۆمەڵێك جووتیار شاربەدەر کران، لە ناوچەی کۆیەوە هاتبوون بۆ شیلەخانی خواروو بۆ سەر زەوییەکانی شێخانی حەفید، ئەم جووتیارانە زۆریان پەیوەندییان هەبوو بە حیزبی شیوعییەوە وەکو صەمەد و سەرحەد و عەلی مام قادر. لە شیلەخانی خواروو پیاوێك هەبوو ناوی حەسەن مامە بوو باوکی مەلا وشیار بوو، زۆر بەکار بوو وەکو شۆفڵ وابوو، جۆگەیەکی بە تەنیا راکێشابوو لەسەر جۆگەی خولە چەرمە، پێیاندەووت جۆگەی حەسەن مامە بۆ خۆی کشتوکاڵی لەبەردا دەکرد، جووتیارەکان کاریان لەسەر زەوییەکانی شێخانی حەفید دەکرد بە سێ یەك، هەر ئیشێك گران بووایە جووتیار دەیوت: خۆ من حەسەن مامە نیم بە تەنیا جۆگەیەك راکێشم، لە دوای راپەڕین حەسەن مامە کۆچی دوایی کرد خوالێیخۆش بێت.

لە ساڵی ١٩٦١ ئەحمەدی برام لە کەرکوك سەرباز بوو، دوای گێرەی خۆمان، بە کرێ گێرەم بۆ خەڵکی گەبە دەکرد بە جەنجەڕ،

ڕۆژێك گێرەم بۆ نەجیم و مەجیدە سووری برای دەکرد، پیاوێك هات کە بچم گێرەی بۆ بکەم، وتی: بە خوا هێسترە ڕەش جوان دەڕوات و گێرە دەکات! لە پڕ هێسترەکە کەوت بە پەلەپەل کەڵەمەکەمان بە چەقۆ بڕی، هێسترەکە هەستایەوە و لەشی کەوتە لەرزین و ئارەقکردن ئیتر گێرەی بۆ نەکرا! کاك مەجید هات وتی: ماڵت بە قوڕ نەگیرێت بۆ هاتی ئەم تفەنگەت نا بەم هێسترەوە و کوشتت!؟ پێیووتم: گێرەم بۆ بکە. وتم: ناتوانم چونکە هێسترە ڕەش بەر تیر کەوتووە! لەوکاتەدا ئەمینی فەتاح هات وتی: وەرە سەیری خەرمانەکە بکە لەسەر کانی هۆمەرە زۆر سێبەری خۆشە بیکە بە قۆنتەرات لە کاتی فێنکی بەیانیان و ئێواران، منیش ڕازی بووم، چووم لە کاتی بەیانیان و ئێواران بۆ ئەوەی هێسترەکە هیلاك نەبێت، چەند ڕۆژێك خەرمانم کوتا، دوای ئەوە ئیشی گێرەم پێنەکرد.

لە هاوینی ١٩٦١ لەگەڵ خوالێخۆش بوو عارف قەرەچەتانی لە گوندی کۆکەوە دەگەڕاینەوە بۆ قەرەچەتان، کاك عارف پیاوێکی کەڵەکەتی چوارشانە بوو تا بڵێی ئازا و لە خۆبردوو بوو، لە ڕێگا هەر باسی خۆی بۆ دەکردم، لەو کاتەدا چناری کردبوو لە بڵاخەکە لە گوندی کۆکە، کە موڵکی خۆیان بوو، کە چووم بۆ لای خۆی پاچەکۆڵەی دەکرد، پێموت: بۆ خۆت پاچەکۆڵە دەکەیت؟ وتی: بە پارەش کارم بۆ ناکەن دەڵێن نوێژ ناکات پارەکەی حەرامە، ناچار خۆم کارەکە دەکەم! پێیوتم: تۆ زۆر بە شەهامەتی بەم منداڵییە لە صاڵحی فاتەخانە دەچیت و هەر وەکو ئەو کەڵەکەتی، کاتی خۆی صاڵحی فاتەخانە لە قەرەچەتان لەگەڵ هەموو بنەماڵەکان پەیوەندی باش بووە، لایەنی هیچ بنەماڵەیەکی نەگرتووە دژی بنەماڵەی تر، هیوادارم تۆش وابیت، تائێستا من هەموو

بنەماڵەکان لە قەرەچەتان بە برا و خزمی خۆم دەزانم هەموو جارێك ئەو وتەیەی کاك عارف دێتەوە یادم. ئەم کاك عارفە لە گوندی قەرەچەتان گرنگی وای نەبوو نەیاندەزانی باش تێیبگەن، بەڵام ئەگەر بچووینایەتە دەرەوەی گوندەکە بمانگووتایە قەرەچەتانین، دەیانووت: عارف قەرەچەتانی چیتە!؟ شەهامەتی ئەم پیاوە لە دەرەوەی گوندەکە زیاتر بوو، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ پیاوەتی و ئازایەتی و دیبلۆماسییەتی خۆی.

لە ساڵی ١٩٦١ دوای ئەوەی ئەحمەدی برام بوو بە سەرباز باوکم تاقەتی ئیشی نەبوو، وەزعمان خراپ تێکچوو بوو، جووتیارەکانی گەبە لەگەڵ حاجی ئەمین و دەروێشی کوێخا سەعید کە زەوییەکانی شێخی سلێمانییان بە کرێ گرتبوو تێکچوو بوون، هاتن بۆ قەرەچەتان بۆ ئەوەی جووتیارەکانی قەرەچەتان بچن زەوییەکانی بەر جۆگەی کانی چنار و مسکێنی و ئاشەڕەشکە بچێنن، باوکم جووتیارەکانی قەرەچەتانی کۆکردەوە و چوون بۆ چاندنی زەوییەکان کە ببووە هۆی ناخۆشی لە نێوان جووتیارەکانی قەرەچەتان و گەبە، چونکە پێیاننناخۆش بوو جگە لە خۆیان کەسی تر بێت بۆ گەبە بۆ جووتیاری، باوکم سوودی لێبینی کە زەوی باشیان لەسەر جۆگەی مسکێنی بۆ دیاریکرا بوو. لەو جووتیارانەی کە هاتبوون بۆ کشتوکاڵ وەکو: ئەحمەد قادر و محەمەد قادر و نجم ئەحمەد و کریمی حەمە عەلی و حەمە مینی مام صاڵح و .. هتد. بە جووتیاری ئەو ساڵە وەزعمان زۆر باش بوو، بۆ بابیزەکەی ماڵمان چوو بۆ گەبە و لەوێ نیشتەجێ بووین، بەهۆی ئێمەوە ماڵی خوالێخۆش بوو عەبدوڵڵا دێوانە لە عەوەڵانەوە هاتن بۆ گەبە بۆ جووتیاری، چووم بۆ سلێمانی دەمانچەیەکم کڕی لە کاتێکدا دەمانچە

باوی بوو لە گوندەکان نیشانەی پیاوەتی بوو. بە سەیارەی مەلاریا دەهاتمەوە بۆ گەبە، لەگەڵ خوالێخۆش بوو نەجم ئەحمەد بووم لە بازگەی بەکرەجۆ دایانبەزاندین و دوای دابەزین هەردووکمان رامانکرد، هەواڵیان دابوو بە پۆلیسی سەرچنار بە سواری ئەسپ هاتبوون لە گوندی قلیاسان منیان گرت و نەجم بەهێزتر بوو لە من ئەو نەگیرا، دیاربوو هەواڵیان لێدابووین، چونکە شۆڕش دەستی پێکردبوو. ساڵێك بەند کرام لە ساڵی ١٩٦٢ ئازاد کرام، لە بەندیخانە قاوشی ٥ بۆ شیوعییەکان بوو، قاوشی ٦ بۆ پارتییەکان بوو، کە چوومەناو بەندیخانە عوسمان عوزێری خوالێیخۆش بێت هات بردمی بۆ لای خۆیان، چونکە پێشتر دەیناسیم زۆر رێزی لێگرتم، لەبەر ئەوەی من سەردانم نەبوو، دوای هەفتەیەك حەسەن محەمەد قادر و خێزانەکەی کە پورزام بوو هاتن بۆ لام و نامەی حیزبیان بۆ هێنابووم بۆ لای غەریب رەشید کە لێپسراوی قاوشی ٥ ی شیوعییەکان بوو، منیان نارد بۆ قاوشی شیوعییەکان، عوسمان عوزێری زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام من داوای لێبووردنم لێکرد، چونکە من پەیوەندیم بە حیزبی شیوعییەوە هەیە نابێت پێت ناخۆش بێت، لەوێ ئەسکەندەرم ناسی کە جووتێك سمێڵی هەبوو، بە پەیامی حیزبەوە گیرابوو کە لەسەر خەسرەوی رۆزبێ دەرکرابوو بۆ ئازادکردنی، بۆ دوای ئەو رۆژە بۆ بەیانی خەڵکی ئێرانی و بێلایەنیان دەبرد بۆ ئیش، هاتن منیان برد بۆ ئیش نازانم کێ ناوی منی دابوو بە پۆلیس، لەسەر ئیشەکە خولە گوڵە هات کە بەند بوو کردبوویان بە چاودێر و دایکی قەرەچەتانی بوو، وتی: کێ ئەم پیاوەی هێناوە بۆ ئیش؟ ئەوانیش وتیان: ناوی دراوە نازانین کێیە. هات خاکەنازەکەی لێوەرگرتم و نەیهێشت ئیش بکەم، بردمییەوە بۆ قاوش، من نەمدەناسی بەس ئەو منی دەناسی، دوایی هات

وتی: کەس ناتوانێت دەست بۆ تۆ بەرێت تا منی لێبم. پێش گیرانم لە ڕێگەی حەسەن محەمەد قادرەوە پەیوەندیمکرد بە حیزبی شیوعییەوە کە خێزانەکەی پوررزام بوو، لەو کاتەدا ڕەئوف زوهدی مامۆستا بوو لە سووورداش لێپرسراومان بوو. لە بەندیخانە هەواڵی کوشتنی حەمەئەمین ئەحمەدم بیست کە ئەندامێکی چالاکی حیزب بوو، ناوە نهێنییەکەی تۆکمە بوو، ئەندامی ناحیەی سووورداش بوو زۆرم خۆشدەویست کە ئازاد بووم حمەئەمین کوژرا، ئیتر گەبەم لەبەرچاو کەوت.

لە ساڵی ١٩٦٢ باوکم چێواری دەکرد چوو بوو بۆ دۆڵی جافایەتی بۆ ئاژەڵ کڕین، لەگەڵ حامید ئەحمەد برای حاجی حەمەخان هاوبەشی باوکم بوو، وەچاغی کوێر بوو پارەی زۆر بوو دیار بوو زۆری پارەکە هی ئەو بوو، بەڵام نەیدەوێرا بە تەنها کاسپی بکات نەوەك جەردە روتی بکەنەوە، بۆیە لەگەڵ باوکم ببوو بە هاوبەش، ئاژەڵەکان چەند ڕۆژێك مایەوە، لە گەبە باوکم نەخۆشکەوت وتی: تۆ لەگەڵ حامید بچۆ بۆ کەرکوك ئەو ئاژەڵانە بەرن بۆ ئەوێ، منیش قەد کەرکوکم نەدیبوو زۆرم پێخۆش بوو، ئاژەڵەکانمان لێخوڕی بۆ کەرکوك من لە پێشەوە و حامید لەدوواوە، نانمان پێبوو، دوای دوو ڕۆژ چووینە کەرکوك، ئێوارە بوو لە دەوری موسەڵا خەوتین کە مەیدانی حەیوان بوو. بۆ بەیانی دەوری موسەڵا قەرەباڵغ بوو هاتن بۆ ئاژەڵ کڕین، ئێمە ئاژەڵەکانمان فرۆشت، من هیچ مامەڵەم نەدەزانی، تەنها حاجی حامید مامەڵەی دەکرد، لە موسەڵا کابرایەکی تورکمانمان لێ پەیدا بوو جزداشەیەکی لەبەردا بوو گاڵتەی پێدەکردین و بەدەورماندا دەسووڕایەوە و قسەی ناشیرینی بە کورد دەگووت، ئێمەش خۆمان نەکرد بە خاوەنی، چووینە چایخانەیەك لە موسەڵا ئەو کابرایە هەر بە دووامانەوە بوو، کە دانیشتین ئەویش

دانیشت و وتی: بیر چایی لامەرکەزی گێتمیش. وتم: حامید ئەوە لەگەڵ ئێمەیەتی؟ وتی: نا. وتم: گۆچانێکی پێدا دەدەم و تۆ خۆت مەکە بە خاوەنم. وتی: کوڕە مەکە دەتکوژن! وتم: قەینا. وتی: باش. چووم لە پشتەوە هەتا توانیم گۆچانێکم دا بە پشتە سەریدا و کەوت و گۆچانەکە شکا و بەس چەمەکەیم بە دەستەوە مایەوە، کە کەوت رامکرد ببوو بە هەرا گوێم لێبوو پێیاندەووت: لە بەیانییەوە بیانوو بەو فەقیرە دەگرێت چیت هەیە لەگەڵی!؟ دیار بوو ئەوە ئیشی بوو تا خوا منی بۆ نارد!؟!

دوور کەوتمەوە لەوێ و ئاگام لە حامید نەمابوو، بەڵام ئەو شارەزابوو چەند جارێکی تر چووبوو بۆ کەرکوك، کە رامکرد تا سەری کۆڵانەکە نەوەستامەوە، عەرەبانەیەکم گرت بە کرێ بۆ نەقلیاتی سلێمانی، چوومە ماڵێك نان و چایان دامێ، بۆ ئەوەی نەمگرن لەسەر کابرای تورکمان لەوێ بووم تا حاجی حامید هات، سواری باص بووین بۆ سلێمانی و لە کانی شەیتان دابەزین و چووینە ماڵی کوێخا ئەسعەد و شەو ماینەوە، چونکە پورزای باوکم بوو، باسی شەڕەکەم بۆ کرد زۆری لاسەیر بوو کە توانیومە لە کەرکوك ئەو کارە بکەم، زۆری پێخۆش بوو، بە حامیدی وت: ئەمە پیاوێکی ئازایە ناوی باوکی ون ناکات، باوکیشی وا ئازایە، چەند جارێك هاتووە لەسەر ئێمە شەڕی کردووە. دوای نانی بەیانی بە پێ لە رێگای تۆکمەوە چووینەوە بۆ گەبە.

لە گەبە دوو برادەرم هەبوو کە ناویان حەمەلاو کاکە مەند و رەفیق حەمەئەمین بوون، شەو و رۆژ پێکەوە بووین، دەچووین بۆ گولیجە بۆ یاری ٢١ لەگەڵ ئەحمەد نەسرەدین و نامیقی نازیف، شەوێك رەفیق دۆڕانی کە چووبووەوە ماڵی خۆیان بە دەم خەوەوە وتبووی: ئەرەوەڵا ٢١ دەرچۆ بانقەکەی منە!! بۆ بەیانی باوکی هات بۆ لام

پێیووتم: رەفیقت بردووە بۆ کوێ؟ وتم: چووین بۆ گولیجە؟ وتی: بۆچی چوون؟! وتم: بۆ میوانی. وتی: راست برۆ.. وتم: بۆ یاری ٢١ چووین! وتی: رەفیق دۆڕانی؟ وتم: بەڵێ! ئیتر زۆر بەسەرماندا هات کە واز لەو ئیشە بێنین ئێمەش بە قسەمان کرد.

لە پاییزی ١٩٦٢ هیچ پێناسەیەکمان نەمابوو کە بیسەلمێنێت عێراقین، وێنەی باوکم و خۆم برد بۆ سورداش بۆ دەرهێنانی ناسنامەی باری شارستانی، لە رێکەوتی ٢ / ٩ / ١٩٦٢بە دوو کاتژمێر دەفتەر نفوسی خۆم و باوکم دەرهێنا.

لە پاییزی ١٩٦٢ من و ئەحمەدە سوور کە زاوای شەهید حەمەئەمین بوو لەگەڵ عەبدولڕەحمان دێوانە کە پوورزای باوکم بوو، چووین بۆ گەورەدێ بۆ راو، چونکە گەورەدێ و چەمی رەزان مەڕەسوورەی زۆر هەبوو، عەبدولڕەحمان چەکێکی پێبوو کە پاسەوانی باخ بوو لە دەربەندی بازیان پێیان دابوو، زۆر سەیر بوو ٩ فیشەکی دەخوارد، منیش چەکێکی سێتیری کورتم پێبوو، کاتی تێپەربوونی ئاژەڵ بوو، شەو ماینەوە چووینە ماڵی شێخ خالید لە گەورەدێ، دواتر چووینە پشتی کەڵەشێرە کوێخا نەریمانمان بینی زۆر هەوڵی دا بمێنینەوە لای، بەڵام نەماینەوە، هەرچەندە تەقەمان کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی نە راوچی بووین و نە تفەنگچی هیچمان راونەکرد! ئەگەر باوکم لەوێبوایە دوو ئاژەڵی راو دەکرد. گەڕاینەوە بۆ گەبە، لەوکاتەدا هاوین بوو لەگەڵ ماڵی عەبدوڵڵا دێوانە توتنمان بە هاوبەشی دەکرد لە کانی دینار.

لە زستانی ١٩٦٢ کوێخا مەحمودی ئامۆزام لە موغاغ مرد، لەگەڵ کاك حەمەئەمین ئەحمەد چووین بۆ پرسەکەی، لە کاتێکدا کوێخا مەحمود لەگەڵ من و کاك حەمەمین لە حیزبی شیوعیدا کاری دەکرد،

ساڵێك پێش مردنی ژنی هێنابوو، کچێکی هەبوو ناوی نەسرین بوو. ئەم کاك حەمەئەمینە ناسرابوو بە تۆکمە کادێرێکی چالاکی حیزب بوو لێپسراوی ئەو شانەیە بوو کە من کارم تێدا دەکرد، بە داخەوە لە شەوی ١ / ٦ / ١٩٦٢ لە گوندی گەبە بە دەستێکی چەپەڵ لە ماڵی خۆی شەهید کرا، کاتێك لەو سەردەمەدا ناحەزانی حیزبی شیوعی بە کاری نهێنی هەڤاڵە چالاکەکانی حیزبیان شەهید دەکرد.

لە زستانی ساڵی ١٩٦٢ ماڵمان باریکرد لە گەبەوە بۆ سووسێ کۆن، ئەحمەدی برام لە سەربازی بەخشرا، وەزعمان باش بوو، باوکم چوو بۆ سلێمانی لەگەڵ مەلا محەمەدی ژنبرای شێخ ویسف رێککەوت کە ئێمە بچینەسەر جۆگەی مەلا سەوخە و کارێزەکانی باوەمەندان کە شوێنێکی لە بار بوو بۆ بەخێوکردنی ئاژەڵ و دارستانی باشی لێبوو، بۆ زستان و ناوچەیەکی چۆڵی بێ کێشە بوو، باوکم لەسەر ئەم جۆگە و کارێزانە دەستی کرد بە کشتوکاڵکردن بە سێ یەك، مەلا محەمەد پارەی دەداینێ بە قەرز بەبێ سەلەم، خاوەن زەوییەکانی تر بە سەلەم پارەیان دەدا بە جووتیارەکان، مەلا محەمەد ماڵی لە سلێمانی بوو کاتی گۆلبڕین بەیانیان دەهات بۆ سەر زەوییەکان و ئێواران دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، ئێمەش چیمان پێویست بووایە پێماندەووت بۆی دەهێنایین.

لە ساڵی ١٩٦٢ ئەندامی لیژنەی ناحیەی سورداش بووم چەند شانەیەکم لابوو، یەکیان لە گەبە و یەکیان لە گولیجە و یەکیان لە قازان، لەگەڵ حەمە سۆیلە چووین بۆ تەڕەمار بۆ ئەوەی شانەی لێ دروست بکەین، بەڵام کەس ئامادە نەبوو ببێت بە شیوعی، لە ماڵی عومەر ناوێك ماینەوە، دواتر هاتینەوە من چووم بۆ گەبە و جارێکی تر ئابوونەی حیزبیمان کۆکردەوە لە ئەندامانی ئەوێ، ئابوونەکە هەمووی بریتی بوو

لە ١٦ پەنجایی، ئەو شەوە چووم بۆ گولیجە لە ماڵی قادر کەریم سەرکار مامەوە، رەفیقی برای ئەندام بوو، شەو لەوێ مامەوە و بۆ بەیانی دوای نان و چا خواردن رۆیشتم لە رێگا دەستم کرد بە گیرفانمدا ئابوونەکەی تێدا نەمابوو لە ماڵی کاك قادر لێم کەوتبوو، زۆر دڵگران بووم، بەڵام رووم نەهات بچمەوە بۆی، ئێستاش ئەو پارەیەیان لایە و بە هیوام لێیان بسەنمەوە، دواتر گەڕامەوە بۆ باوەمەندان.

لە کۆتایی ١٩٦٢ کە ماڵمان لە سووسە کۆن بوو هێزێك هات کە سەر بە چەمی رەزان بوون، لێمان کۆبوونەوە بۆ ئەوەی بە دیل بمانگرن، بەڵام ئێمە لێیان هاتینە دەست، حەمە سۆیلە لە قاتی خوارەوە و منیش لە قاتی سەرەوە دەستمان کرد بە تەقە، حەمە سۆیلە چەکێکی پۆرسەعیدی پێبوو پێیاندەگووت بڕنەوی ١٠ تیر، منیش ٥ تیری ئیگلیزیم پێبوو، نەیانتوانی لێمان نزیك ببنەوە، دوایی لە پشتەوە ئاگریان لە خانوەکە بەردا، دووکەڵ تینی بۆ هێناین، لەوکاتەدا شێخ عوسمان شێخ فەتاح عەوەڵانی باوکمی هێنا لەبەردەمی خۆیەوە و لە پەنجەرەکەوە قسەی لەگەڵ کردم وتی: دەبێت من و باوکت بکوژیت دێمە ژوورەوە! ناچار لەبەر باوکم و شێخ عوسمان هاتمەدەرەوە بە مەرجێك چەك نەکرێم، لەوکاتەشدا حەمە سۆیلە هەر تەقەی دەکرد، لە بەیانییەوە تا نیوەڕۆ شەڕ بوو کەس نەهات بە لامانەوە، کە خزمی شیویعیمان لە نزیك خۆمان هەبوو نەهاتن، بە هەمان شێوە شێخ عوسمان باوکمی خستە پێش خۆی و چوو بۆ لای حەمە سۆیلە بە هەمان شێوەی من هاتەدەرەوە، لەسەر داوای خۆمان و شەرەفی شێخ عوسمان تا چەمی رەزان چەکەکانمان بە شانەوە بوو چەك نەکراین، لە چەمی رەزان بەند کراین، بریتی بووین لە من و حەمە سۆیلە و تۆفیق مام رەشید و مستەفا

كە هەموومان ئامۆزا بووین، ئەوانەی لەگەڵمان بوون وەكو باوكم و حسەین گەڕانەوە بۆ سووسە كۆن، ئەو هێزە كە هاتبوونە سەرمان خزمی خۆمانیان لەگەڵ بوو، بەڵام خۆیان ئاشكرا نەكردبوو. دوای هەفتەیەك عەلی سۆیلە كە پۆلیس بوو لە بە غداد، رایكرد بۆ چەمی رەزان و بوو بە پێشمەرگە و چەكەكەی حەمە سۆیلەی بردە لای خۆی. دوای دوو هەفتە بەڕێز مام جەلال هات، گەلێك قسەی خۆشی بۆ كردین وتی: واز لە شیوعییەت بێنن، لقتان بۆ دەكەمەوە و دەتانكەم بە لێپرسراوی ئەم ناوچەیە، ئێمە رازی نەبووین و ئێمەیان ناردەوە بۆ بەندیخانە، بۆ بەیانی كوێخا نەریمانی كەڵەشێرە هات ببێت بە كەفیلمان، بەڵام قبوڵیان نەكرد پێیانووت: هەركەسێك بگیرێت و تۆ ببیت بە كەفیلی نابێت، چونكەماڵەكەت لە نزیكی ئێمەیە وەكو پێشمەرگە حسابیان بۆ دەكرد، دوای ٣ هەفتە حەمەی حسەین و حاجی گوورون هاتن بۆ لای مام جەلال لە چەمی رەزان، مام جەلال رازی بوو كە حاجی گوورون ببێت بە كەفیلمان، ئێمە ئازاد كراین و تۆفیق ئازاد نەبوو، چونكە تۆمەتباركرا بوو بە كوشتنی كەسێك.

لە بەهاری ١٩٦٣ هێزێكی ١٠٠ كەسی لە كلكەسماقەوە هاتبوون بچن بۆ لای شێخ لەتیفی حەفید، ئەم هێزە مەلا عەلی كە ناسرابوو بە دارا و حەمە سۆیلە و نوری حاجی گوورون و حەمیدی مامە رەزا خوالێیخۆش بێت لێپرسراوی هێزەكە بوون، لە قەرەچەتان لایاندابوو بۆ پشوودان و هێزێك كە سەر بە چەمی رەزان بوون لێیان كۆببوونەوە چەكیان كردن و خۆیان ئازادكردن و دەستیان بەسەر چەكەكاندا گرت.

یەكێك لە دۆستە دێرینەكانی ئەم بنەماڵەیەی ئێمە كە من و حەمە سۆیلەی ئامۆزام پەیوەندیمان پێوەی بوو ناوی حسەینی حاجی

ئیسماعیلی دوکان بوو، خوالێیخۆش بێت مەلەوانێکی چاك بوو، کاتێك دەچووینە کلکەسماق بە ئازادی نەماندەتوانی لە ئاوی دوکان بپەڕینەوە، دەچووینە ماڵی کاك حسەین، لە ماڵی خۆیان چوار چووپی کردبوو بە کەڵەکی پەڕینەوە، بە حەبل تەختەی لەسەر بەستبوو شوێنی چوار کەسی لەسەر دەبووەوە بۆ پەڕینەوە، یارمەتی دەدایین بۆ پەڕینەوە، چەند جارێك کە کەسانی سەر بە حیزبی شیوعی دەهاتن دەمانبردن بۆ ماڵی ئەوان، ئەوانیش هاوکارییان دەکردن، ئەم کاك حسەینە دۆستێکی باش بوو، لە دوای راپەڕین چەند جارێك دەهات بۆ لام دەیووت: ماڵی برای خۆت لێرەیە و تۆ ماڵت لە ئێرانە، وەرە بۆ ماڵی برای خۆت. لە ساڵی ٢٠٠٥ رۆژێك من و کاك شەوقی کوێخا سمایل خوالێیخۆش بێت، چووین بۆ سەردانی، چونکە نەخۆش بوو، زۆر گلەیی لێکردم وتی: تۆ برای خۆشەویستی منی چۆن دەبێت زوو زوو سەردانم نەکەیت! ؟ لەگەڵ بنەماڵەی ئێوە وەکو خزم واین، حاجی عەلی باوکت و ئەحمەدی برات ساڵی ١٩٥٩ لەم دەڤەرە گێرەیان دەکرد و تازە لە بەندیخانە ئازادکرابووم نێوانمان خۆش بوو، بە زۆری لە ماڵی ئێمە بوون، ئەم دۆستایەتییە بابمێنێت، بە داخەوە لە مانگی یەکی ٢٠١٨ کۆچدوایی کرد، خوا لێیخۆش بێت.

لە بەهاری ١٩٦٣ ماڵمان باریکرد بۆ باوەمەندان کە پێشتر خانوومان بە بەرد و دار دروست کرد بوو لە شیوی مەلا بابەکر، چونکە ئەو ناوچەیە بەرد و داری زۆر بوو. لەوێ ٣ برا و ئامۆزایەکی لێبوو، یەکێکیان ناوی ئەحمەد ئیسماعیل بوو زۆر کاسب بوو، مەلا محەمەد مانگایەکی بۆ کڕیبوو. کەریم گوڵە و حەمە گوڵە ئاژەڵدارییان دەکرد و کشتوکاڵیان نەدەکرد، رەشید گوڵە تەنها کاری کشتوکاڵی دەکرد، بەڵام باشی لێنەدەزانی، چونکە لە منداڵییەوە ئاژەڵداری کردبوو تازە فێری کشتوکاڵ ببوو.

لە ساڵی ١٩٦٣ کۆبوونەوەمان لە ماڵی نوری حاجی گووروون کرد کە ماڵیان لە پشت سەدەکەوە بوو، لەگەڵ حەسەن رەشیدی ئامۆزام و حەمەئەمین کە ناسرا بوو بە زەعیم کە چاوێکی کوێر بوو پورزای حەمە سۆیلە بوو لە کەرکوکەوە هەڵهاتبوو لەبەر ئەوەی مقاوەمە شەعبی بوو، پێیانووتین: دەبێت بچن بۆ بارەگای ئیقلیمی حیزب لە کلکە سماق، کە بارەگاکەیان لەسەر کانی و ئاوێك بوو پێیاندەگووت پاڵەوان، بۆ ئەوەی پەیوەندی دروست ببێت لە نێوان محەلی سلێمانی و ئیقلیم، دوای کۆبوونەوەکە هاتینە خوارەوە جادە چۆڵ و هۆڵ بوو کەس بە دیارەوە نەبوو، نازانم چی روویدا بوو ئێمە لە سلێمانییەوە بەپێ چووینەوە بۆ سووسە کۆن، ئەوکاتە فاتیح رەسوول لێپرسراوی محەلی سلێمانی بوو، دواتر زانیمان کە ئینقلابی ١٩٦٣ کراوە بەسەر عەبدولکەریم قاسمدا، وەزعی حیزب زۆر خراپ بوو، لە لایەکەوە بەعس و لە لایەکیترەوە پارتی دژی بوو، بارەگای ئیقلیمی کوردستان هاتبوو بۆ کلکە سماق، فاتیح رەسووڵ هات بۆ سووسە کۆن و شەو لە باوەمەندان مانەوە لەبەر دووری لە دوژمنەوە، بۆ بەیانی رەوانەمان کرد بۆ کلکە سماق، سووسە کۆن و باوەمەندان ببوو بە بازنەی پەیوەندی لە نێوان سلێمانی و کلکە سماقدا، هەر کەسێك حیزب بیویستایە ببێت بە پێشمەرگە دەیانناردن بۆ لای ئێمە و ئێمەش رەوانەی کلکە سماقمان دەکرد. لە ناوچەی قەرەداغ و وارماوەوە برادەران دەهاتن، جارێك برادەرێکیان دامێ وتیان: لە کلکە سماقەوە بیبە بۆ سیتەك بۆ لای شێخ لەتیف، ئەم برادەرە زۆر قەڵەو بوو نەیدەتوانی بڕوات، هەر دەڕۆیشت و دادەنیشت، بەیانییەکەی هێنام بۆ کلکەسماق لە پاڵەوانەوە کە کاتژمێرێك رێ بوو، بەڵام بۆ ئێوارە

گەیشتین! پارتی بارەگایەکی لە کلکە سماق هەبوو پێشمەرگەکانی هەمووی بنەماڵەی حەمەی ئەوڕەحمان بوون، بانگیان کردم وتیان: ئەم پیاوە دەبەیت بۆ کوێ؟ منیش وتم: دەیبەم بۆ لای شێخ لەتیف. وتیان: ئینجا چۆن دەگاتە ئەوێ؟! وتم: وڵاغی بۆ دەگرم. وتیان: بە خوا لە کوێ هاتووە دەبێت بچێتەوە بۆ ئەوێ! ئەویان گرت و بە منیان وت: بڕۆ! زۆرم پێخۆش بوو، چونکە بە ٣ مانگ نەمدەگەیاندە سیتەك، منیش خواحافیزیم لێیانکرد و کابرا عەرەب بوو هاواری کرد رەفیق وێن!؟ منیش عەرەبیم نەدەزانی ئاوڕم دایەوە کاکە حەمەی پورزام وتی: تۆ بڕۆ ئێمە رەوانەی دەکەینەوە، نەجاتم بوو.

لە مانگی ٢ی ١٩٦٣ لە ئیقلیم بووم بە پێشمەرگە لە ئاوەگرد، ئەو زستانە زۆر سەخت بوو بۆ من، چونکە بەفرێکی زۆر باریبوو، لەوێ کەریم ئەحمەد و عومەر عەلی شێخ و عەلی مەولود و کمال جەباری و عەبدوڵڵا رەمەزانم ناسی، لەوێ گۆشت بزنی چاکی لێبوو کە پێشتر مێگەلی شێخ رەشیدی لۆلانیان هێنابوو لەسەر جاشێتی، بۆ بەهاری ١٩٦٤ رەوانەی دەرگەڵەیان کردین کە نزیکەی ١٠٠ کەس دەبووین، لەوێ منیان نارد بۆ بارەگای کەمال عەرەب کە بە رەئیس کەمال ناسرابوو لە ماولیان، چونکە من گەنجێکی تازە بووم هەر گواستنەوەیەك هەبووایە منیان دەنارد، لەوێشەوە گواستمیانەوە بۆ لای مەفرەزەیەك لە هەوارەکۆن لای ماڵەکانی جوندیان نزیکی رەواندز تا بەهاری ١٩٦٤ لەوێ بووم، دواتر داوای پشووم کرد، ئەوکاتە لەگەڵ میری دیالۆگ هەبوو کە گەڕامەوە لە وەرتێ و دۆڵی پلێنگانەوە شەو گەیشتمە رانیە، لەوێ ماڵی حەمە مینی حەمە زلەم دۆزییەوە کە پێشتر لە ساڵی ١٩٦١ پێکەوە لە سلێمانی بەندکرابووین، بۆ بەیانی دوای نانخواردن هاتمە بازاری رانیە دکتۆر

فارسم بینی، کە لێپرسراوی قەزای رانیە بوو، کەمێك پارەی دامێ و سواری سەیارەی کردم تا پردەکەی هیزۆپ، پێیوتم: بە تەراکتۆر بڕۆ تا داری قەمتەران و لەوێوە بچۆ بۆ بناری کۆسرەت. لەوێوە بەپێ ڕۆیشتم بە بناری کۆسرەتدا شەو گەیشتمە مێووژە لە ماڵێك مامەوە، کە بانگی بەیانی دا ژنی خاوەن ماڵەکە بە خاوەن ماڵەکەی وت: نوێژەکەت بکە. وتی: وازم لێبێنە شەیتان پێم خەنی بووە! ؟ من سەرم سوورما بوو نەمدەزانی مانای چییە! پیاوەکە چووە دەرەوە منیش هەڵستام وتم: ئەوە مانای چییە شەیتان خەنی بووە؟ وتی: خەوی بە شەیتانەوە دیوە! دوایی پیاوەکە هاتەوە وتی: خۆم پاککردەوە. وتم: لە کوێ؟ وتی: لە حەوزەکە. ئینجا ژنەکەی کەوتە تەعلیق لێدانی. بۆ بەیانی ڕۆیشتم بۆ ئێوارە گەیشتمە کلکەسماق کە ماڵی خوشکم لەوێ بوو بە ناوی ئایشە، لەوێ پێیانوتم: باوکم خەریکە شێت دەبێت هەموو ڕۆژێك دەچێتەسەر حیزب و وایدەزانی کوژراوم، چونکە ساڵێك بوو هەواڵم نەبوو. ئەوکاتەی ڕەوانەی دەرگەڵەیان کردم باوکم زۆری خۆشدەویستم دەچووەسەر حیزب لە سلێمانی پێیدەووتن: کوڕەکەم چی لێهاتووە بۆچی پێمناڵێن! ؟ لەوکاتەدا هاتوچۆ کەم بوو کەس نەبوو هەواڵم بۆ بنێرێت یان بۆ بێنێت تا مۆڵەتم وەرگرت لە کلکەسماقەوە هاتمەوە بۆ باوەمەندان چاوم بە باوکم کەوت، دەستی بە گریان کرد، چونکە ساڵێك بوو منی نەدیبوو، زۆر خۆشحاڵ بوو، دوایی وتی: چاوم بۆ گێڕاوی لە یاڵی سووسەکۆنەوە منی دیبوو وتبووی: ئەوە حەمەکەریمە! کە مۆڵەتم تەواو بوو لە ڕێگەی حەمە سۆیلەوە پەیوەندیم بە حیزبەوە کرد، حیزب پێیباش نەچمەوە بۆ دەرگەڵە و لە ناوچەی خۆمان ئیشی حیزبی بکەم، هەواڵیان نارد بۆ ئیقلیم کە من لە سلێمانی لە محەلی دەمێنمەوە.

کە چوومەوە ئەحمەدی برام لە سەربازی تەواو ببوو، پێکەوە دەستمان کرد بە کاسبی و باوکم دەیویست ژن بێنێتەوە، دەستمانکرد بە توتن و مەرەزە و چنار بە شەویش کارماندەکرد، دوای کۆکردنەوەی بەرهەم باوکم پارەکەی هەمووی لێمانسەند و بۆ ئێمەی خەرج نەدەکرد، کۆیدەکردەوە بۆ ژنهێنان، لەوکاتەدا باوکم زەوی لە سلێمانی کڕی لەگەڵ حەسەنی قادری ئامۆزام مەتری بە ٣ پەنجایی، کردی بە خانوو زۆرم پێخۆش بوو، چونکە ماڵی پورزایەکم لەوێ بوو بە ناوی محەمەد مەولود کە زۆرم خۆشدەویست.

ساڵی ١٩٦٣ کە قەدەغەی هاتوچۆ بوو کەس لە سلێمانی نەیدەتوانی کرێکاری بکات، خەڵك لەبەر هەژاری و بێ ئیشی روویانکردە گوندەکان، ماڵی ئەحمەد سەعید سەلە و حەیدەری زاوای روویانکردە باوەمەندان بەهۆی ئەوەی چەند ماڵێکی کورد پێش ئێمە لەوێ بوون وەکو رەشید گوڵە و ئەحمەد ئیسماعیل کشتوکاڵیان دەکرد و ئاژەڵدار بوون و کەریم گوڵە و حەمە گوڵە تەنها ئاژەڵدار بوون، کاك ئەحمەد و حەیدەر ئامۆزایان بوون، گۆمەیی بوون. ماڵێکی تر لە پشتمانەوە بوو ماڵی عەزیز لەچك بوو قەرەوەیسی بوون، عەلی سۆیلە کە پێشمەرگە بوو، هات ژوورێکی دروستکرد لای ئێمە، چونکە شوێنێکی لە بار بوو بۆ خۆحەشاردان و بۆ پشوو بەکاریدەهێنا کە مۆڵەتی وەردەگرت. هەر کاتێك عەلی سۆیلە دەهاتەوە دارای کوڕی دەهات بۆ لای ئێمە، زۆرمان خۆشدەویست تا ئێستا ئەو خۆشەویستییە ماوە.

لە پاییزی ١٩٦٣ حەرەس قەومی هات بۆ ناوچەکە، لە کەرکوکەوە دەستیان بە تالانکرنی ماڵ کرد، هاتنە تالۆاوی خوار قەرەچەتان لای زەوییە درێژی ئێمە و پەلاماری گوندەکانیان دا، بەڵام خەڵکی ئەو ناوە

كەوتنە شەڕكردن لەگەڵیان بۆ ئەوەی تالآنیان نەكەن، ئەو رۆژە لە باوەمەندان بووم هەواڵ هات وتیان: حەرەس قەومی هاتووە بۆ سووسێ و یاران بەگی خەڵكی گوندەكانیان چۆڵ كردبوو هاتبوونە چەمەكە، ئێمەش خۆمان ئامادەكرد لە گردێك بە ناوی گردی بەردە زەرد بۆ ئەوەی ئەگەر بپەڕنەوە لێیان بدەین، بەڵام نەهاتن، چونكە نەیانتوانی و ئێوارەی بەسەردا هات. ئەوانەی لەگەڵم بوون بۆ رووبەڕوو بوونەوە صالح حاجی قادر و مامە رەشە بوون و لە پشت ئێمەوە كۆمەڵێك خەڵكی یاران بەگی دامەزرابوون بۆ شەڕ، وەكو حەمەی مەحمود سوار و چەند كەسێكی تر، مامە رەشە چەكێكی پێبوو پێیاندەووت: صالآتی رووسی و حەمەصالح دەمانچەی پێبوو، منیش ساچمەزەنم پێبوو. حەرەس قەومییەكان زۆربەیان چەكیان پێنەبوو لەبەر ئەوەی رژێم كۆمەڵێكی خێڵی عەرەبی هێنابوو بۆ تالآنی كوردستان پێیانووتبوون: سەریان بۆ ئێمە و ماڵیان بۆ ئێوە ! لەوكاتەدا زەعیم صدیق لیواكەی لە یالّی موغاغ بوو، بانگهێشتی خەڵكی ناوچەكەی كردبوو بچن بۆ لای، كە چووبوون بۆ لای پێیانوتبوو: دەبێت چەكەكانتان تەسلیم بكەن و ماڵەكانتان بهێننە نزیكی جادە بۆ ئەوەی ئەنفالیان بكەن، هەموو گوندەكان چەكەكانیان برد بوو كە بریتی بوون لە كۆمەڵێك چەكی خراپ، ویستیان بچن بۆ كۆتەڵ لە یالّی كۆتەڵ حەرەس قەومییەكی زۆر كوژرا بوو نەیانتوانی بەرەو سورداش و دوكان بڕۆن، چونكە پێشمەرگە چەمی رەزانی چۆڵ كردبوو هاتبوونە هۆمەر قەوم و شەدەڵە، خۆشبەختانە ئەو شەوە ئینقیلاب بەسەر بەعسییەكاندا كرا لە لایەن عەبدولسەلام عارفەوە، بۆ بەیانی زەعیم صدیق یالّی موغاغی چۆڵ كرد و گەڕایەوە. گوندەكان هەموویان چوونەوەسەر ماڵی خۆیان و پێشمەرگە هاتەوە ناوچەكە و

چەمی رەزان، ئەو ساڵە دەغڵ و دانی خەڵك هەمووی سووتا و لە بازگەکان نەیاندەهێشت هیچ شتێك بێتە دەرەوە، دەبووایە بچین بۆ ماوەت بۆ هێنانی شتومەك، لە سلێمانییەوە هیچ شتێك دەرنەدەچوو.

لە زستانی ١٩٦٣ حەمە سۆیلە و یاسینی حاجی حەسەن خوالێیان خۆش بێت سەردانیان کردین لە باوەمەندان، پیاوێکی پۆشناخیان لەگەڵ بوو ناوی فاتیح رەسووڵ بوو، حەمە سۆیلە پێیوتم: ئەمە ئەندامی سەرکردایەتی حیزبی شیوعییە و نابێت باوکت بیزانێت، دەبێت ئاگامان لێ بێت تا بە فەرمانی حیزب رەوانەی کەلکە سماقی دەکەین، ئەم برادەرە پێیاندەووت: ئەبو ئاسۆس، چەند رۆژێك لە ماڵی ئێمە بوو تا رۆژێك حەمە سۆیلە هات وتی: ئەم پیاوە زۆر لێتان رازییە کە خزمەتی باشتان کردووە، دواتر رەوانەی کلکە سماق کرا، پاش ماوەیەك سەردانی کلکە سماقم کرد بینیم ئەو پیاوە لەوێ بوو، زۆر رێزی گرتم، برادەران وتیان: چۆن دەیناسی؟ وتی: لە ماڵی ئەوان زۆر خزمەت کراوم، پیاو دەبێت بە سیفەت بێت من هەرگیز ئەو خزمەتەم بیرناچێت کە لە ماڵی ئەوان کراوم.

لە ساڵی ١٩٦٣ ماڵی ئەحمەدی سەعید و محەمەدی برای خوالێیان خۆش بێت هاتبووە شیلەخان، لە ماڵێك بوون باری گوزەرانیان باش نەبوو، رۆژێك من و حەسەنی ئامۆزام چووین بۆ سەردانیان لە ژوورێکدا بوون بە تەیمان تەنرابوو، لە تەویلەی وڵاغەکان جیاکرابووەوە، کاتێك ئێمە قسەمان دەکرد گوێدرێژەکە سەری بە تەیمانەکەدا شۆڕدەکردەوە بۆ لای ئێمە، هەرچەندە دەنگمان لێدەکرد وازینەدەهێنا، کاك ئەحمەد تەنها کورێکیان هەبوو ناوی یاسین بوو زۆر منداڵێکی قسەخۆش بوو، کچێکی برازای لە لابوو ناوی نەسرین بوو زوو زوو بە

حەسەنی دەووت: تۆ حەسەن زیرەکی هاتووی بۆ لامان، دواتر گەڕامەوە و باوکم تێگەیاند کە باری ژیانیان باش نییە، باوکم ناردی بە شوێن محەمەددا چووین دار و ژاژمان بۆ بردن و لەگەڵ ئەحمەدی برام خانوویەکی باشمان بۆ دروستکردن.

لە ساڵی ١٩٦٤ ماڵمان لە باوەمەندانەوە چوو بۆ جۆگەی مەلا سەوغە و ئەو چۆگەیە بە دەست ئێمەوە بوو، گسکی زۆر بوو، قەرەچەتانییەکان دەهاتن بۆ گسك ئێمەش چاومان پێیاندەکەوت زۆر خۆشحاڵ دەبووین، زۆری خزمانی خۆمان بوون دەچووین بۆ لایان بۆ هەواڵپرسین، زۆریان دەهاتن بۆ ماڵەوە ئەوانیش بە بینینی ئێمە خۆشحاڵ بوون بە تایبەتی منداڵەکانی کەریمی مام عومەر. قەرەچەتان لەبەر ئەوەی بێ ئاو بوو تەماتەی نەبوو لای ئێمە زۆر بوو، لەگەڵ گسکەکە تەماتەشیان دەبردەوە.

ئەو ماڵانەی لە پشتی ئێمە بوون بۆ زستان ماڵیان خۆشکرد بوو، هەر کاتێك چاویان بە ئەحمەدی برام و باوکم بکەوتایە پێیاندەووتن: شەو سەرێکمان لێبدەن، شەوێك من و باوکم و ئەحمەدی برام چووین بۆ میوانی مام عەزیز، کوڕێکی گەورەی هەبوو ناوی محمەد بوو نان و ڕۆنی کوردییان بۆ هێناین لەجیاتی شەوچەرە، بەڵام نانەکە زۆر گەرم بوو لەگەڵئەوەشدا زۆر بەلەزەت بوو، لە پڕ بوو بە هەرا و هەڵستاین ئێمە نەمانزانی چی ڕوویداوە، دواتر مام عەزیز وتی: گورگ چۆتەناو دەوارەکەوە لە دیوی دەرەوە بە چنگ دەوارەکەی دڕیبوو پەلاماری مەرێکی داوە و ورگی مەڕەکەی دڕیوە، ئێستا سەری دەبڕم نسیبی ئێوەیە. دەستمانکرد بە گۆشت خواردن و گۆشتیشمان بردەوە بۆ ماڵەوە.

کەماڵمان لە باوەمەندان بوو وڵاخێکی زۆرمان هەبوو، وەکو مانگا و هێستر، هەمیشە ماست و دۆمان هەبوو، ئەو ماڵانەی نەیان بوو دەهاتن بۆ لای ئێمە بۆ ماست و دۆ، کۆمەڵێك ماڵی گۆمەیی لێبوو ئەوانیش مەڕدار بوون، کۆمەڵێك ماڵ لەبەر هەژاری لە سلێمانییەوە هاتبوون بۆ توتنکردن، لەوانە مام حەیدەر لەوێ بوو ئاژەڵی نەبوو، باوکم پێیووت: مادام ماست و دۆ دەخۆی دەبێت نۆبە گاگەلیشمان لەگەڵدا بکەیت، لە کاتی نۆبە گاگەلدا خەڵکی شیلەخان و گولیچە بینیبوویان پێیانووتبوو: مام هەیەر پیرۆزە دەڵێی مانگات کڕیوە؟! وتبووی: نەوەڵا حاجی عەلی نۆبە گاگەلم پێدەکات! وتبوویان: بۆچی؟ وتبووی: کاك عەلی لە بری ماست و دۆ نۆبەم پێدەکات، دەڵێت دەبێت ژنەکەشت مەشکەمان لەگەڵ بژەنێت! ئیتر ئەوە ببوو بە باس و خواز وتبوویان: بە خوا حاجی عەلی ئیشی باشی پێدەکات!؟

لە باوەمەندان مەلا محەمەد یان مەلا عەلی کوڕی هاوینان دەهاتن بۆ لامان بە تایبەتی لە کاتی شریت لێدانی توتندا، صندوقی دەهانی بۆ فەردە داگرتن و گوێنی و شریتی دەهانی، ڕۆژێك دز هاتبوو بۆ گوێنی دزین کە بینیمن ڕایانکرد و منیش تەقەم لێکردن، مەلا محەمەد زۆر ترسا هاواری کرد کاکە دزەکان تەقە مەکەن کاك حەمەکەریم تەقە ناکات! کە خۆی لە چۆگا کۆنێکدا مەڵاس دابوو، کە تەقە دەهات بە ڕووی ئێمەدا ئەو خۆی دادەنواند، دیاربوو دزەکان بۆ گوێنی هاتبوون من لێیان بە خەبەر هاتم نەمهێشت دزی بکەن، ئیتر مەلا محەمەد پێیوتم: شەوان تۆ لێرە بە با دز نەیەت فەردەکان بەرێت، منیش پێمووت: ئەی تۆ لێرە نیت!!؟

هەر ئەو ساڵە بەیانییەك زوو لە خەو هەڵستاین بوو بە هەرا، منداڵەکانی ئێمە وتیان: ئەو جەڵەبی گورگە لە سەربانی ئێمەن، ٣ ماڵ بووین دوای گەلە گورگەکە کەوتین تا بناری شاخەکە، مام حەیدەر بە بێ خاوسی هاتبوو، لەوکاتەدا ماڵی کەریمی ئەحمەد جبە هاتبوون بۆ باوەمەندان، کەریم و ئەحمەدی برام گاڵتەیان بە مام حەیدەر دەکرد پێیاندەووت: بە پێ خاوسی گورگ ناگیرێت، تا سێ ڕۆژ ئەم بەزمەیان پێدەکرد.

لە بەهاری ١٩٦٤ شایی لە گرژە بوو ئەو گوندانەی دەوروبەر هەمووی بانگێشتکرا بوون، حاجی حەسەن حەمەمین کە سەرۆکی کۆمەیی بوو کچی دەروێشی کوێخا سەعیدی بۆ حەمەمینی کوڕی هێنابوو، خوالێیان خۆش بێت، ئەو شاییە زۆر قەڵەباڵغ بوو، عارف قەرەچەتانی لێبوو، مام جەلال هات بە هێزێکەوە نانی نیوەڕۆیان خوارد و وتارێکی پێشکەش کرد کە بۆنی جیابوونەوە و دووبەرەکی لێدەهات، عارف قەرەچەتانی پێیدەووتن: ئەمە بەع بەعەکانن. ئیسماعیل قەڵەو کە پێشمەرگە بوو دەستی کرد بە گۆرانی وتن و ئارەق بە دەموچاویدا دەهاتەخوارەوە و وازینەدەهێنا لە گۆرانی وتن و چەکەکەیان لێ دزیبوو بیری نەمابوو کە چەکدارە! چووبووە خزمەتی مام جەلال کە زانی چەکەکەی پێنەماوە دەستی بە گریان کرد، مام جەلال بە سەرۆك خێڵەکانی وت: ئەوەی چەکەکەی شاردۆتەوە لە خۆتانە بچن بیدەنەوە، ئەوەندەی پێنەچوو چەکەکەیان بۆ هێنایەوە کەس نەیزانی کێ بردوویەتی، دوایی دەستی کردەوە بە گۆرانی وتن! ئەم وتارەی مام جەلال سەرەتای دووبەرەگی بوو لەگەڵ باڵی بنەماڵەی بارزانی ئەمانیش باڵی مەکتەبی سیاسی بوون.

لە هاوینی ساڵی ١٩٦٤ کادرێکی حیزبی شیوعی لەماڵمان بوو لە باوەمەندان، سەر بە قیادەی مەرکەزی بوو، لای ئێمە ناوی مەلا رەئوف بوو، بە بنەچە ئێرانی بوو، کورێکی زۆر پاك بوو زۆر خۆشماندەویست ئیشمان پێ نەدەکرد، رۆژێکی پاییز چوو بۆ پشتی مەلا بەکر کە کۆمەڵە شەخسێکی لێبوو لەگەڵ کانی و ئاو، چوو بوو بۆ راوە کەو، سەرکانی و ئاوەکەی بەر بڵاوبوو، کڵاو و جامانە و چۆخەکەی بە جیابەجیا کردبوو بە داهۆڵ بۆ ئەوەی کەوەکان بێنە ئەو شوێنەی کە ئەوی لێیە و ئەویش راویان بکات، بەڵام مەلا رەئوف خەوی لێکەوتبوو، کاتێك چاوی کردبووەوە نە کڵاو و نە جامانە و نە چۆخەی لێ نەمابوو! کە هاتەوە بۆ ماڵەوە باوکم لە دوورەوە کەوتە گاڵتەپێکردنی وتی: ئادەی ئەو کەوانەی لێ وەربگرن ئەوە بۆ واتلێهاتووە؟! ئەویش ڕووداوەکەی گێڕایەوە، باوکم پێیووت: ئەگەر هەموو کەس راوچی وریا بووایە کەو لەمناوە نەدەما! مەلا رەئوف تۆ هەروا بە ئاسانی نابیت بە راوچی، بەس نییە ساچمەزەنەکەیان نەبردووە! دوای ئەوەی بووم بە پێشمەرگە لە قەرەداغ ماڵی لە گوندی بەڵخە بوو، میوانداری کردم وتی: من ئەو مەلا رەئوفەم لە ماڵی ئێوە باوکت گاڵتەی پێدەکردم. وتی: ئێستا ژنمهێناوە خوشکی فەریق دۆڵانییە، زۆر خزمەتیان کردم و چەند رۆژێك لای مامەوە، عەلە رەش خوالێیخۆش بێت لەوکاتەدا سەردانی کرد کە لەوێ بووم، پیاوێکی تێکۆشەر بوو.

لە هاوینی ١٩٦٤ نامەی حیزب هاتبوو بۆ ئیقلیم لە پاڵەوان، ئەو نامەیە لە محەلییەوە هاتبوو لە سلێمانییەوە، من و مستەفای ئامۆزام بردمان بۆ پاڵەوان، چونکە کاك مستەفا تەتەری رەسمی بوو، بەڵام من وەکو رێکخستن چووم، لە پشتی کلێسە پیاوێکمان دی گێرەی دەکرد،

چووین بۆ لای بۆ ئاوخواردنەوە وتی: دەچن بۆ کوێ؟ وتمان: بۆ کلکەسماق دەچین. وتی: بۆ؟ وتمان: ماڵی حەمەی ئەوڕەحمانی لێیە خزمی خۆمانە. وتی: وەرەقەتان پێیە؟! وتمان: بەڵێ. دیار بوو خوێندەواری نەبوو منیش وەرەقەیەکی کۆنم نیشاندا وتی: باشە. وتم: ئەگەر وەرەقەمان پێنەبێ چی دەکەیت؟ وتی: هەواڵ دەدەم. وتمان: تۆ تەنیایت چۆن هەواڵ دەدەیت؟! وتی: بە ناودێ هەواڵ دەدەم. وتمان: دەبچۆ هەواڵ بدە. چوو بۆ هەواڵ ناردن تا چووەوە ناودێ ئێمە گەیشتینە پاڵەوان! شەو لە بارەگای ئیقلیمماینەوە من هاتمەوە و کاك مستەفا مایەوە بۆ ئەوەی وەڵامی نامەکە بیگەیەنێتە سلێمانی.

لە زستانی ١٩٦٤ ئەحمەدی برام چوو بۆ ماوەت بۆ نەوت و شەکر و چا، کە هی ئێرانی لێبوو، ئێمە دوو هێسترمان هەبوو خەڵك نەیبوو کە هاتەوە جارێك منی لەگەڵ خۆی برد بۆ مەملەحە بۆ هێنانی خوێ، کە چووین دوو بارمان هێنا بەشی خۆمان گل دایەوە و ئەوەی مایەوە بە ماڵە کوردەکانمان فرۆشت، چونکە ئاژەڵداربوون زۆر خوێیان پێویست بوو، هەندێك پێداویستی ماڵمان لەگەڵ خوێیەکە هێنایەوە کە لەوێ دەستدەکەوت. لەگەڵ ئەحمەدی برام بە ساچمەزەن و تەڵە راوی کەروێشك و پۆڕمان دەکرد، پەکمان لە گۆشت نەدەکەوت. شێخ حەسەنی عەوەڵان هات بۆ لامان وتی: دەچم بۆ سلێمانی با ئەم ئەسپەتان لابێت. وتمان: باشە. لە چەم نەپەڕییەوە ئەسپەکەمان خستەژێر جەلە بۆ گێرە. هاتەوە وتی: بە خوا ئەسپەکەم نەخۆشکەوتووە! نەیدەزانی من بۆ گێرە بەکارمهێناوە!؟ ئارەق بە هەموو گیانی ئەسپەکەدا دەهاتە خوارەوە.

من و ئەحمەدی برام فەردە تووتن یان چەڵتووکمان بە بار لە چەمی مەلا سەوغە دەپەڕانەوە بۆ سووسە کۆن، لەوێ سەیارە باری دەکرد بۆ سلێمانی، لەو سەیارانە سەیارەی قادر حاجی کەریم و عەبدوڵڵا قووتە هەبوو، پێش چەند ڕۆژێك پیاوێك گوێنی مەلا محەمەدی دزی بوو پێیزانی بوو کێیە، لەبەر هەژاری خۆی قسەی نەدەکرد، کە بارمان بارکرد ئەو پیاوە هات بە لاماندا ئەحمەدی برام بانگی کرد بۆ یارمەتی دانمان لە بارکردن، فەردە چەڵتووکمان بارکرد بۆ سەر هێسترەکە وتمان: بیگرە فلأن تا ئێمە فەردەیەکی تر بەرز دەکەینەوە، بەڵام بە باشی نەیگرت فەردەکەی خست، ئەحمەدی برام سووڕایەوە چوار شەقی تێهەڵدا وتی: بۆ باش نایگری، کاکە مەلا لە داخی گوێنیەکانی لە دڵیا مابوو بە ئەحمەدی برامی وت: ئادەی کاك ئەحمەد دوو سوعبەتی وای لەگەڵدا بکە ئەوە سوبعەتە شارینەیە زۆری پێخۆش لە داخی گوێنیەکانی!؟

لە زستانی ١٩٦٥ لە باوەمەندان بووین ئێوارەیەك خەریك بوو تاریك دەبوو مام ڕەشید هات بۆ لام، چونکە هەر من خوێندەواریم هەبوو وتی: مانگاکەمان نەهاتۆتەوە نازانم چی بکەم، دەبێت دەمی گورگم بۆ ببەستیت بۆ ئەوەی مانگاکەم نەخوات! وتم: باشە، ئایەتێکم لەسەر چەقۆیەك خوێند و وتم: بیخەرە ناو تەشتێ نانەوە بۆ ئەوەی مانگاکەت سەلامەت بێت! بۆ بەیانی هات وتی: مانگاکەم خوراوە!؟ وتم چەقۆکەت لە شوێنی خراپ داناوە! وتی: لای سەرم دامناوە! وتم: دەبووایە لە ناو تەشتێك نان داتنایە، بۆیە گورگ خواردوویەتی!؟ لەبەر ئەوەی من خوێندەواریم هەبوو پێیاندەگوتم: فەقێ کەریم. هەر کاتێك ئاژەڵێك نەهاتایەتەوە دەبووایە دەمی گورگ ببەسترێت، چار نەبوو ئیتر بۆ

بەیانی ئاژەڵەکە یان دەدۆزرایەوە یان گورگ دەیخوارد، ئەگەر گورگ خواردی دەمووت: ئەمری خوایە دەبێت گورگ بیخوات.

لە پاییزی ١٩٦٥ چەقەڵێك بە مریشك و قەل و قازی گوندی قایکەند فێر ببوو، زۆربەیانی خواردبوو، چەقەڵەکە خۆی دەکات بە ماڵێکدا دەرگای لیّ دادەخەن، پیاوێکیان هەبوو ناوی حاجی مەجید بوو خوالێیخۆش بێت ناسرابوو بە مەجید قادر، دەچن بە شوێنیدا بۆ ئەوەی چی لە چەقەڵەکە بکەن، ئەویش هەموو گەنج و پیاوی ئاوایی کۆدەکاتەوە و پێیاندەڵێت: هەموو سەگ و توولەی ئاوایی کۆبکەنەوە بۆ راوی چەقەڵەکە، پاش کۆکردنەوەی هەموو سەگ و توولەکان، دەرگا لە چەقەڵەکە دەکەنەوە و هەموو سەگ و توولەی تێبەر دەدەن، دوای دەکەون و هیچیان زەوتی چەقەڵەکە ناکەن، گەماڵێکی گەورە دوو سەری لێدەدات و بە لووتیدا دەنووسێت و گەماڵەکە دەتووڕێنێت و بەرەو ماڵی خاوەنەکەی رادەکات، دوایی سەگەکان تەنی پێهەڵدەچنن و دێتە بەردەم حاجی مەجید وەکو داوای لێبووردنی لێبکات وابوو! دواتر حاجی مەجید لێی بوورابوو وتبووی: وازی لێبێنن با بڕوات کەس هیچی لێنەکات، بە چەقەڵەکەی وتبوو: بڕۆ لەسەر بڕیاری مەجید قادر ئەوا عافووم کردی، چەقەڵەکە دووجار ئاوڕ دەداتەوە وەکو سوپاسی مەجید قادر بکات وابوو.

لە پاییزی ١٩٦٥ عەزیزی فەقێ حەسەن لەسەر خەرمانی مەرەزە بوو، ئێوارە کاتی نوێژ بوو چەقەڵێکی هار پەلاماری دابوو باش بوو پەلاماری دەم و چاوی نەدابوو، پەلاماری قۆڵی دابوو ئێسقانی قۆڵی شکاندبوو! بەڵام لەبەر ئەوەی پیاوێکی ئازا بوو خۆی تێکنەدابوو بە دەستەکەی تری خەنجەرەکەی قەدی دەرهێنابوو ورگی چەقەڵەکەی دڕی

بوو، ئەم رووداوە بڵاوبووبووەوە، بەڵام زۆر کەس باوەڕی نەبوو کە چەقەڵ پەلاماری پیاو بدات.

لە زستانی ١٩٦٥ بارێك توتنی وردەمان هەبوو ئەحمەدی برام و مەلیحی براژنم چوون بۆ سلێمانی بۆ فرۆشتنی توتنەکە، منیش لەگەڵیان چووم. لە هێستر بارمان کرد، ئەوکاتە باران زۆر بوو ئاوی چەمی چەرمەگا زۆر ببوو، ئاوی ئاشەکەی عەلی وەیس دامێنەکەی خوڕ بوو، بەڵام ئاستی ئاشەکە بواری هێستره چەپە بوو، ویستمان هێسترەکە بپەڕێنینەوە کە چووە ناو ئاوەکە یەکسەر خەوت، من لای خوڕاوەکە بووم و ئەحمەدی برام لای سەروو بوو، هێسترەکە وردە وردە ئاو بردی و داپەڕاند، منیش لەگەڵ هێسترەکە ئاو بردمی، بەڵام دەستم لە هێسترەکە بەر نەدا و دەستم لە ملی توند کرد بۆ ئەوەی بەهۆی هێسترەکەوە رزگارم بێت، ماوەیەکی زۆر رۆیشتین بە دەم ئاوەوە تا گەیشتینە بنەوانی جۆگەی سەیدان، لەوێ ئاو لایدا و من و هێسترەکە رزگارمان بوو، بەڵام بارە توتنەکە ئاو بردی، ئەحمەدی برام لە وشکایی رایدەکرد بە شوێنماندا بۆ دەرباز کردنمان.

لە زستانی ١٩٦٥ لە باوەمەندان بووین کۆمەڵێك چەکدار هاتن، شەو گەمارۆی ماڵی ئێمەیان دا و من و عومەری برام و حەلاوی خوشکم و باوکم لە ژوورێکدا بووین، نەمان وێرا بچینە دەرەوە بۆ ئەوەی نەمانکوژن، خوالێخۆش بوو حەلاوی خوشکم لە پڕ دەرگاکەی کردەوە و چەکدارێك لەبەر دەرگابوو چەکی کرد و من و باوکم کردمان بە هەرا و دەستمان کرد بە تەقە بە چەکەکەی ئەو چەکدارە، چونکە لەوکاتەدا چەکمان لە ماڵەوە نەبوو، چەکدارەکان دوور کەوتنەوە و شەهاب کەرکوکی تازە ببوو بە جەلالی هاواری کرد وتی: تەقە مەکەن ئێمەین

نەهاتووین بۆ ئێوە، هاتووین عەلی سۆیلە بگرین كە پێشمەرگەی پارتی بوو، ئێمەش وازمان لە تەقەكردن هێنا و ئەوان هاتن زانیمان كە پێشمەرگەی باڵی مەكتەبی سیاسین، لێپرسراوەكە هەواڵی عەلی سۆیلەی پرسی و چەكدارە چەككراوەكە هات تووڕە بوو لێمان خەریك بوو لێمان بدات، بەڵام لێپرسراوەكە لێی تووڕە بوو وتی: تۆ چەككراوی ئێستا من هاتووم خۆت ئازا دەكەیت! ؟ دواتر من و باوكمیان برد بۆ سووسێ بزانن عەلی سۆیلە لەوێیە یان نا، بەڵام عەلی سۆیلە لەوێ نەبوو، منیان برد بۆ گرژە و باوكم هات لەگەڵم و بەیانی چوو بۆ لای مەجید رۆستەم ئەویش هات بوو بە كەفیلم و منی ئازاد كرد، خوا لێیانخۆش بێت.

لە هاوینی ١٩٦٥ لە باوەمەندان لەگەڵ ئەحمەدی برام چووین بۆ گێرەكردنی خەرمان بە جەنجەر، ئێوارە كە چووینەوە بۆ ماڵەوە بۆ نانخواردن شەو مانگاشەو بوو وتمان: با بچینەوە بۆ گێرە كە چووینەوە، دوو هێسترەكە ببوو بە سێ هێستر، كە چووینە پێشەوە مالۆسە بەرازێك لەگەڵ هێسترەكان دەمی لە گەنمی خەرمانەكە نابوو دەیخوارد، من دەمانچەیەكم پێبوو ئەحمەدی برام ساچمەزەنێكی پێبوو، تەقەمان لێكرد زووڕانی و بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە تا گیانی دەرچوو.

لە هاوینی ١٩٦٥ لە باوەمەندان مار زۆر بوو، چونكە وشك و دێم بوو، ئێمەش هەر خەریكی مار كوشتن بووین، رۆژێك رەش مارێك هۆگرم ببوو، كاتێك دەچووم بۆ كشتوكاڵ ئاودان لە شیوی بابەكر مارەكە دەهات بە سەرمدا خۆی هەڵدەدا و یاری لەگەڵم دەكرد و هەراسانی كردبووم، ناچار بە باوكم و ئەحمەدی برام وت: زۆر دەترسم ناچم بۆ ئاودان. وتیان: بۆ؟ وتم: مارێك هەراسانی كردووم زۆر دەترسم لێی كە دەمبینێت دێت بەرەو بیرم و یاریم لەگەڵ دەكات! باوكم و ئەحمەدی

برام سەرو دارێکی کلکە تەوریان هەڵگرت و وتیان: با بڕۆین، کە نزیکی کشتوکاڵەکە بووینەوە مارەکە هات بەرەو رووومان، کە بینییان باوکم رایکرد و من و ئەحمەدی برام لێی هاتینەدەست و کووشتمان! کە هاتینەوە باوکم وتی: نەدەبووایە بتانکووشتایە! وتم: من کە دەیبینم خەریکە زراوم دەچێت، بەڵام ئەگەر ئێستا بووایە نەمدەکووشت.

لە ساڵی ١٩٦٥ کارگەی سەهۆڵ هەبوو یەکێکیان خاوەنەکەی حسەینی حاجی رەشید بوو لە چاڵەکەی لای مزگەوتی حاجی جەمال، یەکێکی تر خاوەنەکەی شێخ تالیب بوو لە گەڕەکی عەقاری، یەکێکی تر خاوەنەکەی گەرەبێت بوو لە شوێنی ئێستا گەرەبێت نیوەی کارگەکەی بە سەید قادری فرۆشت، سەعیدی کوڕی سەید قادر سەرپەرشتی دەکرد، لەبەر ئەوەی وەکو ئێستا سەلاجە و موجەمیدە نەبوو خەڵکێکی زۆر دەهاتن بۆ سەهۆڵ کڕین لای من، لە رانیە و تاسلوجەوە دەهاتن، تەنەکەچی لە چینکۆی تەنك سەلاجەیەکیان دروست کردبوو وەکو سندوق وابوو، ناوەڕاستەکەی ئاردی دارتاشی تێدابوو بەلوعەی پێوە بوو تەنکییەکی تێدابوو کە چارەکێك سەهۆڵی لەسەر دادەنرا، شەو و رۆژێك ئاوەکەی بە ساردی دەهێشتەوە، لە ناویشیدا گۆشت و خواردنی تێدەکرا.

لە بەهاری ١٩٦٥ جێگای تەنەکەیەك چەڵتووکم لە جۆگەی سەیدان کرد بۆ خۆم کردم بە مەرەزە، ٢٠ فەردە چەڵتووکی لێ پەیدابوو، باوکم دەیوت: دەبێت پارەکەم بدەیتێ! منیش نەمدایە کە نزیکەی ٥٠ دینار بوو. لەسەر پارەکە نێوانی من و باوکم تێکچوو، من هاتم بۆ سلێمانی چووم بۆ لای حەمەی پوورزام خوالێیخۆش بێت کە چایخانەی هەبوو، من لەسەر چایخانەکە تا بەهار ئیشم کرد، باوکم هات بە شوێنمدا بمباتەوە،

لەگەڵی نەچوومەوە، چونکە نیازی ژنهێنانم هەبوو، حەلاوی خوشکم لەگەڵ من هات بۆ سلێمانی و لە خانووەکەی باوکم ماڵم دانا و کەوتمە کاسبی، چەند جارێك ویستم لەگەڵ ماڵی کەریم حەملان و ماڵی سابیری مستەفا ژن بە ژن بکەم، بەڵام باوکم نەیهێشت ببوو بە کۆسپ بۆ من، چونکە دەیویست بیدات بە ژن بۆ خۆی.

ئەو ساڵە کە هاتمە سلێمانی لەبەر ئەوەی حەمەی پورزا و ئامۆزام لە باڵی مەکتەبی سیاسی بوون، و لێپرسراوی ناوشار بوو چەکدار بوو وتی: من ناهێڵم هیچت بۆ ببێت و لەگەڵم ئیش بکە، من چایخانەم هەیە بەهۆی ئەوەوە دەمتوانی لەسەر چایخانەکە ئیش بکەم، زستانان ئیشی چایچێتیم دەکرد و هاوینانیش ئیشی سەهۆڵم دەکرد، باوکیشم خانووەکەی سلێمانی تەواوکرد دای بە کرێ بە حەمە سەعیدی پوورزام، ئەو ساڵەی لە چایخانەکە بووم حەمەی پورزام لەگەڵ محەمەد خدر زێوێیی هاوبەش بوو لە دوکانی چایخانەکە و سەهۆڵەکە وتی: با حەمەکەریم بێتەسەر دوکانی سەهۆڵەکە، دیاربوو منی بە دەستپاك و ئەمین دەزانی، لەوکاتەدا باوکم پەیتا پەیتا دەهات ئەیووت: بۆ نایەیتەوە؟ منیش حەزم لە ئیشی شار دەکرد نەك کشتوکاڵ. لەو جێگایەی ئێستا پێیدەڵێن سەهۆڵەکە لەوکاتەدا جادەکە یەك ساید بوو. دوکانێکم بە حەسیر دروست کردبوو لە کارگەی سەهۆڵی کەرەبێت سەهۆڵم دەهانی بۆ فرۆشتن، ئەم کەرەبێتە پیاوێکی ئەرمەنی بوو زۆر بە ویژدان بوو یارمەتی دەدام، ئەوکاتە قاڵبێك سەهۆڵ بە ٤٠ فلس بوو من دەمدا بە ٦٠ فلس، تا چەمچەماڵ و رانیە دەهاتن بۆ سەهۆڵ کڕین لە لای من بۆ چێشتخانە و چایخانەکان، بۆ ماڵان چارەکی بە ١٥ فلس دەمفرۆشت، رۆژی ٣٠٠ قاڵبم دەفرۆشت، لەوکاتەدا ئەنوەر مام غەریب و

خەڵەفی مام عەلی و رەئوفی مشیر گەبەیی ئیشیان لەگەڵ دەکردم بە رۆژانە رۆژی بە ٨ پەنجایی، ئەو ساڵە پارەیەکی باشم دەستکەوت، حەمەی پوررزام هات وتی: بۆ ژن ناهێنیت؟! وتم: باشە، بەڵام باوکم بیانووم پێدەکرێت، چونکە من تەنها خوشکێکم هەیە و باوکم دەڵێت دەیدەم بە ژن، ناهێڵێت من بیدەم بە ژن، کاکە حەمە زۆر حەزی دەکرد من زوو ژن بێنم.

ئەوکاتە ویستمان دوکانی سەهۆڵەکە بکەین بە رەسمی، شارەوانی چەند کەسێکی دەستنیشانکردبوو بۆ ئەوەی کرێ بدرێت بە ئەوان، لەو کەسانە قادرە سووری شەل بوو، بانگی کردم بۆ ماڵی حاجی براهیم بۆ ئەوەی لەگەڵمان ببێت بە هاوبەش، لەگەڵ دارای حاجی براهیم چووم، قالە سوور لەوێ بوو قسەیان لەگەڵ کردم کە ببێت بە هاوبەشم، منیش وتم: بە دەست من نییە بە دەست محەمەد خدر زێوێیی و محەمەد مەولوودە کە واموت: وازیان لێهێنام و چوومەوە بۆ سەر کارەکەم. لەوکاتەدا نوری ئەحمەد کوردە بەرگرییەکی باشی لێکردم، لە بەرامبەر ئێمە دوکانێکیان دانا، بەڵام کەس لێی نەکڕین و بازاڕیان نەبوو، من لە لێواری جادەکە بە چینکۆ دوکانەکەم دروست کردەوە. من ناوبانگم دەرکردبوو بە پیاوی سەهۆڵەکە.

لە هاوینی ساڵی ١٩٦٦ لەسەر پردەکەی ناوبازار چاوم بە کەریم بەگی موغاغ خوا لێی خۆش بێت کەوت، پیاوێکی قسەخۆش و کۆمەڵایەتی بوو پێیوتم: حەمەکەریم بۆ واز لەم حیزبایەتییە ناهێنیت و خەریکی کار و کاسپی نابیت!؟ منیش وتم: من چینی هەژار و زەحمەتکێش رزگار دەکەم لەم چەوسانەوەیە. وتی: کام هەژار و کام میللەتە، وەرە سەیریان بکە من دەست دەبەم بۆ پشت چاوم سەیری

ئاسمان دەکەم بێ ئەوەی هیچ بە ئاسمانەوە بێت، تۆش سەیری دوامەوە بکە بزانە چەند کەس لەو هەژارانە سەیری ئاسمان دەکات، تا بزانن چی لە ئاسمان هەیە ! کە سەیری ئاسمانی کرد منیش ورد بوومەوە سەیرم کرد نزیکەی ٢٠ کەس سەیری ئاسمانیان دەکرد بێ ئەوەی هیچ ببینن، وتی: وەرە سەیریان بکە خۆت بۆ ئەمانە ماندوو مەکە هەر ئەوە حاڵیانە، منیش دەستمکرد بە پێکەنین.

لە هاوینی ١٩٦٦ لەگەڵ باوکم رێککەوتین کە من ژنم دۆزیوەتەوە بۆ ژن بە ژن، پیاوەکە خزمی خۆمانە، باوکم وتی: باشە، لەگەڵ حەمە سەعید و حەمەی مەولەی کە پورزامن خۆیان و ژنەکانیان هاتن لەگەڵمان بۆ چەمچەماڵ، پێشتر حاجی شەریفی خەزوورم چووبوو بۆ باوەمەندان باوکمی رازی کردبوو کە واز لە ئێمە بێنێت و ژنهێنانی باوکم ئەو لێی بەرپرسیار بێت. حاجی شەریف شەش کچی هەبوو پێشتر لەگەڵ خەسوومدا نەگونجابوون، لەوێ رێککەوتین کە قومری کچی بدات بە من و ئەویش حەلاوەی خوشکم بخوازێت، کە ژنم هێنا بێ ئەوەی بانگیان بکەم هەموو خەڵکی ئەو ناوە هاتن بۆ شاییەکە و دەیانگووت: پیاوی سەهۆڵەکە ژنی هێناوە؟! ئەو رۆژەی ژنم هێنا ٢١ / ٩ / ١٩٦٦ بوو، دەوارێکی گەورەی کوردەکانی باوەمەندانمان هێنابوو هەڵمان دابوو، خەڵکی دوای شایی لە ژێر ئەم دەوارەدا پشوویان دەدا و نانیاندەخوارد، باوکم لە باوەمەندانەوە گایەکی هێنابوو ناوی مەولودی پێغەمبەری لێنا و سەریان بڕی و ٢٠ مەنجەڵیان ریزکردبوو بۆ چێشتلێنان، هەموو ژنانی خزم بەشداریان لە خواردن دروستکردن کرد، هەموو خەڵکی ئابلاخ و شێخ محێدین هاتبوون بۆ شاییەکە، گوندەکانی دەوروپشتی قەرەچەتان بانگهێشتکران، چایچیمان هێنابوو کە ناوی عومەرە کۆڵ بوو ١٢ بۆ ١٣

پیاڵەی بە دەستێك هەڵدەكرد و قادری ئامۆزام سەرپەرشتی دەكرد، چووین بۆ تەیناڵ بۆ گۆڕینەوەی بوك، بەڵام لەبەر ئەوەی خزمان زۆر بوون زوو خۆمان بۆ ئامادەنەكرا، خەزوورم هاتبوو بۆ تاسلووجە لە چایخانەكەی حەمە رەندان بوكمان گۆڕییەوە، ئەمەش باشی ماڵی خەزوومی دەرخست، زۆرمان پێخۆش بوو. دوایی گەڕاینەوە بۆ سلێمانی بۆ شایی و لۆخان. لەوكاتەدا شەریفی مام حسەینی ئامۆزام تازە پێگەیشتبوو ون ببوو، زۆر ماندوو بووین تا دۆزیمانەوە، بەرەو شێخ محێدین ڕۆیشتبوو هەموو خزمان گەڕابوون بە شوێنیدا، كە دۆزیمانەوە دایكی شەریف دەگریا دەیووت: شەریف گیان لە كوێ بوویت؟ شایی گەرم بوو حەمەی پورزام زۆری پێخۆش بوو كەوتە تەقەكردن، سەربازی رەبایەكانی ئابلاخ هاتبوون ئەوانیش كەوتنە تەقەكردن، لەوكاتەدا جەلال چەمچەماڵی هاتبوو گۆرانی دەووت زیاتر شایی گەرم بوو، ئەم خزمایەتییە لە رێگای پیاوێكەوە دروست بوو كە خزمی هەردوولا بوو ناوی حسەین عارف بوو. حاجی شەریف پیاوێكی بە تەمەن بوو، حەلاوەی خوشكم نەیدەویست شووی پێ بكات، بەڵام لەبەر من رازی بوو وتی: لە بنەماڵەی ئێمە هەر تۆمان هەی با باوكم نەتفەوتێنێت! مادام باوكم رازی كراوە كە حاجی شەریف ژنی بۆ دێنێت. ئەم خزمایەتییە زۆر باش بوو تا ئێستا درزی تێنەكەوتووە، بە داخەوە لە پرسەی مردنی باوكم و حەلاوی خوشكم و حاجی شەریف ئامادە نەبووم بەهۆی پێشمەرگایەتییەوە.

لە زستانی ١٩٦٥ شێخ فەتاح عەوەڵانی سەردانی كردین لە باوەمەندان، سەرپەرشتی سووسە كۆنی دەكرد، ماوەیەك بوو گۆشتی نەخواردبوو، ئێمەش برنجمان لێنابوو هێلكە و رۆنمان لەسەر دانابوو،

شێخ لە كاتی نانخواردندا وتی: عەلی ئەمە هەڵخەڵەتاندنە بۆچی ئەوەی هێلكەكەی كردووە سەرت نەبڕیوە! ؟ باوكم وتی: بزانە دەمی منداڵەكان وشك ناكەیت بێ هێلكەیان بكەیت! ئەویش وتی: كە هاتم دوو مەلام بینی یەكێكیان بۆ مریشكەكان دانێ و ئەویتریان سەربڕە، باوكم وتی: یا شێخ ئەگەر حەزت لە گۆشتە سبەینێ بۆت سەردەبڕم، وتی: سەریبڕە، بۆ بەیانی باوكم كەڵەشێرێكیانی سەربڕی و ئێمەش لەگەڵ شێخ دەستمان بە گۆشت خواردن كرد و لە شێخمان پێخۆشتر بوو. شێخ فەتاح لەگەڵ باوكم سوبعەتیان هەبوو، جارێك باوكم گیسكێكی برد بۆ شێخ بە دیاری منی لەگەڵ بووم، من گیسكەكەم گرتبوو لە پێش خۆمەوە دەمبرد، كە گەیشتینە ئەوێ شێخ فەتاح بە باوكمی وت: عەلی فشەفش نەكەیت بڵێیت گیسكم هێناوە لە شیلەخان دەركەوتی: من گیسكێكم بۆت سەربڕیوە پێكەوە دەیخۆین! ؟

لە زستانی ١٩٦٥ كۆمەڵێك چەكدار هاتبوون بۆ باوەمەندان بۆ گرتنی عەلی سۆیلە لەبەر ئەوەی سەرلقی پارتی بوو، ماڵەكەی لای ماڵی ئێمە بوو خەریكی گەڕان بوون بە دوایدا، شەهاب كەركوكییان لەگەڵدا بوو منی دەناسی وتی: ئێمە لە كرژەوە هاتووین وریابە تەنها بۆ گرتنی عەلی سۆیلە هاتووین، دوای گەڕان عەلی سۆیلەیان نەدۆزییەوە، چونكە لەوێ نەبوو، دوایی منیان گرت و چووین بۆ ماڵی حسەینی برای، لەوێش هیچیان دەستنەكەوت، منیان لەگەڵ خۆیان برد بۆ كرژە، بۆ بەیانی باوكم چوو بۆ لای مەجید رۆستەم بۆ ئەوەی بێت ببێت بە كەفیلم، پیاوانە مەجید ڕۆستەم ببوو بە كەفیلم و ئازادی كردم لەوێ پیاوێكی لێبوو ناوی سەعید مەحمود باریك بوو، هات داوای لێبووردنی لێكردم كە دەیزانی پەیوەندیم بە شیوعییەكانەوە هەیە نەك پارتی.

لە هاوینی ١٩٦٦مستەفای ئامۆزام بە نامەی حیزبەوە گیرا، كە دەیوست لە دەرگەڵەوە كە مەكتەبی سیاسی حیزبی لێبوو بیبات بۆ لقی ١٠ ی قەرەداغ، هێسترێكی پێبوو هەموو نامەكانی لە كورتانی هێسترەكەدا شاردبووەوە، لە پشتی جێشانە و هەزارمێرد گیرابوو هێنابوویان بۆ كرژە، لەوێ ویستبوویان بیكوژن، بەڵام عەبدوڵڵای مەلا صالح نەیهێشبوو بیكوژن، لەوكاتەدا عومەر شەریف و ملكۆ و سیامەند گیرابوون و دواتر كوژرابوون، من چووم بۆ سەردانی، زۆر دەترسا ئەویش بكوژن، حەسەنی شێخ قادر لەگەڵم هات، زۆر دڵخۆشی دایەوە كە نەهێڵێت بیكوژن و كەس قسەی پێ بڵێت، زۆر هەوڵمدا ئازادی بكەن، بەڵام ئازادیان نەكرد، بەڵام بەڵێنیان دامێ هیچی لێ نەكەن، چەند مانگێك لەوێ بوو دوایی بە كەفالەت ئازاد كرا.

لە هاوینی ١٩٦٦ بە میوانی چووم بۆ باوەمەندان، خزمێكی خۆمان بە ناوی حامید محەمەد وەستا فتاح هاتبوو بۆ شەكر فرۆشتن، ئەوكاتە شەكر و چا كەم بوو، لە سووسە كۆنەوە ویستبووی بێت بۆ باوەمەندان لە چەمەكە ویستبووی بپەڕێتەوە بارە شەكرەكەی لێكەوتبووە ناو چەمەكەوە و هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە داوای مەنجەڵ و تەشتی لێكردبووین بۆ كوڵاندنی شەكرەكە بۆ ئەوەی بە شكری كوڵاو بیفرۆشێت، ئێمەش دوو مەنجەڵ و كەوگیر و قاپمان برد و چووین بۆ یارمەتی دانی، لە مەنجەڵەكاندا شەكرەكەمان بۆ كوڵاند و ئێمەش كەمێكمان لێكڕی بۆ ئەوەی كاك حامید نەكەوێتە زەرەرەوە.

لە زستانی ١٩٦٦ لە گوندی سووسە كۆن بانگێشتكراین بۆ مەولودی پێغەمبەر، كە حەمەئەمینی عەلی وەیس خوالێیخۆش بێت مەولودی كردبوو، هەموو ساڵێك ئەم كارەی دەكرد، زیاتر لە ٢٠٠ كەسی

بانگهێشت كردبوو، مەلا سەمەدی سووسێی سەیدانی بانگ كردبوو، خەڵك لە نێوان خۆیان چوار چوار قسەیان دەكرد و نانیشیان دەخوارد، كاك حەمەئەمین وتی: مامۆستا رادیۆ دەیووت: مانگێكی دەستكرد چووە بۆ ئاسمان!؟ مامۆستا وتی: كافر بوویت پەشیمان بەرەوە، ئەویش وتی: من ناڵێم رادیۆ دەیلێت! وتی: ئاخر تۆ نابێت بیگێڕیتەوە، بلێ پەشیمان بوومەوە! برادەرێك لەولاوە وتی: دەڵێن سەگێكی تێدا بووە، مامۆستا زویر بوو هەڵستا بڕوات نەیانهێشت!؟

لە هاوینی ١٩٦٧ لەگەڵ حاجی شەریفی خەزوورم چووین بۆ حەویجە بۆ سەردانی كەریمی برای، كە كاتبی ناحیە بوو لەوێ، بۆ من زۆرخۆش بوو، چونكە یەكەم جارم بوو حەویجە ببینم.

لە كۆتایی ١٩٦٧ عەلی مام حەسەنی ئامۆزام ژنی هێنا لە كۆیەك، منیش لەگەڵ خێزانم و باقی خزمان چووین بۆ قەرەچەتان و شەو ماینەوە، بۆ بەیانی بەڕێكەوتین بۆ كۆیەك كە چوار پیكاب بووین، خزمایەتی خۆش بوو خەڵك تەماحی نەبوو، گەیشتینە كۆیەك چووینە ماڵی عەبدوڵی مامە حەمە كە ماڵی لەوێ بوو، كچەكەی دابوو بە عەلی ئامۆزام، زۆر بە ئاسانی بووكمان سواركرد و بە چەپڵەڕێزان گەڕاینەوە بۆ قەرەچەتان، دوو شەو لەوێ ماینەوە كە ئەوكاتە هیچ منداڵمان نەبوو، سەردان بۆ ئێمە زۆرخۆش بوو دواتر هاتینەوە بۆ سلێمانی.

لە ساڵی ١٩٦٨ مەرەزەمان زۆر دەكرد، باوكم تۆوی مەرەزەی لە ماڵی مەلا محەمەد دەهێنا، لە كاتی هێنانی تۆوەكەدا لە سەهۆڵەكە بووم خەریكی سەهۆڵ فرۆشتنی خۆم بووم، باوكم هات بۆ لام دوو تەنەكە چەڵتووكی پێبوو بە نیاز بوو بیبات بۆ باوەمەندان، پێشتر پیكابێكی گرتبوو كە خاوەنەكەی عەبدوڵڵا ئاغا بوو، شۆفێرێكی زۆر كەری هەبوو،

پێیووتبوو کاکە پێشەوەم بۆ دابنێ و لە سەهۆڵەکە چاوەڕێت دەکەم، وتبووی: بە سەرچاو، کە هات بینیمان لە سەهۆڵەکە نەوەستا و چوو بۆ لایماڵی محافز، من و باوکم بە راکردن و هاوار هاوار دوای کەوتین، لەوێ وەستا و خۆی تووڕە کرد و وتی: لەپێشەوە جێگا نەماوە! من خەریك بوو بیکەم بە شەڕ، باوکم وتی: مەکە با بۆی بمێنێت تۆ بڕۆ بۆ سەر ئیشەکەی خۆت، باوکم لەگەڵی سەرکەوت لە دواوە و من گەڕامەوە بۆ سەهۆڵەکە، بۆ رۆژی دوایی خۆم پێنەگیرا چوومەوە بۆ باوەمەندان، دیاربوو جارێکی تر لەگەڵ باوکم کردبووی بە ناخۆشی و باوکمی تووڕە کردبوو، باوکم پێیوتم: کوڕی من نیت ئەگەر تۆڵەی منی لێنەکەیتەوە! منیش ئەحمەدی برام و حەسەنی ئامۆزام برد و چووین بۆی، شەو چووینە ماڵەکەی و لێماندا وەکو مار بکوژی بکەی وابوو، حەسەن و ئەحمەدی برام لێیاندەدا و منیش بە دەمانچەوە بە سەرسەریەوە وریایم دەکردن، کە گەڕاینەوە باوکم پشوویەکی باشیدا کاتێك بۆمان گێڕایەوە، کە چۆن هاواری کردووە لە کاتی لێداندا، دواتر من چوومەوە بۆ سەر کارەکەی خۆم لە سەهۆڵەکە.

لە پاییزی ١٩٦٨ لەگەڵ دارای ئامۆزام چووین بۆ هەواڵی عەلی سۆیلە لە دۆڵی جافایەتی، چونکە لەوناوە ئاڵۆزی و شەڕ هەبوو، لە شەدەڵەوە چووین بۆ سەرگەڵو هەواڵ نەبوو، لەوێوە چووین بۆ قەرانگوێ و مەولان لەوێش هەواڵ نەبوو، لەوێشەوە چووین بۆ مەرگە و بنگرد لەوێ وتیان: لە ماڵی فلان دەمێنێتەوە. چووین بۆ ئەو ماڵە و شەو ماینەوە بۆ بەیانی وتیان: مام عەلی ئەوەیە کە ماینێکی بەڵەکی پێیە؟ وتمان: بەڵێ. وتیان: دوێنێ لێرە بووە وتوویەتی دەڕۆمەوە بۆماڵەوە، ئێمەش کە هەواڵمان زانی گەڕاینەوە بۆ باوەمەندان لەوێ مام عەلیمان بینی پێمانخۆش بوو.

لە کۆتایی ١٩٦٨ حاجی هیدایەت خوالێیخۆش بێت پیاوێکی ئازا و نان بدە بوو، دوو ژنی هەبوو یەکێکیان ئامۆزای من بوو، کوڕە گەورەکەی ناوی حەمەصالّح بوو ژنی بۆ هێنا و بانگهێشتی ئێمەی کرد، ئێمەش لەگەڵ کۆمەڵێك خزم چووین بۆ بەشداری زەماوەند، چەند شەوێك لەوێ بووین و زوڕنا و رەشبەڵەك گەرمی کردبوو، کاتی حەسانەوە عەبەی سەید زادە و نوری کوڕی دەهۆڵ و زورنایان بە هێمنی لێدەدا وەکو نەی، منیش پێمووتن: ئێوە هونەرمەندن دەبێت پەیکەری مێژوویيتان بۆ بکرێت. ئەوانیش زۆریانپێخۆش بوو وتیان: ئەوە یەکەم جارە بە هونەرمەند ناومان ببرێت! حاجی هیدایەت خزمەتێکی باشی کردین دوایی هاتینەوە بۆ سلێمانی، دوای چەند ساڵێك حەمە صالّح ماڵی باری کرد بۆ سلێمانی و لە ماڵی ئێمە نیشتەجێ بوو، بە کاری کرێکارییەوە خەریك بوو. حاجی هیدایەت بەرنامەیەکی باشی هەبوو بۆ کچ و کوڕەکانی، هەر ساڵە خانوویەکی بۆ کوڕێکی دەکڕی و کرێی لێ دەسەند تا مایەکەی تەواو دەکرد، دوایی خانووەکەی دەدا بە کوڕەکەی. بەو جۆرە تا مرد خانووی بۆ هەموو کوڕەکانی کڕی، خوالێیخۆش بێت. ئەمە داهێنان بوو کە باوك بەرنامەی وای هەبێت بۆ کوڕەکانی بۆ ئەوەی ببن بە خاوەن خانووی خۆیان.

لە ساڵی ١٩٦٩ حەسەن قادری ئامۆزام پۆلیس بوو لە مەخفەری لیمۆیی لە ناوچەی نەجەف، بروسکە (برقية) هاتبوو کە کاك حەسەن برینداره و تەقەی لێکراوە، ئێمەش خۆمان کۆکردەوە من و حاجی شەریف و محەمەدی برای حەسەن خوالێیان خۆش بێت، بەرێکەوتین بۆ بەغداد و لەوێوە بۆ نەجەف و لیمۆیی، کە چووین مەئمور مەرکەزەکە هات زۆر رێزی لێگرتین و وتی: خێرە ئێوە کوردن هاتوون بۆ ئێرە!؟

وتمان: بەرقیەکراوە کە حەسەن قادر عومەر بریندارە، خەزوورم عەرەبی باش دەزانی، ئەو وتی: وا نییە لێرە شایی بووە بە چەکەکەی ئەو تەقە کراوە، لەسەر ئەوە گیراوە، بەڵام ئێستا ئازادە و کۆتایی پێهاتووە و نەمانهێشتووە بگاتە دادگا. لەبەر ئێمە کە چووین مانگێك مۆڵەتیان دابوو بە کاك حەسەن و لەگەڵ خۆمان هێنامانەوە بۆ سلێمانی. لەگەڵ هێنانەوەیدا خەڵکێکی زۆر هاتبوون بۆ بەخێرهێنانەوەی وەکو لە حەج هاتبێتەوە وابوو.

لە زستانی ١٩٦٩ مامۆستا صالح لە ماڵی سابیری برای بوو لە بەغداد قاچی شکابوو، لەگەڵ وەستا قادری برای سەردانمان کرد، چووینە ئەوێ حەمە صالح کەریم و گورونی لێبوو، دوو شەو لەوێ ماینەوە، بەڵام لە ئوتێل ماینەوە، چونکە جێگایان نەبوو.

لە ساڵی ١٩٧٠ لە رۆژی ١١ی ئازاردا صالح لە دایك بوو زۆر پێخۆشحاڵ بووین، لەبەر ئەوەی ئەحمەدی برام کوری بۆ نەدەما و منیش ٣ ساڵ بوو ژنم هێنابوو یەکەم کوڕ بوو، پێشتر منداڵمان نەببوو، حەوت رۆژ شوارەمان بۆ گرت، هەموو خزمان هاتبوون بۆ شەوارە بۆ ئەوەی شەوە نەیباتەوە، هەتا بەیانی خزمان یارییان دەکرد لە یارییە کوردەوارییەکان، زۆربەی ئەوانەی هاتبوون بریتی بوون لە کەساتی قۆشمە و قسەخۆش. لەوانە حەمە صالح جاف هاتبوو کە خەڵکی سووسە کۆن بوو حمەسەعید حمەمین قەرەچەتانی لەوێ بوو، مستیلەیەکیان لەسەر تەپۆلکەیەك ئارد دانابوو کە چەقۆیەکی گەورەیان لە تەنیشتەوە دانابوو بە چەقۆکە دەبووایە بە سەرە تەپۆلکە ئاردەکە قاش بکەن بێ ئەوەی مستیلەکە بکەوێت، ئەگەر لە سەرەی هەرکەسێك بکەوتایە دەبووایە بە زمان مستیلەکە هەڵبکرێتەوە! هەندێك جار ئەو

کەسەی مستیلەکەی دەردەهێنایەوە دەمی پڕ دەکرد لە ئارد و دەیپرژاند بە دەم و چاوی ئەوانی تردا. جارێك حەمە سعید دۆڕا بوو دەمی پڕ کردبوو لە ئارد کردبووی بە دەم و چاوی کاك حەمە صالح جاف دا، کاك حەمە صالح زۆر تووڕە بوو بە حەمەسعیدی وت: تۆ کەری تۆ ماکەری!؟ خوا لێیانخۆش بێت.

حەمە صالحی ئامۆزام خوالێیخۆش بێت ببوو بە تەڵە و عومەری برام ببوو بە ڕێوی، ڕێوی زۆر بە هێز بوو تەڵەکەی برد بۆ دەرەوە، مەلا محەمەد کە کوێر بوو وتی: گوێم لە تەقەی تەڵەکەیە، جەلالی حەمە تاتە هاتبوو لەگەڵیان زۆر قۆشمە بوو، پوورزای جەمالی مامۆستا بوو، مامانەکەی صالح زۆر چارەگران بوو، خەوتبوو بە دەم خەوەوە کە ئاگای لەخۆی نەبوو لەقەیەکی دابوو بە مەلۆتکەکەدا، جەلال شەقێکی دابوو لە مامانەکە وتی: ئێمە لە ئێوارەوە حەرەسین بۆ ئەوەی شەوە نەیکوژێ و نەیباتەوە کەچی تۆ بە لەقە خەریکە دەیکوژیت!؟ تا دەمەو بەیانی یاری دەکرا، دوایی ژنی خزمان نان و خواردنیان دەهانی و دەست دەکرا بە نانخواردن، هەر پێکەنین بوو بەو شەقەی کاك جەلال و لەقەی مامانەکە، مامانەکە تووڕە ببوو وتبووی: من نان ناخۆم.. کە هەتاو دەکەوت هەرکەس دەڕۆیشەوە بۆ ماڵی خۆی و سەر کاری خۆی.

دوای پەیامی ئازار رژێم لێبووردنی دەرکرد بۆ سەربازی هەڵاتوو و دواکەوتوو، لەگەڵ حەسەنی ئامۆزام چووین بۆ ناوچەی دوکان پشتگیری ناوچەمان هێنا بۆ ئەوەی لە تەجنید دەفتەر خدمەکەمان بۆ ئیمزا بکەن و بە لوجنە سەلام تەسریح بین، کە چووین بۆ ناوچە حسەین فەیلی لێبوو پێشتر شیوعی بوو منی دەناسی، ئێمە یەکەم کەس بووین نەیاندەزانی چۆن نووسراومان بۆ بکەن، ئەو هەواڵەیان نەبیستبوو، بەڵام لە ڕێگەی

حیزبەوە زانیبوومان، بۆیاننووسین ئەمانە بە بێ دابڕان لە ساڵی ١٩٦١ تا ١٩٧٠ پێشمەرگە بوون. تەجنید لای باڵەخانەی لقی چواری ئێستا بوو لە چوارباخ، کە چووینە ئەوێ رەیس لەتیف سەرۆکی تەجنید بوو خوالێیخۆش بێت، شیوعی بوو منی دەناسی، پێیان سەیر بوو چۆن نووسراوی وایان ئاڕاستەکراوە!؟ نەیانزانی چیبکەن، چوون بۆ لای رەئیس لەتیف هات بۆ لامان و بە نووسەرەکانی وت: کە چۆن کارەکە بکەن، زوو کارەکەی بۆ تەواو کردین کە هەمان نووسینی ناوچەیان لەسەر دەفتەر خدمەکەمان نووسی و تەسریح بووین، دوای ئێمە بینیمان دوو هەزار کەس لەبەردەم تەجنید وەستابوون بۆ تەواوکردنی هەمان کاری ئێمە. دواتر ئەم دەفتەر خدمەیەم لێ ببوو بە دوژمن لە هیچ شوێنێك نەمدەتوانی نیشانی کەسی بدەم کە لە حکومەتی ئەوسای عێراقدا دەسەڵاتدار ببوایە؟! چونکە یەکسەر لێپێچینەوەم لەگەڵ دەکرا.

لە ساڵی ١٩٧٠ لەگەڵ عەلی حاجی شەریفی ژنبرام چووین بۆ سەردانی خزمان لە کلکە سماق، لەوێ دەستور بوو ژنەکان شانی خزمی نزیکیان ماچ دەکرد، عەلی زۆری لا سەیر بوو هەرگیز شتی وای نەدیبوو، بۆ ماچکردنی شانی خۆی دادەنواند، لەوەودوا هەر کەسێك قسەیەکی سەیری بکردایە دەیوت: شانی ماچ بکە. ئەو دەستوورە تا ئێستاش لەناو ئەو خزمانە ماوە کە دەچم بۆ پرسە و بۆنەکانیان شانی من و ئەحمەدی برام ماچ دەکەن، ئەم دابونەریتە لە ناوچەکانی تری کوردستان کەمە یان نییە، ئەم نەریتە دیارە لە خانەقاکانەوە یان تەکییەکانەوە وەرگیراوە کە نیشانەی رێزە بۆ کەسە نزیکەکانیان، بە بۆچوونی من لە دەست ماچکردن باشترە و بە رێزترە، چونکە لە کاتی شان ماچکردن مرۆڤ خۆی کەم دادەنەوێنێت.

لە ڕۆژی ٣ / ١١ / ١٩٧١ شەوارەی ڕەحیمی کوڕم دەستیپێکرد، بەڵام زۆر گەرمتر نەبوو لە شەوارەی صالّح، چونکە ئەحمەدی برام کوڕی بۆ نەدەما تەنها یەك کوڕی هەبوو ناوی کاوە بوو، ئەو ساڵە نەخۆش کەوت و چەند مانگێك لە نەخۆشخانە بوو، دوایی لە نەخۆشخانە کۆچی دواییکرد، تەمەنی ٧ ساڵان بوو بنەماڵەکەمان هەمووی زۆر دڵگران بوو بەو کارەساتە، کە کوڕی بۆ نەدەما تەنها ئەم کوڕەی مابوو ئەویش خوا بردیەوە بۆ دەرگای خۆی، بۆ ئێمەش وەکو خۆڵ بەسەرماندا کەوتبێت وابوو بۆ کەس نەگریاوم بۆ ئەو گریام، ئێستاش کە بیرم دەکەوێتەوە دڵم تەنگ دەبێت، چونکە زۆرم خۆشدەویست.

لە ساڵی ١٩٧٠ بە دواوە دەچووین بۆ کەرکوك نۆك و نیسکمان دەفرۆشت، حاجی عەلی شەمیٚ هەبوو لە خوار حەسیرەکە خەڵکی زێویٚ بوو زۆر پیاوی چاك بوو، نۆك و نیسکەکەی بۆ دەفرۆشتین، ئەگەر کاتی نانخواردن بووایە دەیبردین بۆ ماڵی خۆیان بۆ نانخواردن، ئەگەر ئەو کەسەی نۆك و نیسکەکەی لێدەکڕین پارەی لا نەبووایە حاجی عەلی پارەکەی دەدایٚ و دەیوت: با درەنگ نەکەون، لێرە خۆی پارەکەی دەدایٚ بۆ ئەوەی زوو بگەڕێینەوە بۆ ناوچەی خۆمان، دوایی خۆی پارەکەی وەردەگرتەوە.

لە سەرەتای ١٩٧٠ نێوانمان لەگەڵ هاوریٚ حەمەڕەشید قەرەداغی زۆر خۆش بوو، من و باوکم سەیارەمان هەبوو هاتوچۆی قەرەداغمان دەکرد و شەو لە ماڵیان دەماینەوە، شەو هاوڕێیان کۆدەبوونەوە لەو ناوانەی لە بیرمە: حەسەنی عەتیە، جەلال، نوری کە خاوەن ئاش بوو، یاری شەوانەمان دەکرد، جەلال قاچی خۆی وەکو تفەنگ دەخستەسەر شانی خۆی زۆر پێمان سەیر بوو، حەمە سەعیدی برای حەمەڕەشید کە

منداڵ بوو هەر خەریکی مەڕومالآت بوو، چونکە مەڕێکی زۆریان هەبوو، رۆژێك قاتێك جلم بۆ حەمەسەعید برد کە یەکەم جاری بوو جلی پیاوان لەبەر بکات، زۆر دڵی پێخۆش بوو تا مرد هەر باسی دەکرد. ئەم پەیوەندییەی من و کاك حەمەڕەشید لە ساڵی ١٩٧٩ بەدواوە لە شۆڕشی نوێ زۆر لە جاران خۆشتر بوو، لە بەلەبزان و بێتووش لە ریزەکانی حیزبی شیوعیدا، چونکە پیاوێکی لەسەرخۆ و ئازا بوو لە بواری سەربازیدا و لە بواری سیاسیدا بە هەمان شێوە، هەمیشە پێکەوە بووین هەڵوێستمان وەکویەك بووە، تا ئێستا ئەو پەیوەندییە بەردەوامە و لە ئێرانیش هاموشۆی خێزانیمان هەبووە.

لە ساڵی ١٩٧٠ کە ئازادی هەبوو لە کاتی ئاگری نەورۆزدا لەگەڵ کۆمەڵێك هاورێدا دەچووین بۆ شاخی گۆیژە بە ئاگر دەماننووسی نەورۆز پیرۆزە. لە شاری سلێمانی لەو هاوڕێیانە عوسمان و عەلی برای کە پەنچەرچی بوون، کۆمەڵێك کرێکاری باخەکان چاڵەکانیان هەڵدەکەند و ئەوانیش لاسیکیان ورد دەکرد، هەندێك خۆڵەمێش و نەوتمان دەکردەناو چاڵە نووسراوەکە، کە ئاگرمان تێبەردەدا هەموو سلێمانی سەیری دەکرد، لە کاتی هاتنەخوارەوەماندا کۆمەڵێك چەکدار کەوتنە گیانمان من رامکرد، بەڵام ئەوان گیران. لەوکاتەدا حەماسی شۆڕش زۆر بوو خەڵك بە پەرۆش بوون بۆ خەبات لە پێناوی گەل و نیشتماندا، خۆزگە ئێستاش ئەو گیانە حەماسییە مابوویایە نەك هەر رەخنە بگرن.

لە ساڵی ١٩٧٠ بە دواوە لە بواری رێکخستندا لە ریزەکانی حیزبی شیوعیدا لەگەڵ ئەم برادەرانە ئیشم دەکرد، ماوەیەك ئیسماعیل دیکتارۆڤ لێپرسراومان بوو خوالێیخۆش بێت، من و ئیسماعیل و رەئوف شینکی و محەمەد کریم محەمەد، ماوەیەك لەگەڵ کەمالی گەچ و مەلا حسەینی

ئابلاخ و عەبدوللا هەولێری و عومەری زراعە، جەزا عومەر لێپرسراومان بوو، ماوەیەك لەگەڵ حاجی محەمەد قڕگەیی خوالێیخۆش بێت و ئەحمەدی نازدار كە مامۆستا كەمال حەمەمین لێپرسراومان بوو، لە ساڵی ١٩٧٤ لە سەرچنار لەگەڵ رەئوف و شێخ جەمیل و عومەر بلیس و سعید موزەمید و حاجی حەمە خورشید و شێخ محەمەد و تۆفیق سووتاو و نوری رەباتی و شێخ حەسیب و صلاح رەشید كە زۆربەیان كۆچی دواییان كردووە خوا لێیانخۆش بێت.

لە ساڵی ١٩٧٠ باوكم ژنی سێیەمی هێنا كە زۆر دەمێك بوو بێ ژن بوو، پێشتر ژنی نەدەویست، چونكە من و خوشك و براكانم منداڵ بووین، ژنمان لە گوندی شەدەڵە بۆ هێنا، لەگەڵ خێزانم چووین بۆ باوەمەندان بۆ ئەوەی بچین بۆ بینینی، لەوكاتەدا ماڵم لە سلێمانی بوو، لەوێ ژنم هێنابوو، باوكم وتی: ئەم ئیشە تۆ جێبەجێی بكە. وتم: باشە، چووم دوو جێبم گرت بە كرێ، یەكێكیان هی حاجی سابیر یالآنقۆزی بوو ئەویتریان هی حەمە خورشیدی پوورزام بوو، بەم دوو جێبە لەگەڵ كۆمەڵێك پیاوی گەڕەكی خۆمان لە سلێمانی بەڕێكەوتین بۆ گوندی شەدەڵە، لەو پیاوانە قادر عەلی پاشا كە هاوبەشی دوكانی برنجفرۆشی خۆم بوو، حەمەكەریم مامە حەمە كە خەزووری حەمە سۆیلەی ئامۆزام بوو، لە گوندی شەدەڵە بووكم بۆ باوكم سواركرد، سەیارە نەدەچوو بۆ باوەمەندان، لە سووسە كۆنەوە سەربەرەوخوار بەپێ رۆیشتین بەرەو باوەمەندان، لە رێگا یەدەكێ فیشەكم تەقاند بۆ ئەوەی ئەحمەدی برام ماین بێنێت، كە مایینی هانی بووكمان سواری ماین كرد و جێبەكان ئێمەیان بەجێهێشت، كە چووینە باوەمەندان نانمانخوارد و گەڕاینەوە بۆ سلێمانی و باوكم چووە پەردەوە.

لە ساڵی ١٩٧٠ دوای پەیامی ١١ی ئازار خۆشی و ئاوەدانی كەوتەناو شار و گوندەكان، بەڕێوبەرایەتی كشتوكاڵ پێیانووتین: بچنە سووسە كۆن زەوی میرییە و دابەش دەكرێت، منیش چوومە لای ئامۆزاكانم ٤ دۆنم زەوی بەراو و چەند دۆنمێك زەوی دێمم بە ناوەوە كرا بە بەڵێننامە (عقد)، منیش تازە خوا دوو كوڕی دابوو پێم و زۆر ناسك بوون لەوێ نەمانتوانی بمێنینەوە، هاتینەوە بۆ سلێمانی. هەر ئەو ساڵە لەگەڵ ئەحمەد حمەمین و قادر عەلی پاشا دوكانی برنجفرۆشیم هەبوو، هاوینانیش سەهۆڵم دەفرۆشت. باوكم حەزی دەكرد سەیارەمان هەبێت، بەڵام من حەزم لێنەبوو. باوكم لەگەڵ خەزوورم جێبێكیان كڕی، حەمە خورشیدی پورزامیان خستبووەسەر جێبەكە هیچی نەدەدا بە ئەوان هەر بۆ خۆی دەیخوارد، باوكم رقی هەڵستا و فرۆشتی و لەگەڵ خەزوورم جیابوونەوە و دەگەڕا پیكابێك بۆ ئیش بكڕێت، بەڵام دەستم لە سەهۆڵفرۆشتن بەرنەدا، ماوەی چوار مانگ پارەیەكی باشم دەستكەوت، لەوكاتەدا لەگەڵ ئەنوەری مام غەریب بیرانی لە سەهۆڵەكە كارمان دەكرد، دوای ئەوە لەگەڵ ئەسعەد و خەڵەف كە كوڕی حاجی عەلی بیرانی بوون تەراكتۆرێكی فۆرگاسنی تایە باریكم كڕی، ئەوان بە زۆری ئیشیان پێدەكرد.

لە ساڵی ١٩٧٠ تووشی نەخۆشی مەعیدە بووم، دەچووم بۆ بەغداد بۆ لای دكتۆر براهیم تەها لە فلكەی رەصافی، جارێك لەگەڵ كۆمەڵێك نەخۆش پێكەوە چووین بۆ لای دكتۆر، لەوانە ئایشەخانی ژنی مەلا محەمەد و محەمەدی برای مامۆستا و شێخ كەریم موعەلیم، ئەوان دەچوون بۆ لای دكتۆر كمال حسەین كە خەڵكی سلێمانی بوو. لەو ئوتێلەی كە شەو دەماینەوە خاوەن ئوتێلەكە پێی باش بوو منیش بچم

بۆ لای دکتۆر کمال حسەین. منیش پێمباش بوو، کە پێکەوە چووین بۆ لای دکتۆر حسەین وتی: تۆ دەبێت نەشتەرگەری دوانزەگریێ بکرێیت، ئەوانەی لەگەڵم بوون هەموویان نەشتەرگەرییان کرد و من نەمویست بیکەم، شێخ کەریم مرد و منیش ئەو بڕیارەم زۆر پێناخۆش بوو، چوومەوە بۆ لای دکتۆر براهیم تەها و باسی دکتۆر حسەینم بۆ کرد، ئەویش تەلەفونی بۆ کرد بە ئینگلیزی قسەی لەگەڵ کرد و تێینەگەیشتم دیار بوو لێی تووڕە بوو، دوایی بە منی وت: کاکە تۆ پێویست ناکات نەشتەرگەری بکەیت زۆر دڵخۆش بووم، وتی: بەقەدەر دەنکێك نیسك ئیلتیهابت ماوە من بە دەرمان بۆت چاك دەکەم، سەری مانگ وەرەوە بۆ لام، کە چوومەوە بۆ لای وتی: تەواو چاك بووی چی دەخۆی بیخۆ، نەشتەرگەریم نەکرد و تا ئێستاش ماوم.

لە کاتی گەڕانەوەم لە بەغداد چوومە سەردانی ماڵی خەزوورم لە چەمچەماڵ، دیار بوو ناوچەی پارتی لەوێ هەواڵیان لابوو کە چووم بۆ بەغداد و حیزبی شیوعی لەگەڵ بەعس رێککەوتوون، خەزوورم لە ناوچەی چەمچەماڵ ئەندام بوو، عەبدولکەریم حەسەن لێپرسراوی ناوچە بوو، هەواڵیان لێمدابوو لە ناوچە بانگکرام و عەبدولکەریم حەسەن پێیوتم: دەڵێن تۆ چوویت بۆ بەغداد بۆ هێنانی چەك بۆ لێدانی ئێمە!؟ منیش وتم: من چووم بۆ چارەسەرکردن نەخۆشم، دیار بوو خەزوورم زۆری پێناخۆش بوو، یەکەم زاوای بووم، دووەم لە ماڵیان بووم، ئیتر حاجی شەریفی خەزوورم خوالێیخۆش بێت تووڕە بوو وتی: خۆم دەکوژم ئەگەر لێکۆڵینەوەی لەگەڵدا بکەن! ئەگەر خەزوورم نەبووایە رەوانەی بەندیخانەی رایەت دەکرام، ئەوەی بچوایەتە بەندیخانەی رایەت بە لەشساغی نەدەگەڕایەوە.

لە ساڵی ١٩٧١ لای ماڵی حاجی تۆفیق کونجیرینی دوکانی سەهۆڵفرۆشتنم هەبوو، کوپەیەك ئاوم دانابوو چوار تەنەکە ئاوی دەگرت، رۆژی سێ پەنجاییم دەدا بە شاگرد ئاوی لای کارگەی سەهۆڵی کەرەبێت بۆ دەهێنام تێم دەکرد، ئەو سەرە پارچە سەهۆڵانەی کە دەمایەوە دەمخستنەناو کوپەکەوە، هەمیشە ئاوی ساردم لابوو، بەو چلەی هاوینە رۆژێك پیاوێك هات پاڵتۆیەکی لەبەر کردبوو دەیووت: سەرمامە! منیش پارچەیەك سەهۆڵم خستە پشتییەوە هەڵدەپەڕی دەیوت: پشتم سووتا! ئەوکاتە حاکم سەروەر لەوێ بوو کە خوێندکار بوو زۆر پێکەنی بە قسەی ئەو پیاوە، پاڵتۆی لەبەر بوو دەیووت: سەرمامە و بە سەهۆڵەکەش دەیووت: سووتام.

لە ساڵی ١٩٧١ زەوی میری دابەشدەکرا، زەویمان وەرگرتبوو لە سووسە کۆن زۆر دڵمان پێیخۆش بوو، من ماڵم لە سلێمانییەوە بردبوو بۆ ئەوێ، ئەگەڵ دارای ئامۆزام زەویمان دەکێڵا، هاواری کرد وتی: ئەمە مارێکە لەسەر مەکینەکە، کە بینیم ڕەشمارێك بوو خۆی لەو جێگایە ئاڵاندبوو کە شۆفێرەکە لەسەری دادەنیشت، باش بوو بۆ خۆی هاتە خوارەوە ئەگینا هیچی لەگەڵ نەدەکرا، ئەو ساڵە ئەو زەوییانەمان دەکرد بە تەماتە، جاری وا هەبوو ١٠٠ سندوقی تەختەمان لێ باردەکرد، بەڵام هەقی سەیارە و عموولەی عەلوە هیچی بۆماننەدەهێشتەوە، ناچار من کشتوکاڵم لەبەرچاو کەوت و گەڕامەوە بۆ سلێمانی.

لە زستانی ١٩٧٢ بەفر زۆر باری وەزعی سلێمانی باش نەبوو لە هاتنی سووتەمەنی، عەرەبانەیەکی نەوت کە دەردەچوو بەقەدەر خۆپیشاندانێکی ئێستا جەماوەری بە دواوە دەڕۆیشت! ئیتر قوڕ کرابوو بە سەر خاوەن عەرەبانەکەدا نەیدەزانی چۆن بیفرۆشێت، هەر کە

عەرەبانەکەی رابگرتایە ١٠٠ کەس هێرشی دەکرد بۆ سەر عەرەبانەکە، بە ناچاری دەستی بە رۆیشتن دەکرد تا خەڵك وردە وردە بێتاقەت دەبوون، شیعر بەسەر وڵاخەکەدا وترابوو دەیانووت: کۆڵان بە کۆڵان جادە بە جادە ئەی صاحێب عەرەبانە ئەسپەکە تۆپی رێشمەکەی لادە! من چووم بۆ گەراجی سەرکارێز لەوێ وتیان: نەوتی خانەقین هاتووە بەرمیلی بە ٥ دینار، چووم بەرمیلێکم کڕی یەکەمجار بوو کە نەوتی گران بکڕم.

لە ساڵی ١٩٧٢ باوەمەندان قەرەباڵغی رووی تێکرد، ماڵەکانی نزیکەی ١٥ ماڵ دەبوون، رژێم بایەعی شەکر و چا ی بۆ دەرکردن لە ناحیەی سووررداش بارەگاکەی لە سووسێ بوو، ناحیە بڕیاری دا باوەمەندان بکات بە گوند و ناویان نا عەلیاوە بە ناوی باوکمەوە، باوکمیان کرد بە کوێخای گوندەکە و مۆری بۆ هەڵکەندرا، چونکە باوەمەندانی تر لە خوار شیلەخانەوە هەبوو. دەبووایە بە مۆری کوێخا هەموو مانگێك بایەعی دابەش بکرایە، مەلا عەلی کوڕی مەلا محەمەدی خاوەن موڵکەکەیان کرد بە بایەع و هەموو مانگێك بایەعی دەهێنا بۆ گوندی عەلیاوا و دابەشی دەکرد. لەوکاتەدا کۆمەڵێك ماڵی کلکەسماقی هاتن بۆ عەلیاوا بۆ جووتیاری وەکو: صدیقی حاجی محەمەد کە هاوسەری ئایشەی خوشکم بوو لەگەڵ عەبدولڕەحمانی ئامۆزای و مستەفای زاوای. ماڵی کەریمی ئەحمەد جبەی سووسێی ئاڵەمەرەش هات بۆ عەلیاوا.

لە ساڵی ١٩٧٢ لەگەڵ سدیقی حاجی ئەمین لە سلێمانی دوو بەش ئوتێل خیاممان کڕی، بەشێکی هی حەمەی ئەمین بوو ناسراو بوو بە حمەی لالەمین، ئەوکاتە کوردستان شەڕی تێدا نەبوو سوودی باشی

هەبوو، بەڵام ئێمە شارەزا نەبووین، کاکە حەمە ژن و منداڵی نەبوو شەوانە لەوێ دەخەوت، دوای ساڵێك شارەزا بووین کەوتینە حساب لەگەڵی، بەڵام من و سدیق وەکو برا بووین تا ئێستاش هەر یەکمان خۆشدەوێت، رێکنەکەوتین مشتەریمان هێنایەسەری بیفرۆشین، ئەوکاتە خۆی پیاوێکی دۆزییەوە لێی کڕین، ئەو نەیتوانی بەشەکەی خۆی بفرۆشێت، چونکە ماڵی نەبوو دەبوایە لە ئوتێلەکە بخەوێت کە ژوورێکی داگیر کردبوو وەکو ماڵی خۆی.

لە ساڵی ١٩٧٢ پورەفاتم کە دایکی ئامۆزای خۆم بوو لەگەڵ نەوزادی کوڕی هاتن بۆ لام لە سلێمانی پێیانوتم: شەهید حەمەسووری باوکی نەوزاد واتە حمەی حاجی ئەمین کاتی خۆی لە دائیرەی رەی بوو بە پلەی پاسەوان بۆ ئەوەی بزانن زەمانی هەیە یان نا، منیش لەگەڵیان چووم بۆ دائیرەی زەمان لەوێ ئیسماعیل خەلیل یابە بەڕێوەبەری بوو کە خزمی خۆمان بوو، یارمەتی داین و زۆر ماندوو بوو تا ناوی محەمەد ئەمینی دۆزییەوە، چەندی زەمان لێوەرگیرابوو هەموویمان بۆ گەڕاندنەوە کە نزیکەی ٣٠٠ دینار بوو.

لە ساڵی ١٩٧٢ بەدواوە حیزبی شیوعی و حیزبی بەعسی فاشی رێککەوتبوون لەناو بەرەیەکدا بە ناوی جەبهەی میساقی عەمەلی وەتەنی، لەوکاتەدا رژێمی عێراق لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت رێککەوتبوو، لە ساڵی ١٩٧٣ وەزع لەگەڵ پارتی تێکچوو کەوتنە گرتنی برادەرانی حیزبی شیوعی، لەوکاتەدا دکتۆر عارف لە رانیە لێپرسراو بوو گیرا، حەمە سۆیلەی ئامۆزام چووە رانیە ماوەیەك لەوێ بوو ژیانی لە مەترسیدا بوو، لەگەڵ خالید حاجی حەسەن چووین ماڵەکەیمان هێنایەوە دوایش خۆی هاتەوە، لە ساڵی ١٩٧٤ پێش ئەوەی پارتی بچنەدەرەوە لە شار، ئێمە

مەفرەزەیەك بووین چەكدار بووین لە ماڵەكان دەماینەوە، لەو برادەرانەی ئەوکاتە: حەمە شەریف، عەریف مەجید، عەبدوڵڵا هەولێری، نوری حاجی گورون، حەمە سۆیلە، ئیسماعیل دیکتارۆڤ، ئەنوەر نامیق، ئەحمەد رەجەب، رەئوف شینکی، بەشەو زۆر جار لە ماڵی شێخ عەلی دەماینەوە، ژنەکەی ناوی جەیران بوو ئەندامی حیزب بوو. هەندێك جاریش لە ماڵی ئەحمەد رەجەب دەماینەوە، چونکە جێگای باوەڕ بوون و نزیکی ناوشار بوون، هەر شەوە لە ماڵێك دەخەوتین بۆ ئەوەی پارتی تاکە تاکە نەمانگرێت، زۆر وریای خۆمان بووین، شانەی چەکدارمان دروست کردبوو بۆ پارێزگاری خۆمان، بۆ ئەوەی نەمان بەنە دەرەوە و بمانگرن، تا ئەوکاتەی پارتی چووە دەرەوە و حیزبی شیوعی بارەگای کردەوە لە ناوشار. ئیتر بە چەکەوە هاتوچۆی بارەگامان دەکرد. بۆ نموونە جارێك چەکەکانمان لەژێر عەبای خێزانەکانمان شاردبووەوە و خۆمان لەگەڵیان دەڕۆیشتین، من و حەمە سۆیلە دەمانگواستەوە لە ماڵی مامۆستا سەلاحەوە لە چوارباخ بۆ ماڵی ئەحمەد رەجەب. جێبەکانی لقی چوار هاتن بۆ ئەوەی بمانگرن، چونکە پێشمەرگەکان بیرانی بوون و ئێمەیان دەناسی، کە رایانگرت ئێمەش خێرا دەستمان بۆ ژێر عەبای خێزانەکانمان برد و میلی چەکمان راکێشا و تەقەمان نەکرد، چونکە ئەوان رایانکرد.

خۆشترین ژیانم لە سالانی ١٩٧٠ بۆ ١٩٧٣ بوو، لەگەڵ سدیق گەبەیی ئوتێلمان هەبوو، لەگەڵ ئەوەدا لەگەڵ فەتاح مەجید سووری گەبە توتنمان دەکڕی لە ئینحیسار فەحسمان دەکرد، چونکە توتن ئەوکاتە پارەی باشی دەکرد، ئێمە فێری ئیشێك بووین کە بە فەردە توتنمان دەکڕییەوە بە پارەیەکی کەم لەو کەسەی توتنەکەی لە فەحس

دەرنەدەچوو و وەرنەدەگیرا، دەچووین بۆ خانی عەتای شاڵی بە سندوق دامان دەگرتەوە و پیسەکەمان لێ فڕێدەدا، کاتێك پاکمان دەکردەوە دەمانبردەوە بۆ دائیرەی ئینحیسار بە سالبی وەردەگیرا و ٧ دیناری قازانج دەکرد، بۆ ئەوکاتە ٧ دینار زۆر بوو، دواتر من و فەتاح دوکانمان دانا، سندوقمان بۆ تەماتە رەوانە دەکرد بۆ لادێکان و تەماتەمان بۆ دوکانەکان دەهێنا، سندوقی ١٠٠ فلس خێری دەکرد وەکو عمووله.

لە ساڵی ١٩٧٤ خەزوورم پێشمەرگە بوو چووبووە باوەمەندان بۆ سەردانی خەزووری کە باوکم بوو خوا لێیانخۆش بێت، لە کاتی نیوەڕۆدا چەکەکەی پاك کردبووەوە لە سەربازگەی سووسێوە چاویان لێبوو بە دووربین، دارای ئامۆزام لە دوورەوە چاوی لە لوولەی دەبابەکە بوو کە بەرەو باوەمەندان سووراندبووی هاواری کردبوو وریابن دەبابەکە تۆپ دەتەقێنێ، دەبابەکە چەند کولله تۆپێکی بە ماڵەکانی ئێمەوە نابوو لە باوەمەندان، لەوکاتەدا مولازم محەمەد عەلی قەرەچەتانی لەوێ بوو، بە ئامری دەبابەکەی وتبوو: ئەوانە خزمی منن لەسەر ئیشی کشتوکاڵن پێشمەرگە نین بۆ تۆپ بارانیان دەکەن؟! ئەوەی تەقاندبوویان هیچ زیانێکی نەبوو، دوای ئەوەی مولازم محەمەد رایکردبوو بۆ ناو شۆڕش، ئەو رووداوەی بۆ باوکم گێرابووەوە کە ئەو نەبووایە باوەمەندانیان خاپوور دەکرد.

لە ساڵی ١٩٧٤ وەزعم باش نەبوو دوو جار بریندار کرام، هەر بە رێگەی نەخۆشخانەوە بووم، لە دوای ١٩٧٤ شەریکەیەکی رووسی لە دوکان ئیشی دەکرد نامەیەکم برد بۆ ئەوەی لەوێ ئیش بکەم، لەبەر ئەوەی دەستم ئیشی نەدەکرد، دکتۆر عەلی کە ژنەکەی رووسی بوو ناوی تەمارە بوو، بەڵام کوردی دەزانی و نامەکەی برد بۆ مدیرەکە بۆ ئەوەی

ئیشم بۆ دیاری بکات، لە وەڵامدا وتبووی: ئێمە لەگەڵ حیزبی بەعس ڕێککەوتووین کە پەیوەندیمان بە حیزبی شیوعییەوە نەبێت، زۆرم پێناخۆش بوو، تووڕە بووم، تەمارە وتی: گوناهی من چییە ! ؟ دوایی هاتمەوە بۆ سلێمانی چووم بۆ دائیرەی رەی کە عەباس رۆستەم مەساح بوو لەوێ، کۆمەڵێك پیاوی باشی لێبوو وەکو حەمە شوکر و جۆرج و عومەر جوڕی کردمیان بە چاودێر بۆ جۆگەی ئاوبارە، زۆری کرێکارەکان شیوعی بوون، ناسر کۆیی و ئەحمەد مراخانی لەوێ بوون.

لە پاییزی ١٩٧٣ کە نێوانی حیزبی شیوعی و پارتی بە تەواوی تێکچوو، شەڕ لە دەربەندیخان دەستیپێکرد، شیوعییەکان قەرەداغیان چۆڵ کرد و چوونە دەربەندیخان، چەند رۆژێك شەڕ بوو، من و مەحمود دیکتارۆڤ و ئەنوەر نامیق ویستمان بچین بۆ دەربەندیخان بۆ بەشداری ئەو شەڕە، بەڵام ڕێگا گیرا لێمان نەمانتوانی بچین. دواتر بارەگامان لە سلێمانی کردەوە و پارتی سلێمانی چۆڵکرد. پارتی ویستی گردی سەیوان بگرێت کە حاجی محەمەد قرگەیی لێپرسراوی بوو، من و عەبدوڵڵا هەولێری و عەلی وەتمانی چوارقوڕنە چووین بۆ پێشەوەی شەڕەکە لە گردی سەلیم بەگ، پاش شەڕێکی باش هەرسێکمان بریندار کراین، گوللەیەك بەر لوتم کەوت، کە ئێستاش پارچەیەك لە لوتمدا ماوە ! عەبدوڵڵا هەولێری گوللەیەك بەر ورگی کەوت، بەڵام زیانی نەبوو، عەلی وەتمانیش گوللەیەك بەر قۆڵی کەوت. ڕێکخستنەکان هاتن بۆ لامان و بە شان ئێمەیان هێنایەخوارەوە، من ویسم نەچمە کۆڵیان، بەڵام هەژاری وەستا سابیر وتی: هەر دەبێت بێتە کۆڵم، منیش دڵیم نەشکاند، کە ئێوارە هات گەڕاینەوە بۆ بارەگای سەیوان و پارتی پاشەکشەی کرد. بۆ شەو ئیزگەی پارتی هەواڵی کووشتنی منیان بڵاوکردەوە ! منیش گاڵتەم

پێدەهات. بۆ بەیانی چووم بۆ نەخۆشخانە، لەوێ دکتۆر عەبدولڕحمان ریسی لێبوو، تەداوی کردم و وتی: دەبێت بچیت بۆ کەرکوك بۆ نەشتەرگەری جوانکاری، پێمووت: بچم بۆ لای کێ؟ وتی: بچۆ بۆ لای دکتۆر عادل تەرزی، کە چووم بۆ لای، دکتۆرێکی زۆر باش بوو چەند جارێك نەشتەرگەری بۆ کردم بۆ ئەوەی شوێنەواری گوللەکە بە لوتمەوە دیار نەبێت، دوای چەند مانگێك چاکبوومەوە و چوومەوە بۆ بارەگا لە سەرچنار، رژێم ١٥ سەربازی هێنا بۆ وێستگەی کارەبای سەرچنار بۆ پارێزگاریکردنی، بەڵام پێشمەرگەی پارتی نەیانهێشت یەك شەو لەوێ بن هاتن بۆ شەو هەموو سەربازەکانیان لەگەڵ خۆیان برد، ئیتر سەرچنار حکومەتی تێدا نەبوو، ئێمە پارێزگاری کارگەی چیمەنتۆمان دەکرد، زۆرجار دەهاتن بۆ سەر ئێمە، بەڵام نەیانتوانی هیچ بکەن و زیان بە کارگەکە بگەیەنن.

ساڵی ١٩٧٣ عومەری برام ناوی هاتەوە بۆ سەربازی زۆری پێخۆش بوو، چونکە لە کاری لادێ نەجاتی دەبوو کە زۆر بێزاری کرد بوو، کە ناو خوێندرایەوە لە تەجنید لە بری ناوی ئەو ناوی یەکێکی تریان خوێندەوە بە ناوی عومەر عەلی مەحمود لە بری محەمەد، پێمووت: عومەر دابەزە ناوی تۆ نییە، پێیوتم: بڕۆ چنارەکان باش ئاو بە من نەجاتم بوو! ؟ دوای کێشمەکێشمێکی زۆر لە نێوان تەجنیدی سلێمانی و مەرکەز تەدریبی ناسرییە ناوی بۆ چاك نەکرا کە ئەم سەربازە بە هەڵە براوە بۆ ئەوێ! ؟ جار جار کەمالی مەلا محەمەدی ئامۆزام بە پاسکیل دەیبرد بۆ وەزارەتی بەرگری بۆ ئەوەی بزانێت ئەم ناوە هەڵهاتووە یان سەربازە، بۆمان ساغ نەبووەوە، دۆستێکمان هەبوو ناوی رەئوف رەشید بوو، لە تەجنیدی سلێمانی ڕائید بوو، پێیووتین ئەمە زوو چارەسەر

نابێت بە عایدون تەسریحی دەكەم باشترە لەم هاتووچۆیە، دوو ساڵ سەربازی بۆ كەسێكی تر كرد بێ بزر بوون، بەڵام دوایی بە عایدون تەسریحمان كرد.

لە ساڵی ١٩٧٤ پارتی شاری چۆڵكرد ئێمەش بارەگامان كردەوە لە كانێسكان كە ئاشكرابووین، بووین بە سرییەكی سەربازی عەلی ساڵح لێپرسراوی بوو، منیش لێپرسراوی سەربازی سەرچنار بووم، محەمەد قرگەیی لێپرسراوی سەربازی سەیوان بوو خوا لێیانخۆش بێت. لە سلێمانی كۆمەڵێك قەرەچەتانی شیوعی بوون وەكو من و حەمە سۆیلەی ئامۆزام و نوری حاجی گورون و جەعفەر حسەین و مستەفای ئامۆزام، لە قەرەچەتانیش كۆمەڵێك شیوعی بوون وەكو خالید حاجی حەسەن و هارونی مام عومەری ئامۆزام لە گەبەش رەفیق حمەمین و شەهید حەسەن كاكل و لە قەمچۆغەش عومەر مەلا عارف و عەبدوڵڵا عارف و صدیق ئەحمەد، لە سوسێش برادەرێك هەبوو ناوی بەكر بوو كە مدیر مال بوو، ئەم برادەرانە هەمیشە بەر شاڵاوی گرتن و ئازاردان دەكەوتن، ئەو ساڵە بورهان ئەحمەد سەرباز بوو رایكرد هات بۆ لای ئێمە لە سەرچنار.

لە ساڵی ١٩٧٤ لە سەرچنار بووین، كۆمەڵێك كرێكاری كارگەی چیمەنتۆ كە چەكدار بوون بۆ بەرگری كارگەكە هاوكاری ئێمە بوون، وەكو شێخ جەمیل و سەعید موزەمید و عەلی سعید و نوری رەباتی و مەلا عومەر، دوایی مونەزەمە و شورتە هاتن بە هۆی ئێمەوە، ئێمە لەگەڵ بەعسییەكان كە لەوێ بوون چەند جارێك بوو بە شەڕمان،ماڵێك هەبوو لەوێ لەگەڵیان بوون، لەگەڵ نوری رەباتی و خەباتی شێخ حەسیب ببوو بە شەڕیان، هاتن بۆ گرتنیان ئێمەش نەمانهێشت، دوایی هەر دەیانویست بیانبەن ئێمەش بارەگای مونەزەمان دایەبەر گوللە و ئەوان هیچیان

لەگەڵ ئێمە پێنەدەکرا، دوایی لیژنەی جەبهە هات لای حیزبی شیوعی سعدالله و لای بەعسیش ڕائید قەفتان کە پیاوێکی میانڕەو بوو، رائید قەفتان پێیووتن: ئەگەر لەگەڵ ئەمان هاوکار نەبن ئێمە ئێوە لێرە دەکشێنینەوە، بە هۆی ئەوەوە خەبات و بەهات و ئازاد و عاصی منیان خۆشدەویست کە چەند خوێندکارێکی توندڕەو بوون، زۆر رقیان لە ئەمن بوو ئێمەش دەمانویست شت روونەدات.

لە زستانی ساڵی ١٩٧٤ لە سەرچنار لەگەڵ شێخ جەمیل و نوری رەباتی دەرچووین کەوتینە کەمینەوە، بەڵام من خۆم بە پشتدا خست و کەوتمە خەندەقی خانوویەکەوە و دەستم کرد بە تەقە و شێخ جەمیلیش لە دووامەوە دەستی کرد بە تەقەکردن، ئەوان بە ئاربێجی لێیان داین ئێمە هەر ئەو سێ کەسە بووین ئەوانمان راوناو بەبێ زیان گەڕاینەوە، برادەران زۆر لایان سەیر بوو کە ئێمە بێ زیان لەو کەمینە دەرچووین.

لە زستانی ساڵی ١٩٧٤ هاتنەسەر ماڵی مەلا عومەر چەرمەگایی کە موختاری سەرچنار بوو، من چووم لەگەڵ دوو برادەری تر تەقەمان لە سەری کرد نەمانهێشت بیبەنە دەرەوە، ئەوکاتە لیژنەی قەزای سەرچنار زۆر هاوکار بوون، ئێمەش ئەوانمان دەپاراست، ئەو برادەرانەی کە زۆر هاوکارمان بوون شێخ جەمیل و نوری رەباتی و شێخ حەسیب قەرەداغی و خەباتی کوڕی و عاصی نوری و دکتۆر سعید و عومەر بلیس و هاوڕێ رەئوف و حەمە بچکۆل و کەریمی کارەبا و هاوڕێ تۆفیق و شێخ محەمەد و حاجی حەمە خورشید، ئەم برادەرانە لەگەڵمان هاوکار بوون بۆ پاراستنی کارگەی چیمەنتۆ، کە زۆربەیان لە ژیاندا نەماون خوا لێیانخۆش بێت.

لە ساڵی ١٩٧٤ جارێك لە بارەگای سەرچنار گوللەیەك بەر قۆڵم کەوت دەمارەکەی بڕیبوو، زۆر بە زەحمەت چاك بووەوە، سەردانی عەبدولرحمان ریسم کرد وتی: دەبێت بچیت بۆ بەغداد. وتم: باشە، لەگەڵ جەلال عەلی و حسەین مەرجان کە خەڵکی هەڵەبجە بوو بۆ بەغداد چووم، نووسراوی حیزبم پێبوو، بۆ بەیانی حیزب بردمی بۆ مسوتەشفای جوملەی عەسەبی، کە سەعد وەتەری مدیری بوو، نامەیەکی دکتۆرە نەزیرە دلێمیم پێبوو، لەوێ وتی: دەبێت زوو نەشتەرگەری بکرێیت لەبەر ئەوەی دەمارەکەی بڕیوە، ئەگەر زوو نەشتەرگەری نەکرێیت دەستت لە ئیش دەکەوێت، لە نەخۆشخانە هێشتمییەوە کەسم لا نەبوو زۆر دڵتەنگ بووم، ئەو ڕۆژە بۆ بەیانی نەشتەرگەری بۆ کردم، دکتۆر تاریق کورد بوو زۆر بەزەیی پێمدا دەهاتەوە، کەس نەدەهات بۆ لام، لە ژورێك خەواندمی کە محامییەکی پیری لێبوو ناوی محەمەد بابان بوو، کە خەڵکێکی زۆر سەردانی دەکرد، شەش ڕۆژ مامەوە کەس نەهات بۆ لام، هەر دەبوایە ئەو دوو کەسە بهاتایە بۆ لام، بەیانییەك دکتۆر تاریق هات بۆ لام وتم: دەرمکە. وتی: دەبێت چەند ڕۆژێکی تر بمێنیتەوە ئەگەر خزمت هەیە لێرە بچۆ بۆ ماڵیان دوو ڕۆژی تر وەرەوە وتم: دکتۆر خزمی چی خەریکە شێت بم، بە زۆری خۆم دەریکردم، بۆ ئێوارە گەیشتمەوە سلێمانی وتیان: خۆ تەقەڵەکانت دەرنەهێناوە چۆن هاتیتەوە؟! وتم: لە خەستەخانە خەریك بوو شێت بم، چونکە ئەو نەخۆشخانەیە بەزۆری شێتی لێبوو، ئەوەی نەخۆشی ئەعصابی هەبووایە لەوێ چارەسەر دەکرا، شێتێکی لێبوو ناوی یوسف بوو، مەسیحییەکی لای موصل بوو کوردی دەزانی، هەر ساتەساتێك دەهات دەیووت: دەڵێی بتکوژم، بە دکتۆر تاریقم وت: ئەو شێتە وام پێدەڵێت! لەوناوە دووری خستمەوە

ئیتر نەمدییەوە، دکتۆر تاریق نەجاتی دام لەو شێتە، دوای سێ ڕۆژ چوومەوە تەقەڵەکانی دەرهێنا بۆم و ئیتر لە بەغداد نەجاتم بوو وێران بێت وەکو وێران بوو.

لە ساڵی ١٩٧٥ لەگەڵ نوری حاجی گورون بۆ قەرەچەتان دەچووین، لەوێ شانە هەبوو کۆبوونەوەمان پێدەکردن، عومەر مام ڕەسوول ئەندام بوو ئامۆزای هاوڕێ نوری بوو، ژنەکەی هات لێمان تووڕە بوو هات بە کژماندا وتی: واز لە کوڕکانمان بێنن با کاسپی خۆیان بکەن، هاوڕێ عومەر لێیتووڕە بوو بێ دەنگی کرد، ئەو شەوە لە ماڵی خەسرەوی کوڕی هاوڕێ نوری ماینەوە، بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، ئیتر من لەگەڵی نەچووم خۆی چووبوو بۆ قەمچۆخە و گوندەکانی تر. لەوکاتەدا بەعس کەوتبووە دروستکردنی ڕێکخستن لە ڕێگەی جووتیارانەوە، زۆر بە زیرەکانە لە گوندەکان کاریاندەکرد، کۆمەڵەی مارکسی و لینینی ڕێکخستنیان هەبوو چالاك بوون زۆر بە وریایی کاری خۆیان دەکرد.

لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ نوری حاجی گورون کە لێپرسراوی دوکان بوو، چووین بۆ بەسەرکردنەوەی ڕێکخستنەکان لەناو گوندەکان، چووینە گەبە کە شانەیەکی حیزبی لێبوو بە ناوی شانەی تۆکمە، شانەکە لەم کەسانە پێکهاتبوو: ڕەفیق حەمەمین، حەسەن کاکل، حەمەلاو حاجی کاکەمەند، خەلیل حەمەمین، غەریب محەمەد قادر، دواتر چووینە گولیجە شانەی گولیجەیان هەبوو، لەم کەسانە پێکهاتبوون: محەمەد مەلا کەریم، ڕەفیق کەریم سەرکار، جەمال قادر. بۆ ئێوارە هاتینە کۆکە ماڵی کەریم زینەت لەوێ بوو کە خزمی هەردووکمان دوو، چووینەسەر کانی و ئاوەکە شەهید حسەین مەولود ناسراو بوو بە مەلا عەلی لەگەڵ ئەحمەدی برای

لەوێبوون، پەیوەندییان بە کۆمەڵەوە هەبوو دەستمان کرد بە گفتوگۆ، لە کاتێکدا کۆمەڵە حیزبی شیوعی بە لادەر دەزانی، چونکە لەگەڵ بەعسدا لە بەرەیەکدا بوون، شەهید مەلا عەلی بە کاك نوری وت: باوەڕناکەم تۆ لە شیوعییەت تێگەیشتبیت! لەبەر ئەوەی دوو ژنت هێناوە و لە ریبازی مارکسیدا نەگونجاوە، کە ژنێکیانت ئامۆزای خۆتە بە پێنج منداڵەوە بەجێتهێشتووە، حاجی نوری تووڕە بوو قسەی پێووتن، لەبەر ئەوەی تەمەنیان کەمتر بوو قسەیان نەکرد، بۆ شەو چووینە ماڵی کەریم زینەت و بۆ بەیانی گەڕاینەوە.

لە ساڵی ١٩٧٥ لە دائیرەی رەی سلێمانی لە جۆگەی ئاوبارە عەباس رۆستەم دایمەزراندم، وەزعم باش بوو، لەگەڵ دارای ئامۆزام بیکاپێکم کڕی بە ١٥٠٠ دینار، پیکابێکی زۆر چاك بوو، ماوەیەك پێکەوە بووین لە ساڵی ١٩٧٦ خەریکی مۆڵەتی شۆفێری بووین من و دارا و حەسەنی ئامۆزام و رەئوفی شێخ عەتار عەوەڵانی کە دوعای بۆ خۆی دەکرد بۆ ئێمەشی دەکرد؟! هەرچۆنێك بێت مۆڵەتی شۆفێریمان لە ٤ / ٨ / ١٩٧٨ وەرگرت. دارا شۆفێرێکی باش بوو، بەڵام من و حەسەن فێر نەبووین، من لەگەڵ دارا دەگەڕام بۆ ئەوەی بیداتە دەستم، بەڵام بە هیچ جۆرێك نەیدەدایە دەستم، رۆژێك لە دوکان بووین پیاوێك هەبوو ناوی عەزیز بوو شۆفێرەکەی رۆیشتبوو دەگەڕا بە شوێن شۆفێردا من پێمووت: شۆفێرم. وتی: بارم بارکردووە بۆ کەرکوك بابڕۆین، سەیارەم لێخوڕی رۆیشتم، دارا نەیزانی بوو بۆ کوێ چووم، هەواڵی پرسی بووم پێیانووتبوو: سەیارەی عەزیزی لێخوڕیوە بۆ کەرکوك، داراش زۆر دڵگران بوو وتبووی: ئەی هاوار ماڵی نەوێرانم بەخوا وەریدەگێڕێت! من سەلامەت دەرچووم. ماوەی هەفتەیەك لەگەڵی بووم تا شۆفێری پەیداکرد، بەهۆی ئەوەوە بووم بە شۆفێرێکی باش.

لە دوای نسکۆی ١٩٧٥ دووبارە بە لێبووردنی گشتی لە سەربازی بەخشراین، بەڵام ئێمە وامانزانی رژێم حیزبی شیوعی لە پارتی جیادەکاتەوە، لە کاتێکدا لەگەڵ حیزبی بەعسدا لە جەبهە بووین پێیانووتین: ئێوەش هەر کوردن ئەو لێبووردنە ئێوەش دەگرێتەوە و بۆ هەموو لایەنە سیاسییەکانە لە کوردستان، ئێمەش کۆبووینەوە و چووین بۆ فیرقە زوو کارەکانیان بۆ تەواو کردین، پوولیان لە دەفتەر خدمەکانمان دا و بە عایدون ئیمزایان کرد و چەند مانگێك بە چەکەوە گەڕاین، دوایی فەرمان لە حیزبەوە دەرچوو کە نابێت بە چەکەوە بگەڕێن تەنها پاسەوانی بەردەم بارەگاکان نەبێت، وردە وردە حیزبی شیوعیش لە چەك داماڵرا، ئێمەش کۆمەڵێك هاوڕێ بووین وەکو نەسردین و مەلا عەلی و حەمە سۆیلە ویستمان چەك بشارینەوە، بەڵام حیزب رازی نەبوو. ئەو چەکانەی شارابوونەوە کەریم ئەحمەد هەمووی کۆکردەوە و بە رژێمی سپارد بەداخەوە، چونکە ئەو چەکانە ئەگەر بمانایە سوودی زۆری دەبوو بۆ حیزب لە کاتی تێك چوونی جەبهە و دروستبوونی خەبات دژی رژێمی بەعس.

لە ساڵی ١٩٧٥ باوکم چایخانەیەکی لەبەر مزگەوتی گەورە کڕی کە خۆی سەرپەرشتی دەکرد و کابرایەك بە ناوی شێخ مەحمود کە خەڵکی سەرگەڵوو بوو، پیاوێکی هەژار و پیاو بوو، ببوو بە هاوبەشی باوکم، ناپیاوێکی ئەمن بەناوی عوسمان هاتبوو سەرانە لە باوکم و شێخ مەحمود بسەنێت، شێخ مەحمود رازی ببوو لای گران نەبوو، بەڵام باوکم زۆر لای گران و ناخۆش بوو بە منی وت: ئەم پیاوە شێتە هەموو رۆژێك دێت نان و ماست دەخوات و پارە نادات و داوای پارە دەکات وتم: حەقت نەبێت بەس نیشانم بدە هیچی تر، چووم بۆ ئەوێ و هات، چوومە لایەوە

نه‌یزانی كوڕی حاجی عه‌لیم، داوای نان و ماستی كرد، منیش بۆ ئه‌وه‌ی بیانووی ببڕم قسه‌م نه‌كرد تا ده‌ستیكرد به‌ نان و ماست خواردن. وتم: قووزه‌ڵقورت بخۆیت تۆزێ ورد بووه‌وه‌ و ته‌پڵه‌كێكی ئاسنم هه‌ڵگرت و دام به‌ سه‌ریدا و ده‌ستمكرد به‌ لێدانی و رامكرد، پۆلیس به‌ دوامدا ده‌گه‌ڕا له‌ بری من باوكمیان گرتبوو، ئامۆزایه‌كم له‌وێبوو ناوی یاسین بوو دوای من چوو بوو كه‌ پۆلیسی دیبوو له‌گه‌ڵ باوكم چووبوو بۆ باره‌گای پۆلیس وتبووی: ئه‌و حاجییه‌ هیچ گوناهی نییه‌ من له‌وێ بووم پیانووتبوو: ده‌بیت به‌ كه‌فیلی حاجی؟ وتبووی: به‌ڵێ. كاك یاسینیان كردبوو به‌ كه‌فیلی باوكم و باوكمیان ئازاد كردبوو، ئێواره‌ باوكم هاته‌وه‌ زۆر دڵی خۆش بوو كه‌ عوسمان لێدانی خواردووه‌.

له‌ دوای ساڵی ١٩٧٥ له‌ كاتێكدا گولله‌ به‌رقۆڵم كه‌وتبوو هه‌وڵم ده‌دا پێی خانه‌نشینی سه‌ربازی بكرێم، له‌گه‌ڵ عه‌بدولكه‌ریم حمه‌عه‌زیز كه‌ كوڕێكی له‌گه‌ڵ قاله‌ ته‌گه‌رانی له‌ ناوچووبوو، دایاننناین بۆ لیژنه‌، له‌ به‌غداد به‌ لیژنه‌ هیچمان بۆ نه‌كرا، له‌به‌رده‌م خانه‌نشینیی پیاوێكی پیرمان دی كه‌ كورد بوو وتی: ئه‌وه‌ مقۆمقۆی چیتانه‌؟ من وتم: قۆڵم شكاوه‌ و ئه‌ویش كوڕی كوژراوه‌. وتی: من بۆتان ده‌كه‌م، زۆرباش بۆی كردین به‌ زۆر كه‌س نه‌ده‌كرا، چوو داوای كرد و لیژنه‌ی بۆمان دووباره‌ كرده‌وه‌ و كاتی چاوپێكه‌وتنی بۆمان دانا، دواتر وتی: شه‌و له‌ كوێ ده‌بن بۆ خه‌و؟ وتم: له‌ ئوتێل سه‌رچنار ده‌بین. وتی: باش، كاتژمێر ٣ دێم بۆ ئه‌وێ ئه‌وه‌ی له‌ لیژنه‌كه‌یه‌ ده‌یهێنم بۆ لاتان، دوای كاتژمێر ٣ هات پیاوێكی بالأبه‌رزی له‌گه‌ڵ بوو، ناوی ره‌مه‌زان تكریتی بوو وتی: ١٠٠ دینار له‌ هه‌ردووكتان وه‌رده‌گرم ئیشه‌كه‌تان بۆ ده‌كه‌م. وتمان: باشه‌، به‌ پێی ئه‌و رێككه‌وتنه‌ خانه‌نشینی كردین كه‌ جاری دووه‌م چووینه‌وه‌ بۆ

مامەڵەی خانەنشینی کەومان برد لەگەڵ خۆمان، پێیووتین: ئەمە دایکەیە یان باوکەیە؟ وتمان: نێرەکەوە و بە کەوی مێ دەڵێن ماکەو.

لە ساڵی ١٩٧٦ کوێخا جەمال صالح پەیوەندی کرد بە حیزبەوە، کە پێشتر محەمەد ئەمین فەتحە و مەلا عومەر پەیوەندییان کردبوو، من چووم بۆ چەرمەگا دکتۆرێکی عەرەب لەوێبوو ناوی مەحمود بوو، پەیوەندی هەبوو بە حیزبەوە، لەبەر ئەوەی نەبوو بوو بە بەعسی لە باشووری عێراق دوور خرابووەوە، من هاموشۆم دەکرد و راپۆرتم لێوەردەگرت.

لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ عەلی حاجی شەریف ناسراو بە عەلی سمێڵ کە ژنبرام بوو، چووین بۆ کەربەلا بۆ سەردانی ماڵی قەدری خوشکی، کە دابەزیتین عەسر بوو عەلی تەنگاو بوو وتی: چی بکەم؟ وتم: بچۆ پەنا ئەو سەیارەیە ئیشی خۆت بکە، چوو لەوێ پشووی خۆی وەرگرت، کابرای خاوەن سەیارە هات وتی: ها یابە شتریت تفەزەڵ؟ وتم: یەڵا ئەخی های سەیارە سعر بێش؟ وتی: ئەخی شلۆن روح شلۆن هیچی معامەلە؟ ئێمەش وتمان: فیمانیلا یابە! دوای ئەوەی عەلی ئیشی خۆی کردبوو بەرەو ماڵی خوشکی بەڕێکەوتین.

لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ عەبدوڵڵا هەولێری چووین بۆ شارەوانی سلێمانی بۆ پڕکردنەوەی تەندەر بۆ نۆژەنکردنەوەی خوێندنگەکانی گوندەکانی ناوچەی دوکان، پاش پڕکردنەوەی تەندەر بۆمان دەرچوو، من هەر خوێندنگەی کلکەسماقم هەڵبژارد، دەستمانکرد بە نۆژەنکردنەوەی، لەبەر ئەوەی دارای ئامۆزام پیکابی هەبوو بلۆك و سپیدارمان پێ بار دەکرد، لەگەڵ خوالێخۆش بوو کاك عەبدوڵلا گەلێك شەو دەماینەوە، ئەو خزمانەی ئەوێ قامیشیان بۆ دەهێنام، سوودێکی باشمان لێکرد، خوێندنگەکانی ترمان دایەوە بە خەڵکی تر بە سوود.

لە ساڵی ١٩٧٦ لە دائیرەی رەی سلێمانی چاودێر بووم، ئەوانەی گەڕابوونەوە بۆ دائیرە پاش ئەوەی چووبوونە دەرەوە لە ساڵی ١٩٧٤ لەبەر دەم بەعسییەکاندا چۆکیان دادا و زۆر لاواز بوون، کەمال قەزاز گەڕابووەوە ببوو بە بەڕێوەبەری دائیرەکە، دەیویست لای بەعسییەکان خۆی خۆشەویست بکات هەموو شۆفێر و کارمەندانی دائیرەکەی کۆدەکردەوە و ناو دائیرەکەی پێ پاك دەکردنەوە، رۆژێك لەوێ وەستا بووم هات بۆ لام وتی: بۆ ئیش ناکەیت لەگەڵیان؟ منیش پێمووت: ئەوە ئیشی من نییە، وتی: من بەڕێوەبەرم پێتدەڵێم بچۆ ئیش بکە. منیش پێمووتەوە: پێتدەڵێم ئەوە ئیشی من نییە! چووە ژوورەوە فەرمانی دەرکردنی بۆ دەرکردم، منیش یەکسەر چوومەوە بۆ ماڵەوە، کاك عەباس رۆستەم و کاك حەمە شوکر چووبوون بۆ لای وتبوویان: ئەو پیاوە هەموو گیانی گوللەیە ناتوانێت ئیش بکات، دواتر جۆرج کە ئەندازیارێکی مەسیحی بوو چووبوو بۆ لای کە بەعسی بوو، پێیووتبوو: دەری مەکە و لەگەڵ ئەومان پێناکرێت، لە شانە چەکدارەکانی حیزبی شیوعییە، لە خۆتی مەشێوێنە!؟ ئێمە پێمانووتووە کرێکار بێنە بۆ خۆپیشاندان یەك کرێکاری نەهێناوە. دوای ئەوە فەرمانی بۆ دەرکردم بە گەڕانەوەم، کاك عەباس و کاك حەمە شوکر و جۆرج هاتن بۆ لام وتیان: پەشیمانبۆتەوە بابچین سەردانی بکەین، منیش قسەی ئەوانم نەشکاند چوومەوە و تەوقەم لەگەڵی کرد و پێیوتم: ببوورە نەمزانی کە تۆ ئەندامی حیزبی شیوعیت، دواتر گەڕامەوە سەرکار و خۆی تێمنەدەگەیاند هەر چییەکم بکرتایە.

لە زستانی ١٩٧٦ خزمێکی سەرمۆرد هات بۆ لام ناوی مام ئەبوبەکر بوو وتی: بزانە لە دائیرەی غابات دامنامەزرێنیت، لە کاتێکدا کارگەی بلۆکم هەبوو لە تەنیشت ماڵی بەڕێوەبەری غابات کە ناوی ئەحمەد خولام بوو بەعسی بوو، بەڵام ببوو بە برادەرم لە نزیك مزگەوتی حاجی جەمال، منیش پێمووت: بزنە کێوییەك بێنە و دەچین بۆ ماڵیان، بۆ بەیانی بە کاك ئەحمەد غولامم وت: خزمێکم دەیەوێت ببێت بە پاسەوانی غابات لای تۆ، راوچییەکی باشە و بزنێکی جوانی لایە بۆ باغەکەت. وتی: باشە، بیهێنە بۆ لام. منیش بردم بۆ لای کاك ئەحمەد خۆی و بزنە کێوییەکەی، لەوکاتەدا بزنەکە ئاوس بوو کاك ئەحمەد وتی: کاتی بوونی دەبێت، خاتوونە بێنیت بۆ مامانییەکەی!؟ بەوجۆرە مام ئەبوبەکر دامەزرا.

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ عەلی حاجی شەریف لە ماڵی حاجی محەمەدی قرگە بانگهێشتی نانخواردن کرابووین، هاوینێکی گەرم بوو، ئوتۆمبیلمان دەستنەکەوت بە پێ چووین، دوای نانخواردن و پشوو گەڕاینەوە بۆ ناوبازار، لە بەردەرکی سەرا دۆندرمەمان خوارد، لە دوکانەکە یەکی زیاتر لە پێنج پەرداخ ئاومان خواردەوە، برادەری دۆندرمەفرۆش پێیووتین: چیتان خواردووە وا تێر ئاو نابن، ئێمەش وتمان لە قرگەوە بە پێ هاتووین، بەڵام هی رێگاکە نییە هی خواردنەکەیە، دەبووایە ئەو گەرما و رێگایەمان لەبەرچاو بووایە!؟ عەلی بە شاگردەکەی وت: پەرداخەکان بنەکەی شکاوە و ئاوی تێدا ناوەستێت.

لە رێکەوتی ١٣ / ٩ / ١٩٧٦ شێخ محەمەدی نانەوا کە خەڵکی سورداش بوو گیرا و لە لایەن دائیرەی ئەمنەوە بێ سەر و شوێن کرا، خوشکەکەی چوو بوو بۆ بارەگای حیزبی شیوعی بۆ هەواڵپرسینی

براکەی پێیانووتبوو: کاك شێخ لەگەڵ حیزب نەماوە، دوای ماوەیەك تەرمەکەی لە دەرەوەی شار لای کانی شەکراوی نزیك گردی سەلیم بەگ دۆزرایەوە، زانیمان لە ژێر ئەشکەنجە شەهید بووە، دوای دۆزینەوەی تەرمەکەی دەرکەوت کە پەیوەندی بە کۆمەڵەی مارکسی لینینییەوە کردبوو وازی لە حیزب هێنابوو، پێش وازهێنانی لە حیزب کەسایەتییەکی ناسراو بوو بە ئازایەتی و کاری حیزبییەوە، ئەم شێخ محەمەدە خەڵکی حاجی مامەند بوو، لەسەر شوعییەت دوور خرابووەوە و هاتبوو بۆ سورداش خۆی بە کاری نانەواییەوە خەریك کردبوو.

لە ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ دارای ئامۆزام پیکاپێکمان کڕی بە هاوبەشی شتی زۆر سەیرمان دەکرد و دەبینی، چونکە ئامۆزای یەك بووین و ئەو شۆفێری چاك بوو من باش نەمدەزانی، بەڵام لەبەرئەوەی نیوەی هی خۆم بوو هەمیشە لەگەڵی بووم، دەچووین بۆ شارەزوور شووتیمان دەهێنا پیکابی بە ٣ دینار، جاری وا هەبوو ٧ دیناری دەکرد. لە کێڵگەی برادەرێك شووتیمان بۆ بار کرد بۆ سلێمانی لەگەڵ خوشکەکەی کە ناوی خاوەر بوو هاتن لەگەڵمان، خوشکەکەی ئێمەی بە شاری دەزانی گاڵتەی پێماندەکرد ئەیووت: پیاوێکی لادێی لەگەڵ پیاوێکی شاری شەڕی کردبوو، پیاوە لادێییەکە بەردێکی گەورەی هەڵگرتبوو ویستبووی بیدات بە سەری پیاوە شارییەکەدا، ئەویش پێیووتبوو: کوڕە ئەو بەردە زۆر گەورەیە نەیهاوی! پیاوە لادێییەکە دەستیکردووە بە پێکەنین. ئیتر خوشکە خاوەر بەوشێوەیە قسەی بۆماندەکرد منیش پێمووت: ئێمەش وەکو ئێوە لادێیین، بۆچی گاڵتەمان پێدەکەیت؟ پێیووتین: ئێستاماڵتان لە کوێیە؟ پێمانووت: سلێمانی. پێیووتین: دەماودەم زانیومانە سلێمانی لە بەردی زل دەترسن؟! منیش

پێمووت: وەرە بەردێکی زلم تێگرە بزانە دەترسم؟ دەیووت: ئاخر دەبێت بە شەڕمان پێتئەوێرم، ئەگەر رقم هەڵسێت بەردت تێدەگرم. داراش هات وتی: ئەوە موناقەشەی چیتانە لەگەڵ خوشکە خاوەر، پێمووت: ئێمە بە شاری دەزانێت دەمانترسێنێت، منیش پێیدەڵێم: ئێمە لادێین شاری نین.

هەر ئەوکاتەی شووتیمان دەهێنا بۆ عەلوە، رۆژێك لەگەڵ دارا تووشی شەڕ بووین لەگەڵ هەموو عەلوە! فریای ئەوە کەوتم شیشی ئاسنی دوای پیکابەکەم دەرهێنا و لە هەر چییەکم بدایە هەڵنەدەستایەوە، دارایان برد بۆ دەرکی عەلوە و منیشیان برد بۆ سەرەوە، ئەحمەد عەبدوڵڵای قەرەچەتانی لێبوو خەریکی شت کڕین بوو، لە قەرەچەتان لە شەڕەتاوێردا ئازا بوو، بەڵام ئەوجارە زۆر ترسا و ئەویش لە دارای دەدا دەیووت: تۆ بۆ لەسەر حەمەکەریم ناکەیتەوە، ئێمە شڕەمان لەبەردا نەمابوو، کەچی ئەو لەسەری نەکردینەوە! دوای چەند کاتژمێرێك پۆلیس هات کە سەیری ئێمەی کرد شڕەمان لەبەردا نەماوە پێیووتین: سکاڵاتان لەسەر کەس نییە؟ ئێمەش ناوی کەسمان نەووت، چونکە ناوی کەسمان نەدەزانی و تەنها دەمانووت: لەسەر عەلوە سکاڵامان هەیە، چونکە هەموو عەلوە بەشداربوون لە لێدانمان، هەرچەندە جێگە دەستی ئێمە دیار بوو لە شکاندنی سەر و دەست و قاچیان، بەڵام لەبەر ئەوەی زۆر بوون نەمانتوانی زەوتی هەموویان بکەین.

لە ساڵی ١٩٧٦ لەگەڵ فتاح مەجید گەبەیی دوکانێکمان هەبوو لای ماڵی حاجی دەروێشی قەصاب، هی سابیر ناوێك بوو خەڵکی کۆسەی چەم بوو، ماوەم نەبوو ئیشی تێدا بکەم و دابووم بە حەمە رەزا رەشید کە قەرەچەتانی بوو، لەگەڵ نیعمەت فارس کاریان تێدا دەکرد، بەپێی

یاسا نەدەبوایە دوکان بدەیدەوە بە کەسێکی تر بە بێ پرسی خاوەن دوکانەکە، سابیر شێخ سالاری حەفیدی کردبوو بە پارێزەری خۆی دەیووت: هەر دەبێت چۆڵی بکەیت، بەڵام من چۆڵم نەکرد، دادگا بڕیاریدا کە چۆڵی بکەم، چووشم بۆ لای باوکی، بەڵام بێسوود بوو دەیووت: تۆ شیوعیت ملکی خەڵك داگیر دەکەیت، ناچار چۆڵمکرد، بەڵام زۆر بە ناخۆشی.

تا ساڵی ١٩٧٧ لەگەڵ دارا و حەسەنی ئامۆزام کاسپی سەیارەمان دەکرد وەزعێکی باشمان هەبوو، لەگەڵ دارا جیابوومەوە و خۆم موسکۆفیچێکم کڕی لەناو شار ئیشم پێدەکرد، دواتر حەسەن بێ ئیش بوو وتم: با پیکابێکی هەرزان بکڕین، بیکاپێك دەزانم هەرزانە با بیکڕین پێکەوە، رێککەوتین چووین کڕیمان بە ٨٥٠ دینار، تۆزیك دەستمان پێدا هێناو لە ئیشدابوو، لەوکاتەدا لە قەڵاچوالان خانوو دروستدەکرا، لەگەڵ شۆفێری تردا دەچووین بەیانیان کرێکارمان دەبرد بۆ ئەوێ و ئێواران دەچووین بە شوێنیاندا و دەمانهێنانەوە، کارێکی زۆر باش بوو، منیش بووم بە شۆفێرێکی زۆر باش و کاك حەسەن شۆفێری باش نەدەزانی، بەڵام لەگەڵم بوو، من وەکو دارا نەبووم حەزم دەکرد فێری شۆفێری ببێت، دوای ئەوەی فێری شۆفێری بوو سەیارەم دەدایە دەستی خۆی لێیدەخوڕی و لە پیکابەکە پێکەوە هاوبەش بووین، دوایی من باصێکی پۆڵەنیم کڕی و وەرمگێڕا! دارا هات بۆ لام وتی: باش فێری شۆفێری نەبوویت، دوو جار ئەو بردی بۆ کەرکوك، ئەویش نیوە وەرگێڕانێك وەریگێڕا!؟ ئیتر دارا نانی پێدانام کە منیش بووم بە شۆفێر. باصەکەم لە هێڵی گواستنەوەی شێخ محێدین دانا و نیوەی باصەکەم بە رەحمانی کوڕی حاجی محەمەدی جەرمەگا فرۆشت، کە دایکی حاجی محەمەد

خزمی خۆمان بوو، كاك رەحمان لەسەر باصەكە ئیشی دەكرد، منیش مۆسكۆفیچێكم لە نوری حاجی گوورون كڕی كە مۆدێلی ١٩٧٥ بوو وەزعمان زۆر باش بوو، بەڵام حیزبی بەعس لێمانكەوتبووە تەقە دەیانویست بمانكەن بە پیاوی خۆیان. پێشمەرگە دروست ببوو من جارجار لەگەڵ نوری حاجی گورون سەردانی ناوچەی دوكانمان دەكرد، بەڵام كەس باوەڕی بە حیزب نەمابوو، چونكە زۆر لە رژێمی بەعس دەترسان و پارتی تووشی نسكۆ ببوو، بەڵام كۆمەڵەی ماركسی لینینی دروست ببوو، لەناوشار و لە دەرەوەی شار رێكخستنی دروست كردبوو، خەڵك تاكە ئومێدیان بە كۆمەڵە هەبوو بە رووناكییان دەزانی.

لە ساڵی ١٩٧٧ حاجی هیدایەت هات بۆ لام وتی: ئەو نازل تەعاونییەی لە حەسەن تەپەیە دەڵێن خزمی تۆیە؟ وتم: بەڵێ، ئەوە عەبدوڵڵای ئامۆزامە. وتی: پێشمەرگە بە نیازن بیڕفێنن! ماڵەكەی لە حەسەن تەپەیە و مەڕێكی زۆری لایە هی تەعاونییە، لەوێ با بار بكات، منیش سوپاسم كرد و چووم بۆ حەسەن تەپە بە پیكابەكەی خۆم بە عەبدوڵڵای ئامۆزامم وت: ماڵەكەت بێنەرەوە بۆ سلێمانی و خۆت رۆژانە هاتوچۆ بكە و بچۆ و وەرەوە، ئەویش پێی باش بوو چوو لە شێخ محێدین خانوی گرت و منیش بە پیكابەكەم ماڵەكەیم گواستەوە بۆ شێخ محێدین. دوای ئەوە رۆژانە دەچوو بۆ حەسەن تەپە و گوندەكانی تری سەر بە ناحیەی سەرچنار و ئێوارە دەگەڕایەوە بەبێ ئەوەی تووشی كێشە بێت، كاك عەبدوڵڵا لێپرسراوی كشتوكاڵ بوو پێیاندەووت: نازل تەعاونی، لە كاتێكدا بەڕێوبەرایەتی كشتوكاڵ پرۆژەی ئاژەڵداری و دەواجینی هەبوو، نازل تەعاونییەكان سەرپەرشتییان دەكرد.

لە ساڵی ١٩٧٧ بیجۆیەکی ٤٠٤ ی فەرەنسیم لە بەغداد کڕی رەنگی شینی قەزوانی بوو، ئێوارەیەك چووم بۆ مەیدانی ماستەکە و بیجۆکەم راگرت و چوومە دوکانێك بۆ جامانە کڕین، لەو سەردەمەدا جامانەی نەجەفی باوی بوو، بە دوکاندارەکەم وت: جامانەیەکی نەجەفیم بدەرێ، کابرا کە بیجۆکەی بینی وتی: کاکە تۆ تا دەمری جامانە دەبەستیتەوە وتم: بەڵێ.. لە بەرنامەمدا نییە سەر رووت بکەم. وتی: کاکە تۆپێك جامانەم لاماوە وەرە بیکڕە دوایی نامێنێت و پەکت دەکەوێت. وتم: کاکە تۆ گاڵتەم پێ دەکەیت! ؟ وتی: نەوەڵا.. کارگەکەی لە بەغداد داخراوە و نامێنێت. منیش وتم: باشە دوو جامانەم بدەرێ کە بایی یەك دینار و نیو بوو. دوای ئەوەی بووم بە پێشمەرگە ناردم کە جامانەم بۆ بنێرن وتیان: کارگەکەی داخراوە و نەماوە، لەوکاتەدا جامانەی نەجەفی نەمابوو، تەنها جامانەی کۆری هەبوو کە نرخەکەی ٢٥ دینار بوو، وتم: بە خوا دوکاندارەکە راستی کرد کە جامانەی نەجەفی نامێنێت! منیش وتم: بریا پۆپە جامانەکەم بکڕیایە. بەعس رقی لە جامانە هەڵسابوو کە کورد بەکاریدەهێنا، بە تایبەتی پێشمەرگە، بۆیە بە دەستی ئەنقەست کارگەکەی داخستبوو، بەناچاری لە دەرەوە دەهات و نرخەکەی گران ببوو بۆ ٢٥ دینار. ئەمەش کاری خراپی بەعس بوو دژی کورد.

لە ساڵی ١٩٧٨ من شۆفێر بووم ترێی گەورەدێم دەهێنا بۆ سلێمانی، ئەو رۆژە شەڕ بوو لە مالومە، شەهید جەمالی عەلی باپیر جاشەکانی حمەی حەسۆلی چەککرد، بەڵام حمەی حەسۆلی و چەند کەسێك رایانکرد و چەك نەکران و چوونە گاپیلۆێن، لەوێ پێشمەرگەیەکی یەکێتی لێبوو ناوی عوسمان حەمە عەزیز بوو پورزای محەمەد خدر بوو

لە کۆمەڵایەتی، ئاگای لەوە نەبوو کە ئەم جاشانە لە دەست جەمالی عەلی باپیر رایانکردووە، لەوێ شەهیدیان کرد.

لە ساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ حەسەنی ئامۆزام پیکابێکمان کڕیبوو بۆ کاسپی، ڕۆژێك کەریم حاجی قادر بزەینانی هات بۆ لامان وتی: من هەڵووژە و ترێم هەیە وەرن بۆم بەرن بۆ سلێمانی، چووین بۆ بزەینان بۆ هێنانی هەڵووژە و ترێ، دوای تەواوبوونی کار لە بزەینان چووین بۆ کانی دڕکە بۆ ماڵی حاجی نوری بۆ هێنانی هەڵووژە و ترێ بۆ سلێمانی، دوای ئەو چووین بۆ شووکێ بۆ هەمان ئیش. دووایی ئاشنتایەتیمان پەیداکرد بەهۆی ماڵی رەشەی قوربانی کە ئەنجوومی کچی کەریم زینەتیان لابوو ژنی نوری کوڕی بوو، دوای بوونم بە پێشمەرگە نیوەی پیکاپەکەم بە کەریمی حاجی قادر فرۆشت، بەداخەوە شۆفێرێکیان بۆ گرت بەناوی حەمەتاڵ حاجی صالح لە یاران بەگی، پیکابەکەی وەرگێرابوو کەریمی تێدا مردبوو.

لە ساڵانی ١٩٧٨-١٩٧٩ حیزبی بەعس کەوتە لێدانی شانە نهێنییەکانی حیزبی شیوعی، بە تایبەتی ئەو شانانانەی پەیوەندی بە بەشی عەسکەری حیزبەوە هەبوو، لەوانە ٢١ ئەندامی حیزبی لە سێدارەدا کە لە خوارووی عیراق بوون و سەر بە وەزارەتی دیفاع بوون، هەر لەوکاتەدا مولازم جوامێر بە پاڵەوانی بەندیخانە بەناوبانگە بەپێی وتەی بەعسییەکان خۆی لە رێکخراوی هەڵۆی سووردا بوو کە بەعسی نەبوو لە سێدارەدرا. لەبەرئەوەی هەر کەسێك لە بەشی سەربازی بوایە و بەعسی نەبووایە، یان نەبوایە بە بەعسی، بەرشاڵاوی پاکتاوی بەعس دەکەوت. لەبەر ئەم هۆکارە کۆلێژی سەربازی بە بەعسی کرا و کوردی بەهیچ شێوەیەك وەرنەدەگرت.

من لەبەرئەوەی لە بەشی عەسکەری حیزب بووم و لێپرسراویم هەبوو، بەعس چاودێری دەکردم بۆ ئەوەی شوێنەکانم دەستنیشان بکات، لەوکاتەدا لەگەڵ رحیم یالانقۆزی چووین بۆ بەغداد بۆ کڕینی دوو ئۆتۆمبێل بە شەراکەت، کە بریتی بوون لە پیکابێکی تویۆتا و بیجۆیەکی ٤٠٤ بۆ فرۆشتن، بەڵام کە هێنامانەوە بۆ سلێمانی بۆمان نەفرۆشرا، دواتر رێککەوتین بەوەی بیجۆکە بۆ من و پیکابەکە بۆ ئەو بێت، دەستم کرد بە کاسپی بە بیجۆکە کە کرابوو بە تەکسی و لە مەیانی ماستەکە کاری خۆم دەکرد، بەڵام پیاوانی ئەمن هەمیشە چاودێرییان دەکردم. دوای ئەوە کەم کەم هاموشۆی بارەگای حیزبمان دەکرد و خۆمان دەپاراست و وریایی خۆمان دەکرد، لەگەڵ حەمە سوەیلە، کە شەوان لە ماڵانی خزم و ناسیاو دەماینەوە کە جێگای متمانە بوون، لەوکاتەدا ناصر کۆیی سەرلقی حیزب بوو، لەگەڵ ئەحمەدی مارف کە ئەندامی محەلی بوو، هەروەها شێخ عومەری زەراعە ئەندامی حیزب بوو گیران، دوای ماوەیەك بەربوون و لە ژێر فشاری دائیرەی ئەمن وازیان لە حیزب هێنا، دواتر ئاڵۆزی وایکرد کە ئەحمەد حامید و مەحموود دیکتارۆڤ هاتن بۆ ماڵی حەمە سوەیلە و ئاگاداریان کردین کە زۆر بە وریاییەوە هەڵسوکەوت بکەین و هاتوچۆی بارەگا کەم بکەینەوە، ئەحمەد حامید لە جەبهەی میساقی وەتەنی ئەندام بوو، شتی دەربارەی ئەم ئاڵۆزییە دەزانی و نزیك بوو لێمانەوە، بەهۆی ئەوەوە حەمە سوەیلە وایزانی هەڵمەتی گرتن دەستیپێکردووە بۆ شەوەکەی من و حەمە سوەیلە دەرچووین بۆ کەرکوك بە ئۆتۆمبیلی کرێ، کە ناوەناوە لە نزیك سەیتەرەکان دادەبەزیین و بە پێ دەچووین بۆ ئەودیوی سەیتەرەکە و سواری ئۆتۆمبیلێکی تر دەبووین تا لە بەری بەیاندا گەیشتینە کەرکوك، چووینە ماڵی حەمەڕەشید حەمە عیساف کە ماڵی پوری حەمە سوەیلە بوو، بۆ

ئێوارە چووین بۆ مەكتەبەی هەندرێن كە شوێنی چاوپێكەوتنی برادەران بوو، لەوێ فاتیح رەسووڵمان بینی باسی وەزعەكەمان كرد. وتی: هیچی خراپ لە ئارادا نییە، رۆژی دواتر جوابمان بۆ حەمە سەعیدی پوورزام نارد بێت بە شوێنماندا كە جێگای متمانەی خۆمان بوو، بۆ رۆژی دواتر بۆ نیوەرۆكەی هات بە شوێنمانداو بۆ ئێوارە گەیشتینەوە سلێمانی. وەزع باش نەبوو بارەگا هەرمابوو، رۆژنامەی تەریق ئەلشەعب هەر دەردەچوو، بەڵام بەعس دریغی لە شاڵاوی گرتن و چاودێری نەئەكرد، بەعسییەكان دەستیانكرد بە گرتنی شیوعییەكان، كۆمەڵێك برادەر چوون بۆ دائیرەی ئەمن و وازیان لە شیوعییەت هێنا، من و حەمە سۆیلەی ئامۆزام هەر شەوەی لە ماڵی خزم و ناسیاوێك بووین، چەندین شەو بەوشێوەیە ژیانمان بەسەردەبرد، برادەری وا هەبوو جێگای باشی نەبوو، دەچووە قەبرستان خۆی دەشاردەوە، كەس نەیدەوێرا بچێت بۆ بارەگا، بۆ نموونە رۆژێك چووم بۆ بارەگا كەسی لێنەبوو سەید باقی هانەسوورە نەبێت وتی: ئەوە چۆن وێرات بێیت بۆ ئێرە! سەیری دەرەوە بكە، بینیمان ئۆتۆمبێلێكی دائیرەی ئەمن بەرامبەر دەرگای بارەگا وەستا بوو چاوەڕێی منیان دەكرد بۆ ئەوەی بچمەدەرەوە و بمگرن، بەڵام لە سەربانەوە بە دیوی مزگەوتی كانێسكان رامكرد و خۆم دەربازكرد! لەبەر ئەوەی زۆر شارەزا بووم پێشتر پشتی بارەگاكە بارەگای سەربازی خۆمان بوو. سەید باقییان نەدەگرت لەبەر ئەوەی كارمەندی بارەگا بوو مۆڵەتی لە دائیرەی ئەمن هەبوو، چونكە مۆڵەتی لەلایەن جەبهەوە هەبووە، لەگەڵ هەموو ئەوانەی كە كاریان لە بارەگاكاندا دەكرد، بەڵام هەر كەسێك جگە لەمانە هاتووچۆی بارەگای بكرتایە بەرشاڵاوی گرتن دەكەوت، چونكە بەعس چالاكی حیزبی سنووردار كردبوو.

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٨ كاتێك لە سلێمانی خۆمان دەشاردەوە، لە گوندی قەرەچەتان بەهۆی بوونی مەفرەزەیەكی یەكێتی كە ژمارەیان ١٠ كەس بوو، رژێم بە تۆپ بۆردومانی گوندەكەی كرد و هێزێكی زۆری جاش و سوپای رژێم شالاَویان بۆ گوندەكە برد، بەلاَم نەیانتوانی بێنەناو گوندەكەوە، چونكە ئەو پۆلە پێشمەرگەیە توانییان بەرگرییەكی باش لە گوندەكە بكەن، لەو شەڕەدا دكتۆر نەورۆز و عومەر كۆكەیی بە خەستی بریندار بوون، تا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو، دوای شەڕەكە صالَحە سوور مار پێوەی دا. لەو شەڕەدا دوو پێشمەرگە شەهید بوون بە ناوی رۆستەم عەبدولَلاَ و زۆراب، سەلامەسور كانی میرانی بە دیل گیرا، دواتر بە لێبووردن ئازاد كرا.

دواتر لە مانگی یەكی ١٩٧٩ لەگەڵ حیزب گفتوگۆمان كرد بۆ ئەوەی بماننێرنە دەرەوە بۆ خڕی ناوزەنگ، چونكە لەوێ بارەگای لێبوو دەمانزانی چەند كەسێكی تر پێش ئێمە لە ڕێگای حیزبەوە نێردرابوون بۆ ئەوێ تا ملكەچی رژێم نەبن، چونكە ئامادەنەبوون واز لەو حیزبە بێنن و ئێمەش یەكێك بووین لەوانە و بێتاقەت بووین لەخۆشاردنەوە. لە مانگی دوو پێیانڕاگەیاندین كە ئامادەبین بۆ رۆیشتن، چونكە حەمە سوەیلە ئەندامی لیژنەی ناوەندی بوو، حیزب گرنگییان پێدەدا، بۆیە ئەم كارەیان بۆ كرد لەبەر ئەوەی هەركەسێك متمانەی نەبووایە بۆیان نەدەكرد.

لە ٢٠ / ٢ من و حەمە سوەیلە، لەگەڵ سامی وەستا سابیر كە لە عەسكەری هەلاَتبوو، ئەویش ئەندامی حیزب بوو، بۆ ئەوەی نەگیرێت بە پیكابەكەی دارای ئامۆزام چووین بۆ قەرەچەتان، بۆ ئەوەی لەگەڵ پێشمەرگەكانی یەكێتی بە تایبەتی صلاح چاوشین كە لە هەرێمی دوو

بوو لە ناوچەی چەمی رەزان بەڕێبکەوین بۆ خڕی ناوزەنگ، چەند رۆژێك لە قەرەچەتانماینەوە لە ماڵی تۆفیقی حاجی کەریم، بەڵام نەمانتـوانـی صلاح چاوشین ببینین، بۆیە لە ٢/٢٤ بەپێ بەڕێکەوتین بۆ مالومە و شەو لە مالومە لە ماڵی عەبدوڵڵای مام وەسمان ماینەوە کـە دایـکـی خـزمـی خۆمانە و بۆ بەیانی وڵاخمان بەکرێ گرت و بەرەو هەرزنە بەڕێکەوتین. لە هەرزنە سەیتەرەی گومرگی یەکێتـی لـێبـوو، لـەوێ شـێـخ صـدیـقـی چۆخماخی رێنوومایی کردین کە لە سەردەشتەوە بڕۆین باشترە، چونکـە حکومەتی شاهەنشای ئێران رووخاوە و ئازادییە و دەتوانن بە ئۆتۆمبـیـل بڕۆن بۆ شوێنی خۆتان، بەڵام حەمە سوەیلە پێیداگرت کە دەبێت بچێتـە قەڵادزێ، لەبەرئەوەی عینوانی حیزبی پێبوو کە دەیویست جـێـبـەجـێـی بکات. کاتژمێر ١١ی بەیانی رۆژی ٢٦ / ٢ لە هەرزنەوە بەڕێـکـەوتـین بـۆ نورەدینی نزیك قەڵادزێ، لە رێگا حەمە سوەیلە کـە نـەخـۆشـی رەبـۆی هەبوو پەکیکەوت و ئەو ناوچەیە چۆڵکرابوو و تەیارە بۆردوومانی دەکرد، حەمە سوەیلە دەیووت: جیمبێڵن من دەمرم ئێـوە خـۆتـان بـە مـنـەوە خەریك مەکەن، بەڵام پەندی پێشینان کەدەڵێت: خوا دەلـیـلـی دامـاوە، بینیمان قاچاخچییەك بارێك فەرشی پێیە، لە دوورەوە رامکرد بەدوایدا و گرتم، ناوی قادری باییزی قادری بوو خەڵکی قەلەڕەشێی ئێران بوو، کـە گرتم گریا و وەیزانی رووتی دەکەمەوە، بەڵام تێمگەیاند کـە پـیـاوخـراب نین، پێموت: پارە چەند دەوێت دەتدەینێ برادەرێکم تەیارە لێـیـداوە و برینداره "کە وا نەبوو" بۆ ئەوەی قەناعەت بکات لـەگـەڵـم بـێـت، قـادر قەناعەتیکرد هات لەگەڵم، حەمە سوەیلەمان بەسەر بـارە فـەرشـەکـەوە سوارکرد و من و سامیش بەپێ لەگەڵ قادر بەڕێکـەوتـین بـۆ نـورەدیـن، نیوەشەو گەیشتین و قادر شارەزای ماڵی مەمەند ئاغا بوو، بۆ حەوانـەوە چووینە ئەوێ، دوای نانخواردن مەمەند ئاغا کەوتە پرسیارکردن لـێـمـان،

ئێمە وتمان: چێوارین و مامەڵەی کڕینی ئـاژەڵ دەکـەیـن. وتـی: راسـت پێمبلێن ئێوە لە چێوار ناچن! دواتر حەمە سوەیلە پێیوت: ئێمە کارمـان هەیە لە خڕی ناوزەنگ. وتی: خەڵکی کوێن؟ وتمان: قەرەچەتـان. وتـی: مەترسن من کوڕێکم جاشە و کوڕێکم لە هەرێمی هەشتی مامەندەیە نـاوی قادری مەمەند ئاغایە. مەمەند ئاغا کە خۆمـان پـێـنـاسـانـد وتـی: مـن برادەری عارف و عەلیم، عەلی کە باوکم بوو وڵاخی عەرەبی دەبرد مەمەند ئاغا بۆی ساغدەکردەوە، زۆر رێزی لێگرتین، بۆ بەیانی بە تاریکی لەگەڵ قادری فەرش بەڕێکەوتین بۆ بەری ئاسۆس و بە قەیەخ پەڕینەوە، نـانـی بەیانیمان لە ماڵێك لە کەڵەکانی بناری ئاسۆس خوارد، دووبارە پەڕینەوە بۆ بەری قەڵادزێ لەوبەر ئاوەکە کانی چەو و لمی لێبوو بە تەراکتۆر چـەو و لمیان باردەکرد، لەگەڵ ئـەوان بـەڕێـکـەوتـین بـۆ سـەنـگـەسـەر، لـە سەنگەسەر چووینە ئەو ماڵەی حەمە سوەیلە عینوانی ماڵەکەی پـێـبـوو، لەوێ نامەکەمان دا بە خاوەن ماڵەکە و بـردی بـۆ قـەڵادزێ و وەڵامـی نامەکەی هێنایەوە، دووشەو لەوێ ماینەوە و دواتر کـەریـمـی تـەمـەمـان بینی کە ئەندامی تری هێنابوو نەماندەزانی کێن، چونکە لە ماڵـێـکـی تـر دانابوون، دواتر وڵاخیان بۆ بە کرێ گرتین لەگەڵ محەمەد خدر ناوێك کە خزمی ئەو ماڵە بوو حیزب ناردبووی بـۆ پـێـشـمـەرگـایـەتـی، بـۆ شـەو بەڕێکەوتین بۆ خڕی ناوزەنگ لە رێگا شەو دەڕۆیشتین لە قەبرستانەکـان قاچاخچییەکان فاتیحایان دەخوێند سامی دەیووت: ئەوە دەڵێن چـی بـا ئێمەش بیزانین، چونکە وایدەزانی ترسناکن دەیـانـەوێـت شـتـی خـراپ بەرامبەرمان بکەن.

لە رێکەوتی ١ / ٣ / ١٩٧٩ گەیشتینە ناوزەنگ کـە یـەکـەم رۆژی پێشمەرگایەتیمە لە شۆڕشی نوێدا. کە رۆیشتینە خڕی نـاوزەنـگ لـەوێ بارەگایەکی بچووکی لێبوو کە یەکێتی نیشتمانی پێشـکـەشـی حـیـزبـی

کردبوو پێیاندەووت: کونە رێوییەکە، ژمارەی ئەندامانی حیزب نزیکەی ٤٠–٥٠ کەس دەبوو، لەوکاتەدا لەگەڵ سمایل دیکتارۆڤ و برادەرێکی بادینی چووین بۆ پشکنینی شاخی مامەندە و مالیمۆس بۆ ئەوەی بزانین شوێنێکی لەبارە بۆ بارەگای حیزب و دوورە دەست بێت لە سوپای عێراق، بۆ ئەوەی بە ئاسانی دەستی پێمان نەگات، چونکە ئەو ناوچەیە کەوتبووە پشت شاخی مامەندە کە بەسەر قەڵادزێدا دەیڕوانی، دوای پشکنینی شاخەکە کە هاتینە خوارەوە چووین بۆ گوندی کانی زەرد، زۆرمان پرسیبوو چووینە ماڵی پیاوێکی باش نانی گەرمی بۆ دانایین لەگەڵ ماست، کە دەستمان کرد بە نانخواردن دوو جار جامە ماستەکەی بۆ پڕکردینەوە، چونکە ئەوەندەمان برسیبوو تێرماننەدەخوارد، پیاوەکە وتی: ئێوە لە کوێوە هاتوون وا برسی و ماندوون؟! وتمان: لە عێراقەوە هاتووین. وتی: دیارە زۆرتان برسییە و هیلاکن. دوای نانخواردن گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە و بە راپۆرتێك کە ناردمان بۆ حیزب بڕیارماندا بارەگا لە تووژەڵە دابنێین، چونکە بە رای ئێمە شوێنێکی لەباربوو بۆ بارەگا.

پەیوەندیمان لەگەڵ برادەرانی یەکێتی بە گشتی زۆرباش بوو، چەند تێکۆشەرێکی یەکێتی سەردانیان دەکردین و شەو دەمانەوە، لەوانە: شەهید سمایل گەوردەدێی و ئەحمەدی برای کە زۆر نێوانمان خۆش بوو، لەبەر پاکوبێگەردی خۆیان شەوانیش لامان دەمانەوە و لە بارەگای خۆیان نەدەمانەوە، ئەو دۆستایەتییە هەتا ئێستاش لەگەڵ کوڕ و کوڕەزاکانی هەرماوە. شەهید سمایل دوو کوڕی هەبوو، یەکێکیان لە گوندی کەڕەدێ دووپشك پێوەیدا و مرد، ئەم خێزانە مێژوو قەرزاریانە لە خەبات و کوردایەتی و نانبدەیی.

رۆژ لە دوای رۆژ ژمارەمان زیاتر دەبوو، بۆیە ژوورێکی ترمان لە تەنیشت بارەگاکە دروستکرد، چونکە جێگامان نەدەبووەوە و وەزعمان خراپ بوو، عەلی رەش شمشێرکوڵی لەوێ بوو، بەڵام پێشمەرگەی یەکێتی بوو سەردانی دەکردین، بەیانیان ٣ گوێز و یەك نانیان دەداینێ، من و عەلەڕەش کردمان بەهەرا وتمان: شۆڕش بە برسێتی ناکرێت! وەرن پارە کۆدەکەینەوە و دەیدەین بە خواردن، دوای ئەو هەرایەی ئێمە کردیان بە پێنج گوێز و پووچەڵیان حساب نەدەکرد!؟ بەیانی وا هەبوو پەنیری سێگۆشەیان دەداینێ، دواتر سمایل دیکتارۆۋ لەگەڵ ئەبو جۆزیف کە لەوێ لێپرسراوی بەشی عەسکەری بوون، چوون بۆ لای مولازم عومەر عەبدوڵڵا کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری یەکێتی بوو بۆ دابینکردنی ئازوقە و کەلوپەلی سەربازی. کە ژمارەمان زیادیکرد، بۆ مانگی چوار ناوزەنگمان جێهێشت و چووین بۆ تووژەڵە، لەوێ خێمە و کەلوپەلمان دەستکەوت کە حیزبی دیموکرات و حیزبی تودەی ئێران بۆیان دابینکردبووین، لەوێ کەلاوە کۆنی لێبوو نۆژەنمان کردەوە و کردمان بە بارەگای بەشی عەسکەری سلێمانی و کەرکوك. لەوکاتەدا بەهادین نوری لەگەڵ رەفیق سابیر و چەند برادەرێك لە بولگاریا گەڕابوونەوە و پارەی باشیان هێنابووەوە و ببووەهۆی بووژانەوەی حیزب. بەهۆی باشی پەیوەندی حیزب لەگەڵ دیموکرات، حیزب بارەگای لە مهاباد کردبووەوە و بەکاردەهات بۆ حەوانەوەی ئەو برادەرانەی کە سەردانی ئێرانیان دەکرد بۆ پشوودان و ئەو برادەرانەی کە لە دەرەوەی وڵات دەگەڕانەوە، لەوێوە پەیوەندییان بە بارەگای حیزبەوە دەکرد لە تووژەڵە.

نانخواردن لە تووژەڵە بەتایبەتی نانی نیوەڕۆ برنج و شلە بوو، نانی بارەگا لەلایەن ئەحمەد مارف نانەوا دروستدەکرا، وەستایەکی باشی سلێمانی بوو، دەبوایە یەکێك هەویرەکەی بۆ بشێلایە بۆ ئەوەی

ئەو بیکات بە نـان، خـواردنـی بـارەگـاش لـەلایـەن ئـەحمـەد رەجـەب سەرپەرشتی دەکرا، کاك ئەحمەدی نانەوا زۆر بەرچاو تەنـگ و نـەوسـن بوو، کاتێك ئەحمەد رەجەب نانی نیوەڕۆی تێدەکرد و تـۆزێـك لـە بـنـی مەنجەڵەکە دەمایەوە دەیووت: کێ عەوازەی دەوێـت؟ خـێـرا ئـەحمـەد نانەوا دەیووت: ئێمە دەمانەوێت و ڕایدەکرد بۆ لای، تۆزێکی ئەهێنـا بـۆ لای هاوڕێکەی و ئەویتری دەخوارد، ئەویش دەیکرد بە دەنـگـەدەنـگ و دەیووت: من لەگەڵ تۆ نان ناخۆم، دەبوو بە پێکەنین. جارێك ئیسماعیـل دیکتارۆڤ کە لە بارەگایەکی تر بوو بانگهێشتمانکرد بـۆ نـانـی نـیـوەڕۆ، کاتێك کاك ئەحمەد چاوی پێکەوت چاوی پەڕییە پشتی سەری پـێـیـوت: کاکە تۆ ئازوقەت لێرە نییە بۆ دێیت بۆ ئێرە بۆ نانی نـیـوەڕۆ، ئـەویـش پێیوت: دەعوات کراوم، کاك ئەحمەد پێیوت: بانگێشتیـش بـکـەن بـۆت نییە لێرە نان بخۆی، ئیتر دەبوو بە پـێـکـەنـین. کـاك ئـەحمـەد مـارف شیوعییەکی زۆر تێکۆشەر بوو تەمەنی چووبووە ٦٠ سـاڵ، دوای سـاڵـی ١٩٨١ لەبەر دۆڵی مووسا لە کۆبوونەوەیەکـدا بـەردێـك کـەوتـەخـوارەوە شەهیدی کرد و لە زەڵێ نێژرا، ڕەحمەت لە گـۆڕی، هـەمـوومـان نـانـی دەستی ئەومان خواردووە.

لە مانگی ٣ی ١٩٧٩ لە خڕی ناوزەنگ ئەبو جۆزیف کە بەرپـرسـی مەکتەبی سەربازی بوو، ناوی تۆما تۆماس بوو، مەسیحییەکـی نـاوچـەی بادینان بوو، کۆبوونەوەی پێکردین ئێمەش بەرپرسی ناوچەکان بووین و ئەندام بووین، ئیسماعیل دیکتارۆڤ جـێـگـری بـوو، کـانـەبـی چـاوڕەش لێپرسراوی ناوچەی هەولێر بوو، سەلیمە سـوور لـێـپـرسـراوی نـاوچـەی پشدەر بوو، عەلی حاجی نادر لێپرسراوی ناوچـەی بـتـوێـن بـوو، بـەکـر تەلانی لێپرسراوی ناوچەی دەشتی کۆیە بوو، منیش لێپرسراوی ناوچـەی سلیمانی و شارباژێر بووم.

لە ٣١ی ئازاری ١٩٧٩ یادی دامەزراندنی حیزبی شیوعی لە کونە ڕێویەکەی پشت خڕی ناوزەنگ کرایەوە، کە یەکەم یادی حیزب بوو لە شاخ، لەو یادەدا مام جەلال و عومەر دەبابە و هیرۆخان و مریەم خانی خێزانی دکتۆر عەلی بەشدارییان کرد و مام جەلال وتارێکی خوێندەوە و پیرۆزبایی لە حیزب کرد و تیایدا دەستنیشانی ئەوەی کرد کە حیزبی شیوعی هاتوونەتە خەبات دژی دیکتاتۆری و ئەم ناوچەیە یەکەم ناوچەی رزگارکراوی عێراقە دژی رژێم و هیوای خواست کە هەموو عێراق رزگار بکرێت لە دەستی رژێمی رەفتار فاشتی بەغداد. هیوای خواست کە حیزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی یەکێتییان بەهێز بێت، برادەرانی سەرکردایەتی حیزب کە بریتی بوون لە بەهادین نوری و توما تۆماس سوپاسیانکرد و هیواداربوون حیزب تا خۆی دەگرێت هاوکاریان بێت، دوای ئەوە یەکێتی و حیزبی دیموکرات ئازوقە و چەکیان بۆ حیزب نارد وەك هاوکاری. ئەم یادە یادی ٤٥ ساڵەی حیزب بوو کاتێکی زۆر ناخۆش بوو، بەلاّم حیزب توانی زوو برینەکان سارێژ بکات و خۆی جۆشبداتەوە و پێشمەرگە دروست بکات بۆ ناوچەکان، وەکو بتوێن و پشدەر و شاربازێر. یەکەمجار من لەگەڵ عەلی حاجی نادر و مەفرەزەیەك چووین بۆ چوارقوڕنە و لەوێ دوو برادەر شەهید بوون بە ناوی هاورێ شێخە و هاوڕێ علی، بە بۆچوونی من ئەمە یەکەم دابەزینی مەفرەزەی حیزب بوو بۆ ناوچەکان، دواتر دابەزیین بۆ شاربازێر.

لە مانگی ٦ لەگەڵ حەمە سوەیلە و کەریمی حاجی و سامی بە مینی پاص بۆ مهاباد چووین، لە ڕێگا دەریاچەیەکی بچووکی لێبوو پڕ بوو لە پەلەوەرێکی تایبەت پێیدەووترا سەقاقوش، لەوێ بەکر تەلانی بە برادەرێکی دیموکراتی وت: ئەو چەکەم بدەرێ با سەقاقوشێك بکوژم،

چونکە هەموومان بێ چەك بووین تەنها ئێرانییەکان دەیانتوانی چەکیان پێببێت، چەکەکەی لە برادەرە ئێرانییەکە وەرگرت و سەقاقوشێکی کوشت، نیشانگرێکی چاك بوو بە داخەوە دواتر شەهید بوو. سەقاقوشەکەمان برد بۆ بارەگاکە لەوێ قادر یەزیدی لێبوو چاوێکی نابینا بوو خزمەتی ئەو برادەرانەی دەکرد کە لە بارەگا دەمانەوە، لەگەڵ برنج بۆ نانی ئێوارە بۆی ئامادەکردین. بۆ بەیانی چووین بۆ جگەرخانە تێرمان جگەر خوارد ویستمان پارە بدەین، کابرایەکی درێژ پارەی بۆ دابووین، خاوەن دوکانەکە وتی: ئێوە میوانن پوڵتان بۆ دراوە. وتمان: کێ داویەتی؟! وتی: ئەو پیاوەیە ناوی حەسەنی ماملێیە برای محەمەدی ماملێ بوو، خێزانێکی کوردپەروەر بوون و نەیویستبوو بزانین کێیە! بەڵام پێشمەرگەکانی عیراقی خۆشدەویست و خزمەتی دەکردن، یەکێك بوو لە بنەماڵە تێکۆشەرەکانی مەهاباد. ئەم سەردانەی ئێرانمان زۆر پێخۆش بوو، چونکە یەکەمجار بوو ئێران ببینین. کەریمی حاجی کە خەڵکی هەڵەبجەیە زۆر نەوسن بوو حەزی لە خواردن بوو، من و حەمە سوەیلەش وەکو ئەو وابووین، بەڵام سامی وانەبوو.

دواتر چووین بۆ بۆکان بۆ ناڵەشکێنە بۆسەر گۆڕی حەسەن زیرەك، لەوێ ڕەشەبا چەتری سەر گۆرەکەی هەڵوەشاندبوو، بۆیاغێکی سەوزی کاڵ کرابوو، دواتر چووین بۆ سەقز و لەوێوە بۆ بانە، لە ڕێگا لاماندا بۆ سەیرانگای سەبەتوڵ و پاشان گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە و کۆتاییمان بە سەردانەکەی ئێران هێنا.

پاشان کۆبونەوە کراو بڕیاردرا ئەو هەڤاڵانەی کە خەڵکی سلێمانی و هەڵەبجە و کەرکوکن بچن بۆ بەلەبزان، لەوێ زیاتر لە ١٠٠ هاوڕێی لێیە لەوانە: مەلا عەلی لیبێپرسراوی ئەو دەڤەرەیە و نەسرەدین عابیر هەورامی جێگریەتی و ئەم هەڤاڵانەش ئەندامی لیژنەی عەسکەرین لەوانە:

حەمەڕەشید قەرەداغی و تۆفیق حاجی هەڵەبجەیی و نەجم صۆفی و فتاح گەلاڵی و قادر حاجی محەمەد (ئەسکەندەر) و قادر فارس. کە چووین بۆ ئەوێ وەزع زۆر خراپ بوو، لەبەر بێ پارەیی تەنها نان و دۆمان دەخوارد، ئەویش ماڵان بۆیان دابین دەکردین. لەوماوەیەدا چەند چالاکییەکمان کرد بۆ ئەوەی خەڵك بزانێت کە ئێمە پێشمەرگەین.

پێشتر دەورەم بینیبوو لەسەر تۆپی ٥٧ ملم. بەرنامەمان دانا کە بە مەفرەزەیەکی بەهێزەوە بچین بۆ سەر مەخفەری تەوێڵە، بەیانی زوو جێبێك و زیلێك دێت بۆ ئەوێ لێیدەدەین، مەلا عەلی بڕیاری دابوو خۆشی بێت، منیان لەگەڵ چەند برادەرێك نارد بۆ تۆپبارانکردنی مەخفەرەکە، کە بریتی بوون لە ئەسعەد گامێش تەپەیی و جەلال کانی مەنمی و محەمەد ئەمین ناوێك کە زۆر بەهێز بوو تۆپە ٥٧ ملمەکەی هەڵگرتبوو، کارەکەی ئێمە ئەنجامی باشی هەبوو، توانیمان ١٠ گوللەتۆپ بنێین بەو مەخفەرەوە، مەلا عەلی زۆر رازی بوو لێی کە لە بیرەوەرییەکانی خۆی نیشانی داوە کە کارەکەمان سەرکەوتوو بووە و خەڵکی ناوچەکە زۆریان پێخۆشبوو، ئەم چالاکییە لە ناوچەکەدا دەنگیدایەوە، بەڵام بەداخەوە هاورێیان نەیانتوانی بچنە شوێنی رووداوەکە، لەبەر ئەوەی مەخفەرەکە نزیك بوو لەو شوێنە و تەقەیان لەو شوێنە دەکرد، بەڵام برادەران تەقەیان لە ئیفاکە کردبوو وەرگەڕابوو و جێبەکە بێ زیان بوو، پاشان بە بێ زیان گەڕاینەوە بۆ بەلەبزان. ئەمە یەکەم چالاکی بوو کە پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی لەو ناوچەیە ئەنجامیان دا.

لە هاوینی ١٩٧٩ لە تووژەڵە بووین نزیکەی ١٥ پێشمەرگەی خەڵکی سلێمانی بووین لە ژێر خێمەیەکدا، فانۆسێك داگیرسابوو دووپشکێکم بە سەر سەری برادەرێکەوە بینی وتم: نەجوڵێیت تا

پێڵاوێکی چاکم هێنا بۆ ئەوەی دووپشکەکە بکوژم، بە هەموو هێزی خۆم تاکە پێڵاوەکەم کێشا بە سەری دا و هاواری لێ هەڵسا و وتی: باوکەڕۆ دووپشکەکە پێوەی بدامایە باشتر بوو هەر ئەوەندەی ئازار دەبوو!؟ بەڵام من نەمدەزانی پێوەدانی دووپشك لە کوێستانەکان ئازاری نییە، وەکو دووپشکی گەرمیان و عەربەت نین، ئەگەر ئەوەی بزانیایە ئەیووت: با پێوەم بدات.. ئیتر بوو بە بەزم خوا خوامان بوو بابەتێك هەبێت کاتی بێ تەواو بکەین.

تازە چووبینە دەرەوە لە ساڵی ١٩٧٩ برادەرێکمان لە گەڵ بوو هەرگیز شاخ و دارستانی نەدیبوو، خەڵکی بەغداد بوو، قاپشۆرین و چالێنان بە سەرە بوو، ئێواران دەبووایە بچێتەخوار بارەگاکە بۆ سەر ئاوەکە، کە تاریك دەبوو نەیدەوێرا بچێت بۆ سەر ئاوەکە بۆ شۆردنی قاپ و دۆلکە، هەر دەچوو بۆ سەر ئاوەکە و دەهاتەوە، جارێك خۆم لە بن بەردێدا شاردەوە بۆ ئەوەی بیترسێنم، کە هات بۆ سەر ئاوەکە لە پڕ پێمووت: چی دەکەیت لێرە؟! رایکرد و کەوت بە دەمدا و هەر دوو قاچی بریندار بوو، من قاپەکانم بۆ شت و گەڕامەوە بینیم ئەو تەداوی دەکەن، بەوشێوەیە نەخۆش کەوت تا چاك بووەوە ٥ ڕۆژ لە بری ئەو بووم بە خەفەر لەبەر ئەوەی ئەو ترساوە، بەوشێوەیە بینینی بۆ پێکەنین دەبوو تا چاك بووەوە.

لە مانگی ٨ ی ١٩٧٩ لەگەڵ عەتا چووین بۆ کرماشان چەند رۆژێك لەوێ بووین وتیان: نوری حاجی گورون وا لە موسافیرخانە، چووین بۆ سەردانی بینیمان غەریبەی ژنی هاتووە بۆ لای بۆ ئەوەی بیباتەوە خۆی تەسلیم بکاتەوە، ماوەیەك لەوناوە بووین کاك نوری گەڕایەوە بۆ تەسلیمبوونەوە، رۆژێك بە خیابانێکدا پیاسەمان دەکرد پێیاندەووت:

خیابانی سنجابی، نەماندەزانی کرماشان بە سەرسەری بەناوبانگە، پێشئەوەی بچین پێیانووتین وریابن کرماشان سەرسەری و چەقۆوەشێنی زۆرە، بەڵام ئێمە گوێمان پێ نەدا، هەردووکمان بە جلی کوردییەوە پیاسەمان دەکرد، سەرسەرییەك بە سواری پاسکیلێکەوە هاواری کرد ئاغا ئاغا پشتێنەکەت خریاوەسۆ، ئێمەش هەردووکمان دەستمان برد بۆ پشتێنەکەمان بۆ ئەوەی توندی بکەینەوە، بۆی دادڕین!؟ هەر چەند عەتا رایکرد بە دوایدا، بەڵام ئەو بە سواری پاسکیلەوە بوو نەیگرت و گەڕایەوە وتی: با بۆی بمێنێت، منیش وتم: چی بۆ بمێنێت وەرە با بڕۆین تا زووە! ئینجا زانیمان کرماشان چەقۆوەشێن و سەرسەری زۆرە. ئەوکاتە پارەمان لێبڕابوو برادەرێك هات بۆ لامان و هاوڕێ عەتا وتی: پارەمان دەستکەوتووە وتم: پارەی چی؟! وتی: پارەی گواستنەوەی کەلوپەلی سەربازی بوو لە مهابادەوە بۆ خڕی ناوزەنگ کە حیزبی دیموکرات پێشکەشی حیزبی شیوعی کردبوو، ویستبوویان حەماڵ بگرن ئێمە وتبوومان ئێمە باری دەکەین و پارەکە بدەن بە ئێمە، ئەوانیش رازی ببون. پارەی ئەو حەماڵییە بوو ناردبوویان زۆر دڵخۆشبووین بە پارەکە. لەوکاتەدا بە سەرهاتی زۆر خۆشمان هەبوو تا پارەکە تەواو بوو لەوێ بووین دوایی گەڕاینەوە بۆ بەلەبزان.

لە مانگی ٨ / ١٩٧٩ سوپای ئێران هاتن بۆ گرتنەوەی پاوە و دووئاوان، هێرشیکردەسەر ئەو ناوچەیەی ئێمە، مەلا عەلی پێیووتم: بچۆ بۆ سەر شاخی کرن بۆ چاودێریکردنی ناوچەکە، من و سامی و دوو برادەری تر سەرکەوتین بۆ سەر شاخ، تۆپێکی ٧٥ ملممان پێبوو لەناو قەدی شاخەکە کە پێیدەووترا هاوینەهەواری بەلەبزان، لەوێ چووینە ماڵێك بە رێکەوت ماڵی حەمە سەلیم بوو کە ساڵی ١٩٧٤ پێشمەرگە بوو

لەگەڵ خۆم لە سەرچنار، دوای نانخواردن سەرکەوتین بۆ سەر شاخ کە دەیڕوانی بە سەر شاری پاوەدا، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە و بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ بارەگا وتمان: پاوە گیراوە! دواتر لەوێ نەماین بەناچاری هاتینە هەوارەکۆن و ئاوی سیروان، چەند برادەرێکمان لێ بە دیل گیرا، لەوانە: عەلی جەنگی. نزیکەی یەك مانگ لەو ناوچەیە ماینەوە وەزعمان تا دەهات خراپتر دەبوو، تا لێبووردنی گشتی رژێم دەرچوو لە مانگی ٩ ی ١٩٧٩، لەسەر ئاوەکەی سیروان کۆبوونەوەیەك کرا بڕیار درا بڵاوە بەو هێزە بکرێت و هەر کەس بۆ ناوچەی خۆی، ئەو برادەرانەی خەڵکی ناوچەی سلێمانی و کەرکوك و شارباژێڕ و دوکان بوون لە رێگەی سلێمانییەوە گەڕاینەوە بۆ خڕی ناوزەنگ و تووژەڵە.

لە مانگی ٩ ساڵی ١٩٧٩ بە بڕیاری حیزب لە بەلەبزانەوە لەگەڵ عەتا و بێکەس و جەلال مەجید بۆ سلێمانی هاتمەوە، لەوکاتەدا رژێم لێبووردنی گشتی دەرکردبوو لە بازگەکان لە کەسیان نەدەپرسی، لەم لێبووردنەدا سەدام تازە ببوو بە سەروکی کۆمار و بەهۆی کۆدەتای سپی بەسەر ئەحمەد حەسەن بەکر و محەمەد عایش و باڵی سەر بە ئەحمەد حەسەن بکر، ئێمەش سوودمان لێبینی بۆ گەڕانەوەمان بۆ خڕی ناوزەنگ و تووژەڵە، لە بەلەبزانەوە بە پیادە هاتین بۆ ناو هەڵەبجە و چووینە گەراجی سلێمانی و سواری تەکسی بووین، هەرسێکمان لە دواوە بووین و ئافرەتێك لە پێشەوە بوو کە گەیشتینە بازگەی زەڵم داوای تەسکەرەی لە ئافرەتەکە کرد و هەواڵی ئێمەی نەپرسی، گەیشتینە سلێمانی کاتی پاش نیوەڕۆ بوو بە تەکسی چووینە ماڵی مستەفای ئامۆزام تا تاریك بوو، نانی ئێوارەمان لەوێ خوارد، دوای تاریکی شەو گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان و کەس نەیزانی، ماوەی ٩ رۆژ لە سلێمانی ماینەوە، بە داخەوە

كاك جەلال كە پێشمەرگەیەكی ئازابوو نەهاتەوە بۆ سەركردایەتی و گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی. لە سلێمانی ناردم بە شوێن نوری حاجی گوروندا بۆ ئەوەی لەگەڵم بگەڕێتەوە بۆ سەركردایەتی، بەڵام كە هات لەگەڵ خێزانەكەی بوو كۆمەڵێك ڕەچەتەی دكتۆری لەگەڵ خۆی هێنا بوو وتی: من نەخۆشم ناتوانم بێمەوە، دوای چاكبوونەوەم خۆم دێمەوە بۆ سەركردایەتی و دواتر نەهاتەوە و خەریكی كاری خۆی بوو، حەمە سۆیلەی ئامۆزام لەبەرئەوەی نەخۆشی هەناسەسواری هەبوو پرسی بە حیزب كردبوو بۆ ئەوەی كاری ناوشاری حیزب بكات و نەگەڕێتەوە بۆ سەركردایەتی، كە ناردم بە شوێنیدا وتی: بە كەڵكی پێشمەرگایەتی نایەم تەنها دەتوانم كاری ناوشار بكەم، پاش تەواوبوونی كارەكانمان لەناوشار بە ئوتۆمبێلی حیزب كە شۆفێرەكەی ناوی كەریم حەسەن بوو لەگەڵ عەتا و بێكەس و كەمال هەمزە گەڕاینەوە بۆ سەركردایەتی، لە ئۆردوگای ژاراوە چووینە ماڵی محەمەد خدر و وڵاخی بۆ بە كرێ گرتین بۆ تووژەڵە و محەمەد خدر خۆشی بوو بە پێشمەرگە و نەگەڕایەوە بۆ ناوشار. مام عوسمان كە باوكی عەلی بچكۆل بوو بۆ كاری حیزبی چووەوە بۆ ناوشاری سلێمانی بە داخەوە گیرا و بێ سەروشوێن كرا.

لەوكاتەدا دكتۆر قاسملۆ ئاگاداری حیزبی كرد لە ڕێگەی برایمی سۆفی مەحمودەوە كە حیزب ناردبووی بۆ ناو حیزبی دیموكرات لێپرسراوی بەشی عەسكەری بوو، كە مەفرەزەیەكم بۆ بنێرن كە شارەزاییان هەبێت لە كاری هەندەسەی عەسكەری و مەدفەع دا، حیزب من و چەند هاورێیەكی نارد بەم ناوانە: عە تا خڕە، كمال مام هە مزە، محسین هەولێری كە دەورەی لە فەلەستین بینیبوو، لەگەڵ پۆلا كەركوكی. لەوێ چەند ڕۆژێك ماینەوە و چالاكی خۆمان ئەنجامدا و برایم

صۆفی و قاسملۆ زۆر لێمان رازی بوون، بۆ مانگی ١٠ گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە. لەوکاتەدا حیزبی توودەی ئێران و کۆماری ئیسلامی رێکەوتن کە چەکەکانیان دابنێن و بگەڕێنەوە بۆ شارەکان بۆ خەباتی شار، هەموو چەکەکانیان دا بە حیزبی شیوعی کە سوودی باشی هەبوو.

دواتر لە ١٠ / ١١ / ١٩٧٩ بۆ ناوچەی شار بازێر هاتینەخوارەوە لەو برادەرانە: بورهان ئەحمەد ناسراو بە عەتا خڕە، شێخ رەسووڵ، مەحمود دیکتارۆف،، دکتۆر فارس کە لێپرسراوی بەشی حیزبی بوو واتە سیاسی، ماموستا جەمال حەمەئەمین، ماموستا صالّح، ئەحمەد رەجەب، خالید، سەرباز، بێکەس، عومەر هەڵەبجەیی، محەمەد عەرەب، ئەبو هێمن، معتصم عەرەب، ماموستا شاهۆ، کمال مام هەمزە و حەسەن رەشید. ئەوکاتە لێپرسراوی بەشی عەسکەری بووم، هاوڕێ مەحمود وەك سەربەرشتاری عەسکەری هاتبوو، دوای چەند مانگێك گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە و کرام بە لێپرسراوی ناوچەی (سلێمانی – شاربازێر). دواتر لە کۆبوونەوەیەکی حیزبیدا کرام بە لێپرسراوی بەشی عەسکەری و دکتۆر فارس کرا بە لێپرسراوی بەشی سیاسی.

لە پاییزی ١٩٧٩ لە گوندی گردەزووبێر بووین لە ناوچەی سیوەیل، کوڕی شەهیدێکی خۆمان ناوی جەناب بوو کە پێشتر کوێخای گوندەکە بوو ناوی کوێخا غەفوور بوو، ئەم ببوو بە ئەنجوومەنی گوندەکە، لە مزگەوتەکە گوێز هەڵدرابووەوە دیار بوو وەقفی مزگەوت بوو، بۆیە ئەو هەموو گوێزەی هەبوو، برادەرانیش بە ئاشکرا و بە نهێنی خەریکی گوێز خواردن بوون، ئەوەندەیان خواردبوو تا سێ رۆژ نانیان بۆ نەدەخورا، زۆر هەوڵمدا کە زۆر نەخۆن، بەڵام سوودی نەبوو، یەکەمجار بوو بکەوینەسەر خەرمانی گوێز، کوڕی شەهیدەکەی خۆمان هەر

دەیووت: بخۆن و بەزۆر دەیکردە گیرفانمان، چونکە باوکی شیوعی بوو، ئێمەش یەکەم جار بوو بچینە ئەو گوندە، هەر چاومان پێیکەوت زۆر دڵخۆش بوو ئێمەش هەروەها، ئەو زۆری پێخۆش بوو کە حیزبەکەی باوکی چەکی هەڵگرتووە.

لە مانگی ١١ / ١٩٧٩ مەفرەزەیەك بووین، هاتینەخواریّ زۆر شارەزا نەبووین و ژمارەمان ١٦ پێشمەرگە بوو، مەلا حسەینمان لەگەڵدابوو وەکو شارەزای شارباژێر، چونکە من شارەزای ناوچەکە بە باش نەبووم، ئەو خەڵکی چوارتا بوو، دوای گەڕانەوەمان لە ناوچەی قەرەچەتان و دۆڵیّ، لە دۆڵی قەیوانەوە هاتین بۆ مۆکەبە و دواتر کەوتینە بن رەبایەکانی قشلاخ و هەباسە چەقەڵ، لە ناو چەمەکەدا خۆمان شاردەوە تا تاریك داهات نەدەمانتوانی لە جادە بپەڕینەوە و نەدەمانتوانی بگەڕێینەوە. کە شەو داهات لە جادە پەڕیتینەوە بۆ بەری کێلیّ، هەرچەندە رەبایەکان چاویان لێمان بوو، بەڵام تەقەیان نەکرد و گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە.

لە مانگی ١١ ی ١٩٧٩ گەڕاینەوە بۆ ناوچەی دۆڵیّ، ١٥ کەس دەبووین، لە گوندی مالومە دکتور فارس وتی: با کۆبوونەوە بە گوندەکە بکەین. وتم: خەڵکی گوندەکە زۆر ماندوون وەرزی خەڵوزکردنە با بچین بۆ کۆبوونەوەی گوندەکانی تر، بەڵام هەر بڕیاری کۆبوونەوەی دا، منیش بە ئەنجوومەنی گوندەکەم وت: خەڵکی گوندەکەم بۆ کۆبکەرەوە. پاش کۆکردنەوەیان لە مزگەوت دکتور فارس باسی چینایەتی بۆ دەکردن دەیووت: رۆژانە کرێکار دەبەن بۆ قورکاری و شوانی بە رۆژانە، ئەوانیش هیلاك بوون و تەقەی سەریان دەهات و بە دکتورم وت: سەیریان کە هەموویان خەوتوون لەبەر تاریکی مزگەوتەکە! منداڵێکی خزمی خۆم

ناوی محەمەد ئەحمەدە ئێستا لە مەڵبەندی سلیمانی بە هاوڕێ شاكار بە ناوبانگە هات لەگەڵم بۆ كۆبوونەوەكە.

یەكەم مەفرەزە كە هاتینەخوارەوە ئەو چەكانەی پێمان بوو هی حیزبی توودەی ئێران بوو، تەنها من كلاشینكۆفم پێبوو، یەك مەخزەنی لەگەڵ بوو بە ڕەزنەكەوە، لە ناوچەی باسنێ و گردەزوبێر شەهید عەلی چوارتاییمان بینی كە ئامركەرتی یەكێتی بوو، ئەوان چەكی باش و مەخزەنی زۆریان پێبوو، میوانداریيان كردین، ئەو ڕۆژە زۆر گەرم بوو، پێم عەیب بوو قۆبچەی قەمسەڵەكەم نەكردەوە و ئارەق بە دەموچاومدا دەهاتە خوارەوە، لەبەر ئەوەی ئەو مەخزەنە تاقانەیە دەرنەكەوێت!؟ چەند ڕۆژێك لەگەڵ ئەو كەرتەی عەلی چوارتایی جەولەمان دەكرد كە زۆر ڕێزی لێگرتین، دواتر گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە.

لە مانگی ١٢ ی ١٩٧٩ گەڕاینەوە خوارێ بۆ ناوچەی دۆڵێ لە گوندی یاخسەمەر لەگەڵ كەرتێكی یەكێتی دامەزراین و شەو لەوێ ماینەوە، كە كەرتەكەی یەكێتی مستەفا سەرگەڵوویی و غەریب هەڵەدنییان لەگەڵدا بوو، ڕۆژی پێشتر لەگەڵ حسكدا دوای یەكتر كەوتبوون، بۆ بەیانی خەڵكی گوندەكە بە منیان وت: كەمینەكانتان گەڕاوەتەوە لە یاخسەمەر؟ وتم: بەڵێ. وتیان: شوێنی كەمینەكەتان چەكداری لێیە، یەكێتییەكان دەیانزانی حسكن زوو خۆیان دەربازكرد لە خوار ناودێوە كەمینیان دانابوو، لەوێ غەریب هەڵەدنی و چەند كەسێكیان چەك كرد، ئێمە وامانزانی جاشن دەستمان بە شەڕكردن كرد لەگەڵیان، دواتر دوو پێشمەرگەی یەكێتییان بریندارکرد، عبدوللەی كوێخا هەمزەی ئاوكورتێ تەقەی لە دكتور فارس كرد لە چەمەكەدا، بەڵام بەرینەكەوت، بە دووربین عوسمانی قالە منەوەرم ناسی لە دوورەوە

بانگم کرد و شەڕەکەمان ڕاگرت و لە ناودێ کۆبووینەوە و برینداڕەکانمان تەداوی کرد، کە عەبدوڵڵا هەمزە و دکتۆر فارس برینپێچییان دەزانی، وڵاغمان بە کرێ گرت بۆ بریندارەکان و ڕەوانەی ئێرانمان کردن، کە بریتیبوون لە حەمە سەعیدی وەستا مەجیدی زێوێ و برادەرێکی تر، دواتر گەڕاینەوە بۆ تووژەڵە.

لە مانگی ١٢ ی ١٩٧٩ لە توژەڵەوە بەڕێکەوتین بۆ شارباژێر لەوێوە بۆ سنووری ئێران و عێراق لە نزیک بازگەی کەپران نزیکی سەردەشت دابەزین، چووینە لای نێزەڕۆ لەوێ سواری ماشێن بووین بۆ بانە، کە چووینە بانە حیزبی دیموکرات دەعوەتیان کردین و شەو لایان ماینەوە، بۆ بەیانی بەڕێکەوتین بۆ بلەکێ و لەوێوە بۆ چەمپاراو، دواتر لە سوورەبانەوە دابەزین بۆ سەرچەم، کە پێش ئێمە هەلیکۆپتەر لە کاروانچی دابوو کوشتاری زۆری کردبوو تەرمەکانیان لەوناوە بوون! شەو چووینە چاڵەخەزێنە لەوێ ئامرکەرتێکی یەکێتی لێبوو ناوی مامۆستا جەمال بوو شەو لەگەڵیان ماینەوە، بۆ بەیانی چووین بۆ سەرخوار لەسەر کانی و ئاوێك مامۆستا جەمال حەیوانێکی بۆ سەربڕیین و دەستمانکرد بە گۆشت برژاندن، هەلیکۆپتەر گەیشتە سەرمان خێرا ئاگرەکەمان کوژانەوە و خۆمان مات کرد، هەلیکۆپتەرەکان چەند جارێك سوورانەوە، بەڵام ئێمەیان نەبینی، دواتر چووین بۆ گوندی سەرخوار لەوێوە بۆ گوندی پاڕەزان، لەوێ شێخ دارا و فاتیح شوانیمان دی، پێکەوە چەند ڕۆژێك لەو گوندانە ماینەوە، دواتر بەرەو حاجی مامەند و شارباژێری تەخت چووین، لە عازەبان و بزەینان چەند ڕۆژێك ماینەوە و گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی.

له شەوی ٢٩ لەسەر٣٠ مـانـگـی ١١ی سـاڵـی١٩٨٢ شـانـەیـەکـی چەکداری سەر بە لقی سلێمانی کە من لێپسراوی بووم، بـۆ سـلـێـمـانـی دابەزین بۆ چالاکی، لە شەقامی برایم پـاشـا لـەگـەڵ هـێـزەکـانـی رژێـم بەرەنگار بووینەوە، بوو بە هۆی شـەهـیـدبـوونـی مـامـۆسـتـا حـەسـەن وێڵەدەری کە تازە لە هاندەران گەڕابووەوە، بەداخەوە پێشتر مامـۆسـتـا حەسەن بێ ئاگاداری من بە مامۆستا جەمالی وتـبـوو: مـن بـە کـەڵـکـی پێشمەرگایەتی نایەم با هاوڕێ حەمە سالح بمنێرێتەوە بۆ سلێـمـانـی بـۆ کاری حیزبی، ئەگەر بمزانیایە دەمناردەوە بۆ ناوشار بۆ کاری حـیـزبـی. هەر لەوکاتەدا ئەکرەمی ئاسنگەر لە سـلـێـمـانـیـیـەوە گـەڕابـووەوە بـۆ لقەکەمان بە داخەوە کەوتەناو کەمینی هێزەکانی رژێمەوە و گـیرا و بـێ سەروشوێن کرا. لە مانگی ٢ ی ١٩٨٠ جارێکیتر گـەڕایـنـەوە خـوارێ بـۆ بەری هۆمەراخ، باران دەباری و چەمی قەڵاچوالان زۆر زیادی کردبوو، لـە ماوەت بە دەلیل بە بواری ئاوەکەدا بۆ گـونـدی هـومـەراخ پـەڕیـنـەوە. ئیخباری کرابووین لە ماوەت و چوارتا لە کاتی پەڕینەوەدا کەمینمان بـۆ دانرابوو، زانیمان.. بۆیە ڕێگامان گۆڕی بۆ گوندی هۆمەراخ، بۆ بەیانی لە گوندی هۆمەراخ بە دووربین سەیری کەمینەکەمان دەکرد کـە بـە زیـلـی عەسکەری جوندییان بە چوار دەست دەخستەناو زیلـەکـەوە، دیـار بـوو سەرما پەلوبۆی شکاندبوون، دواتر دابەزین بۆ قەیوان و گوندەکانی دۆڵی جافایەتی، کۆبوونەوەمان بە دانیشتوانی گوندەکان دەکرد بۆ باسکردنـی شۆڕش و پێشـــــمەرگایەتی و نزیکەی یـــەك مانگ لەو ناوچەیە بـوویـن، تا ٢٤ / ٣ / ١٩٨٠.

## داستانی شەڕی قزلەر:

لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٠ لەگەڵ کۆمەڵێك هاوڕێ دابەزین بۆ ناوچەی دۆڵێ و قەرەچەتان، لەوکاتەدا ڕژێم زۆر لای مەبەست بوو کە ئەو مەفرەزە سەرەتاییانەی حیزبی شیوعی کە دابەزیبوون تێکیانبشکێنێت لە ڕێگەی پیاوەکانی خۆیەوە کە بەکرێگیرابوون بۆ چاودێریکردنمان.

هەفتەیەك پێش شەڕی قزلەر ئەبو زەهرە کە ناوی (معتصم عبدالکریم) بوو، لە قەسرەکەی بن شاخی پیرەمەگرون نزیك مەرقەدی پیرەمەگرون بە خەڵووز وێنەی پێشمەرگەیەکی کێشابوو کە کلاشینکۆفێکی بە شانەوە بوو کۆترێکی سپی بەسەر لوولەی کلاشینکۆفەکەوە بوو، نیشتبووەوە بەسەر لوولەکەیەوە و گوڵێکی سووری بە دەمی کۆترەکەوە نەخشاندبوو، چونکە خۆی وێنەکێشێکی باش بوو، وەك یادگارییەك تا چەند ساڵێك مابووەوە.

شەوی ٢٣ /٢٤ ی ٣ لە گوندی زێوێ بووین، چووم بۆ سەردانی دایکی مەلا خالید کە هاتبوو بۆ ماڵی حاجی قادر بە مەبەستی سەرەخۆشیکردن لێی، چونکە کوڕێکی لە ناوچەی دەشتی کۆیە شەهید ببوو، ئەم بنەماڵەیە شۆڕشگێربوون هەموو کوڕەکانی پێشمەرگەی یەکێتی بوون، دواتر دوو کوڕی تری شەهید بوون و ئێستاش دوو کوڕی ماون بە ناوی حەمەعەزیز و تاریق، پاش سەرەخۆشی گەڕامەوە بۆ مزگەوت و بەیانی زوو دەرچووین لە شوێنێکی قایم نانی بەیانیمان خوارد، کە کاری بەردەوامی ئێمە بوو بۆ ئەوەی کەشف نەبین لە لایەن بەکرێگیراوەکانی ڕژێمەوە، دواتر لە شاخی پیرەمەگرون چووینە خوارەوە، کات بوو بە ١١ی بەیانی، برادەران ئارەزوویان نەدەکرد بچنە

ناودێی قزلەر، بەڵام ژمارەیەکی کەم لە برادەران لەبەر هیلاکی ئـارەزووی پشوویان دەکرد، زۆریانکرد کە بچینە ناودێ و سەرەتای داستانەکە بوو.

لە بەرواری ٢٤ / ٣ / ١٩٨٠، ئەم داستانە روویدا لە کاتێکدا ئـێـمـە تە نها (١٦) پێشمەرگە بووین بەم ناوانە:

١. کەریم عەلی ناسراو بە حەمە صالّح قەرەچەتانی
٢. صالّح حاجی قادر ناسراو بە مامۆستا سەردار
٣. ماموستا جەمال حەمەئەمین
٤. ئەحمەد رەجب ناسراو بە ئەبو شەهاب
٥. بورهان ئەحمەد ناسراو بە عەتاخڕە
٦. صلاح ناسراو بە مامۆستا خالید
٧. سەرباز مەلا ئەحمەد بانیخێڵانی
٨. رەئوف رەشید ناسراو بە بێکەس
٩. عومەری زەراعە هەڵەبجەیی
١٠. محەمەد عەرەب
١١. ئەبو هێمن
١٢. معتصم عەرەب ناسراو بە ئەبو زەهرە
١٣. مامۆستا شاهۆ
١٤. کمال مام هەمزە
١٥. حەسەن رەشید
١٦. عومەر حمەبچکۆل

لەو داستانەدا کە زۆرێك لەو چەکانەی پێمانبوو ژێرسیٚ بوو، کاتژمێر ١١ی پێش نیوەڕۆ بوو، دوو هاوڕێمان پاسەوان بوون بە ناوەکانی ئەحمەد رەجەب و عومەر هەڵەبجەیی، من و عەتا خڕەش لەسەربانی ماڵێك لە تەنیشت مزگەوتەکە راوەستابووین و باقی برادەران لەناو مزگەوتەکە خەریکی خۆیان بوون و ئاگایان لە هیچ نەبوو، چوار کۆپتەر دەرکەوتن لە سلێمانییەوە بەرەو ئاسمانی دۆڵیٚ، بە عەتا خڕەم وت: برادەران ئاگاداربکەرەوە وا چەند کۆپتەرێك روویان لە ناوچەکە کردووە و لەوانەیە نیازی پەلاماری ئێمەیان هەبێت و زۆر وریابن! هاوڕیٚ عەتا چوو پێیووتن، بەڵام برادەران بە گورجی خۆیان ئامادەنەکرد.

کۆپتەرەکان روویان لە دۆڵەکە بوو لە پڕدا وەرگەڕانەوە بۆ سەر ئێمە، بەڵام لەبەرئەوەی وەرزی بەهار بوو دانیشتوانی گوندەکە بە رەزبڕینەوە خەریکبوون لە دۆڵێکدا لە بناری پیرەمەگرون ئاگریان کردبووەوە، کۆپتەرەکان پێش ئێمە ئەوانی گوللەباران کرد، مەلا عومەر مەلای مزگەوتەکە بوو قۆڵی شکابوو، دوای ئەوان هاتنەسەر مزگەوتەکە، دووانیان حەماڵ بوون دووانەکەی تر جەنگی بوون و شەڕ دەستیپێکرد، شەڕێکی قورس، یەکێك لە هەلیکۆپتەرەکان ئینزالی کرد، واتا سوپای دابەزاند کە بریتیبوون لە جاشە خۆفرۆشەکان و ئێمەش چووینە پشت مزگەوتەکە کە شوێنێکی لەباربوو بۆ شەڕ، من و هاوریٚ عەتا دەستمان بە تەقەکردن کرد لە کۆپتەرەکان و جاشەکان نەیانتوانی بێنەسەر مزگەوتەکە، بە ناچاری بەناو دێیەکەدا بڵاوبوونەوە، جاشێك چووبووە ماڵی حاجی قادر کە بەسەر ئەو رێگایەدا زاڵ بوو کە لێوەی سەردەکەوتین بۆ شاخەکە، بەداخەوە ئێمە ئاگامان لێی نەبوو، بووە هۆی شەهیدکردنی چوار پێشمەرگە. هاوریٚ عومەری زەراعە کوڕێکی زۆر

گورجوگۆڵ بوو زوو هەواڵی برد بۆ برادەرانی یەکێتی لە چۆخماخ. دوای شەڕێکی دەستەویەخە و شکاندنی دوژمن ئێمە خۆمان گەیاندە ناودێ، لە کاتێکدا ئەبوو هێمن لە ئاودەستی مزگەوتەکەدا قارەمانانە شەڕێکی زۆر باشی کردبوو، دواتر خۆی کردبوو بە ماڵی شێخ عوسماندا وتبووی: هەرچی بێت دەیکوژم ئەگەر هاورێ حەمە صاڵحی لەگەڵ نەبێت. دواتر برادەرانی یەکێتی دوای سەعات سێ هاتن بە هانامانەوە و شەڕەکە تادەهات گەرمتر دەبوو، من و رەئوف رەشید و سەرباز مەلا ئەحمەد و صاڵح حاجی قادر و جەمال حەمەئەمین لە شوێنێکی قایم لە پشت مزگەوتەکە بووین و هاورێ عەتا و ئەحمەد رەجەب ژێرسەیان پێبوو سەرکەوتن بۆسەر شاخ، بە باشی تەقەیان لە کۆپتەرەکان دەکرد، دوای ئەو چوار کۆپتەرە دوو کۆپتەری تر هات و دواتر چواری تر، لە دەوری کاتژمێر دوو کۆپتەرەکان قوات خاصەیان دابەزاند، مامۆستا خالید لە قەراخی گوندەکەوە سەرکەوت بۆ سەر شاخ، دواتر محەمەد عەرەب سەرکەوت.

لەم داستانەدا ٢٠ کۆپتەر بەشدارییانکرد بە هاوکاری قوات خاصە و جاشەکانی تاسلوجە و بنگرد و چوارتا، لەم داستانەدا زۆری سەرۆك جاشەکان پێکرابوون، دوای کاتژمێر چوار لەسەر شاخ برادەرانی یەکێتی هاواریانکرد ئێمە سەرشاخمان گرتووە لێیاندەن ئەو خۆفرۆشانە، برادەرانی یەکێتی بریتیبوون لە ئیسماعیل گەورەدێی و باباتایەر کە ئامرکەرت بوون، هەروەها مستەفا سەرگەڵوویی ئامرکەرت بوو لەگەڵ ئەحمەد کاکە رەزا کە رابەر سیاسی بوو لەگەڵ چەند کەسێکی تر بەداخەوە ناویان نازانم، کە دواتر هەندێکی تریانم ناسی دوای راپەڕین لەوانە: عەلی بەرزنجی کە ئێستا لە کۆمەڵەی پێشمەرگە دێرینەکانە و

سەلام قایكەنی و عیزەت شەمساوایی و كاكەبرا بەرزنجی و سیروان ولاغلۆیی و حمەعلی بەرزنجی و شەماڵە بچكۆل و مەحمودی كادر، لە كاتی شەڕدا مەلا حسەین بە لاماندا سەركەوت بۆ سەر شاخ، كە ناوی عومەری حەمەبچكۆل بوو، هاوارمان لێكرد وەرە لای ئێمە جێگامان زۆر باشە، بەڵام بە قسەی نەكردم سەركەوت بۆ سەر شاخ بە داخەوە كۆپتەر لێیدا و شەهیدی كرد، پاشان پێشمەرگەكانی یەكێتی هاتنەناو دێ، پێكەوە هێرشمانكردە سەریان و جاش و جەیش سەریان لێشێوا و فریانەكەوتن سواری كۆپتەرەكان بن بەرەو هەناران بە دوای كۆپتەرەكاندا رایانكرد، شەڕ تا كاتژمێر ٥ ی ئێوارە بەردەوام بوو، بەداخەوە ئەو هاوڕێیانەی لای مزگەوتەكە بوون هەموویان شەهیدبوون، دیار بوو هەموویان بە دەستی ئەو جاشە شەهید ببوون كە لە ماڵی حاجی قادردا بوو، شەو داهات و خەڵكی گوندەكەمان لێ كۆبووەوە لەگەڵ برادەرانی یەكێتی، شێخ عوسمان هاتە لام وتی: ئەوە برادەرێكی عەرەب لە ماڵی ئێمەیە دەڵێت هاورێ حەمە صالح بابێت. وتم: بابڕۆین كە چوومە ئەوێ هاورێ ئەبوو هێمن بوو هێنامە دەرەوە سەری برینداربوو، دواتر خەڵكی گوندەكە وتیان: ئێمە ئەم شەهیدانە لێرە دەنێژین، شەهیدەكانمان بە خاكسپارد لە قزلەر و ناوی شەهیدەكانم دانێ لەسەر كێلەكانیان بینووسن، بەڵام شە هید مەلا حسەینمان لە چۆخماخ بە خاكسپارد.

شەهیدەكانی گوندی قزلەر ئەم ناوانەن:

١. موعتەسەم، ناسراو بە ئەبو زەهرە. ئەم برادەرە عەرەبە نووسەر و نیگاركێش و هونەرمەند بوو، نەمدەویست بێتەخوارەوە، بەڵام ئەجەل وای لێكردبوو، دەیویست بە زۆر بێتەخوارەوە، منیش بۆ ئەوەی نەیەتە

خوارەوە ریشێکی زەردی تەنکی باریکی هەبوو وتم: دەبێت ریشت بتاشی ئینجا بێیت، ریشی تاشی بۆ ئەوەی بێت. بەداخەوە کە شەهید بوو.

٢. مامۆستا شەفیق، ناسراو بە شاهۆ. ئەم برادەرە مامۆستای زمانی ئینگلیزی بوو لە ئامادەیی رۆشنبیر لە سلیمانی، زۆر رۆشنبیر بوو، نەمدەویست بێتەخوارەوە ئەویش بە زۆری خۆی هات لەگەڵمان، بەداخەوە کە شەهید بوو.

٣. عومەر حەمە بچکۆل ناسراو بە مەلا حسەین. پیاوێکی ئازا و پێشمەرگەی مەیدانی بوو بەداخەوە کە شەهید بوو.

٤. حەسەن رەشید ناسراو بە ئەبو فەلاح. ئەویش پیاوێکی ئازا بوو پێشمەرگەی مەیدانی بوو بەداخەوە کە شەهید بوو.

٥. کمال مام هەمزە، زەحمەتکێشێکی ئازا بوو ئەو رۆژە سەرەی کۆڵهەڵگرتنی شەکروچای ئەو بوو، کە چوومەسەر تەرمەکەی چەند گوللەیەك بەر قۆری چاکە کەوتبوو، ماتەمینی دایکردم کە ئەو رۆژە ماندووبوونی پێوە دیاربوو بەداخەوە کە شەهید بوو. رەئوف رەشیدمان لەگەڵ بوو نەماندەزانی چۆن پێیبڵێین و سەرەخۆشی لێبکەین، بۆ شەو چووینە چۆخماخ و مەلا حسەینمان بە خاکسپارد.

داستانی قزلەر مێژوویەکە بۆ سەروەری هەردوو حیزب (حیزبی شیوعی عیراق) و (یەکێتی نیشتمانی کوردستان).

بۆ بەیانی لە شەدەڵە و دۆڵەڕووتەوە لە لایەك و لە کارێزەوە لەلایەکی ترەوە رژێم شاڵاوێکی بەربڵاوی کردەسەر ناوچەکە، لە لای کارێزەوە کە ئەفسەرێکی سەرشێت هێرشی کردبوو بۆ وڵاخلو، دوژمن شکێنرا بەسەربەرشتی مستەفا چاوڕەش کە سەرتیبی قەرەداخ بوو لە

ولاغلووەوە هاتبوو، بەڵام لای هەنارانەوە کەسی لێنەبوو بەرگری بکات و خۆفرۆشەکان هاتنەسەر قزلەر و شەهیدەکانیان دەرهێنا و بردیانەوە بۆ مەیتخانەی سلێمانی، نامەم نووسی بۆ برادەرانی ناوشار ناوی ئەو شەهیدانەم تێدانووسی بۆ ئاگادارییان، نامەیەکی ترم بە خزمێکی خۆماندا ناردەوە بە ناوی عەبدوڵلا وەسمان، بۆ ئەوەی هەموو کەسوکاری پێشمەرگەکانی حیزب نەکەونە گەڕان بۆ ئەوەی بزانن کێ شەهید بووە و زۆر نەگەڕێن بەدوای ناوی شەهیدەکاندا، چونکە قومری خێزانم چووبوو بۆ مەیتخانە بزانێت منی تێدام، چونکە هەواڵی شەهیدبوونی من و هاوڕێکانم چووبووەوە بۆ هەموو شار، بەڵام لە نەخۆشخانە محەمەد کریمی دراوسێمانی دیبوو وتبووی: ئەوی تێدا نییە، من کاك حەمەکەریم دەناسم هەموو تەرمەکانم بینیوە. دوای نامەکە روون بۆوە کە کێ شە هید بووە.

رۆژێك لەو جێگایە باسی شەڕی قزلەر کرا لە گۆڤاری پێشمەرگە لە لایەن عەلی بەرزنجییەوە، ئەوکاتە گەنجێکی ٢٠ ساڵان بوو، باسی لێپرسراوی مەفرەزەکەی حیزبی شیوعی دەکرد منی باش نەدەناسی، برادەرێ بە عەلی برزنجی وت: ئەو حەمە صاڵحە دەناسی؟ وتی: نەوەڵا نایناسم. لە کاتێکدا لەلایەوە وەستابووم! برادەرەکە وتی: ئەوەتا لاتەوە وەستاوە، ئەوە حەمە صاڵح قەرەچەتانییە!؟ ئیتر لەوکاتەوە لەگەڵیدا برادەرم. سەلام خوشکەزای مەجید قادر قایکەندی ئەوکاتە پێشمەرگەی یەکێتی بوو تا ئێستا منی خۆشدەوێت و لەگەڵ بینینی محسینی برای هەواڵپرسینی سەلامی برایم پێڕادەگەیەنێت. ئەو برادەرانەی کە ماون لە ژیاندا و لەو داستانەدا بەشدار بوون: عە تا خڕە کە خزمی خۆمە لەگەڵ جەمال حەمەئەمین لە ناو حیزبی شیوعیدا درێژە

بە خەبات دەدەن، ماموستا سەردار و ئەحمەد رەجەب و بێکەس لە هاندەرانن.

ئەم داستانە لە کاتێکدابوو ژمارەی پێشمەرگە کەم ببووەوە، لەبەر ئەوەی دوای لێبووردنی ١٦ / ٨ / ١٩٧٩ لە لایەن رژێمەوە، چەندین هاورێمان تەسلیمبوونەوە، وەکو: حمەسوەیلە، نوری حاجی گورون، جلال، غەنی نەمەڵی) و چەند کەسێکی تر.

دووبارە هاتینەخوارێ، بەداخەوە مامۆستا عەلای برای مامۆستا بهادین نوری لە یاداشتەکانی خۆیدا لە کتێبی هەوراز و نشێودا دەڵێت: کمال مام هەمزە بە تەیارەکانی رژێم لە نزیك قزلەر شەهید بووە، کە کمال مام هەمزە بە دەستی خۆفرۆشێك لەناو گوندی قزلەر شەهید بووە و نیشانی نەداوە لەگەڵ چ مەفرەزەیەك شەهیدبووە و کێی لەگەڵ بووە، کە ئەم داستانە هەموو حیزبەکانی هەر چوار پارچەکەی کوردستان باسیان کردووە، کە بە چەند چەکێکی خراپ و ژمارەیەکی کەمی پێشمەرگە رووبەرووی رژێمی بەعس بوونەتەوە.

دوای شەڕەکە بە چەند رۆژێك گەڕاینەوە بۆ زەڵێ، لە گەڕانەوەمان هەرکەسێك تووشمان دەبوو سەرەخۆشی لێدەکردین بۆ شەهیدەکان و دەستخۆشی ئەو چالاکییەیان لێدەکردین. هەتا چووین بۆ سەردەشت بۆ کەبابخانەی عەلی قەڵادزێی کە کەبابی عێراقی هەبوو، سەرتیپێکی یەکێتی بە ناوی عومەر جامیعە ناسرابوو بە ئاوات پارەی هەمووماني دا و زۆر دەستخۆشی ئەو چالاکییەی لێکردین و وتی: ئێوە بۆ هەموو کوردستانتان سەلماند کە بە بیروباوەڕی شۆڕشگێرانە شەڕدەکەن، هەتا ئاربێجیتان پێنەبوو نەتانهێشت کۆپتەر لێتان نزیك بێتەوە ! ؟ کە گەڕاینەوە بۆ زەڵێ سەرکردایەتی هەموو حیزبەکان هاتن

بۆ لامان، لەبەرئەوەی یەكەم چالاكی بوو كە حیزبی شیوعی ٥ شەهیدی هەبێت و لە ناوگونددا شەڕی دەستەویەخە بكرێت، یەكێك لەوانە كاك نەوشیروان و مولازم عومەر بوو وتیان: دەبێت ئەم داستانە بۆ هەموو پێشمەرگەكان بڵاوبكرێتەوە كە لەمەودوا پێشمەرگە لەكاتی شەڕدا نابێت گوندەكان بەجێبێڵن، بۆ ئەوەی كۆپتەر شەهیدیان نەكات و باشتروایە لەناو گوندەكان بەرگری خۆیان بكەن، ئەمە تاقیكردنەوەیەكە بۆ پێشمەرگە كە كۆپتەر نەیتوانیوە پێشمەرگە بشكێنێت و وانەیەكە بۆ پێشمەرگەی هەموو لایەنەكان.

رۆژنامەكانی حیزبە موعارەزەكانی عیراق و ئێران بە زمانی عەرەبی و فارسی و كوردی ئەو داستانەیان بڵاوكردەوە بۆ خەڵك، تەنانەت لە سوریاش بە هەمانشێوە باسی ئەو داستانە كراوە، لەوانە حیزبی شیوعی سوری و حیزبی دودەی ئێران بە مانشێتی گەورە لە سەروتاردا باسیان كردووە. دوای شەڕی قزلەر برادەرانی یەكێتی چەكیان بۆ هات، كۆمەڵێك چەكی باشیان داپێمان لەبەر ئەوەی دەیانزانی كە ئێمە دەتوانین شەڕ بكەین و شكست بە دوژمن بهێنین.

لە گوندی قزلەر كریم سلێمان زۆر هاوكارمان بوو، پیاوێكی زۆر موجامیل و قسەخۆش بوو، لە خزمەتی هەموو لایەنەكاندا بوو، هەر كاتێك لە سلێمانی كەلوپەلم بۆ بهاتایە دەیانبرد بۆ ماڵی كاك كەریم لە قزلەر. جارێك كاك كەریمم بینی كلاشینكۆفێكی موزەڵی پێبوو، پێموت: خێرە بوویت بە پێشمەرگە؟! لە وەڵامدا وتی: نەخێر نەبووم بە پێشمەرگە، چونكە كاری شۆفێری دەكرد. لەوكاتەدا عەشرەتی جاف و عەشرەتی شیلانە بە شەڕ هاتبوون، وتبووی: دەبێت منیش بچم. منیش وتم: خۆ تۆ جاف نیت بۆ وا خۆت بەستووە!؟ پێكەنی وتی: كەس وەكو

من جاف نییە لێیدا و ڕۆی، تا ئەو چوو شەڕ تەواو بوو! ؟ دوایی هاتەوە و دەستی بە کاری شۆفێری کردەوە، بەڵام لە ساڵی ١٩٨٥ لە لایەن ڕژێمەوە گیرا و خۆڕاگربوو هیچی لەسەر ئاشکرا نەبوو ئازادکرا.

لە هاوینی ١٩٨٠ دوای شەڕی قزلەر ڕژێم زۆر بەچڕی چاودێری گوندی زێویێ و قزلەری دەکرد، ڕژێم کۆمەڵێك بە کرێگیراوی خۆی ناردبوو بۆ زێویێ بە ناوی حیزبی دەعواوە، لەوێ ویستبوویان بەڕێیان بکەن بۆ قزلەر، ڕۆژێك لە زێویێ مابوونەوە دوایی بە کوێخای گوندەکەیان وتبوو: ڕەوانەی قزلەرمان بکەن، خەڵکی گوندەکە پاش خزمەتکردنێکی زۆر ڕەوانەی قزلەریان کردبوون. کە دەبووایە کوێخا کە ناوی کوێخا عەزیز بوو هەواڵی بە ڕژێم بدایە، بەڵام لەبەر نیشتمانپەروەری خۆی هەواڵی نەدابوو بە ڕژێم و ئاگاداری ئەو پلانەی ڕژێم نەبوو. لە دائیرەی ئەمن بانگیان کردبوو پیانوتبوو: مەفرەزەی حیزبی دەعوا لە زێویێ بووە، ئەویش نکۆڵی کردووە بەهۆیەوە تا ئێستا بێسەر و شوێنە و کەس نەیزانی چۆن شەهیدیان کرد، خوالێیخۆش بێت.

لە هاوینی ١٩٨٠ شێخ کاوەی حەفید هاتەدەرەوە کە نزیکەی ٦ پێشمەرگەی لەگەڵ بوو کە خەڵکی سیتەك بوون، لە بارەگای ئێمە لە تووژەڵە میوان بوو لەسەربانی ئاشەکە نووستبوو، لە کاتی نیوەڕۆدا لە پڕ سمۆرەیەك گوێزی بەردەدایەوە و دەیبرد بۆ کونەکەی، بەڕێکەوت گوێزێکی بەردایەوە بەر لاچاوی شێخ کاوە کەوت، کاتێك خەبەری بووەوە وتی: حەمەکەریم ئەوە چی بوو! ؟ وتم: سمۆرەیە! یەکسەر دەستی بۆ تفەنگەکەی برد و وتی: لە نییەتی چەقۆ سمۆرەی پێکاو بەریدایەوە.

یەکێك لە پێشمەرگەکانی شێخ کاوە هەر بۆڵەبۆڵی بوو دەیووت: من بۆ شەش حەوت ڕۆژ هاتووم ئەڕۆمەوە، شێخ تووڕە بوو لێی رادیۆکەی ئەحمەدی مارفی تێکرد دای بە پشتیدا، پێشمەرگەکە هاواری پشتی کرد وتی: بابەڕۆ پشتم شکا! خوالێخۆش بوو ئەحمەدی مارف رادیۆکەی هەڵگرتەوە و وتی: بە خوا رادیۆکەی شکاندم، خەمی پشتی کابرای نەبوو!؟ دوای چەند ڕۆژێك خەریکی خۆئامادەکردن بووم بۆ جەولەی ناوچەی دۆڵێ، شێخ کاوە زانی کە دەچمەخوارەوە هات بۆ لام وتی: دەچیتە خوارەوە؟ وتم: بەڵێ. وتی: راسپاردەیەکم هەیە دەبێت وەکو خۆی بیگەیەنیت. وتم: بەسەرچاو. وتی: کە چوویتە مالومە بچۆ بۆ لای حاجی قادری دێگەڵ خوالێیخۆش بێت، پێیبڵێ هەر لە تووژەڵەوە تا مالومە سەلام لە دێگەڵ دەکەم. منیش وتم: ئاخر جوێن دەدات! وتی: دەزانم، منیش ئەوەم دەوێت، بە گۆڕی شێخ لەتیف قسەت لەگەڵ ناکەم ئەگەر پێینەڵێیت، منیش وتم: دەیگەیەنم.. چی دەڵێت با بیڵێت. کە چوومە خوارەوە چووم بۆ مالومە و سەردانی حاجی قادرم کرد وتی: دەڵێن شێخ کاوە رایکردووە و لای ئێوەیە! منیش وتم: کاك حاجی لای ئێمەیە، بەڵام شێخ پێیوتووم هەر لە تووژەڵەوە تا مالومە چاوی دێگەڵ ماچ دەکەم. ئەویش دایکی هەردووکمانی بێبەش نەکرد لە جنێو، دواتر پەشیمان بووەوە و وتی: کەریمی حاجی عەلی هەڵەت پێکردم! وتم: شێخ کاوە رایسپاردووم، جگە لەوجارە وشەی دێگەڵم بەکارنەهێناوە لەلای! کە چوومەوە بۆ تووژەڵە بۆ شێخ کاوەم گێڕایەوە، شێخ کاوە بە چوارپەل سەمای دەکرد لە خۆشیدا دەیووت: بە قوربانی سیلاحەکەی بم.

لە جەولەیەکی ساڵانی ١٩٨١ چووین بۆ ناوچەی قەڵاسێوکە، لەوێ مانەوە و دواتر چووینە گوندی عەسکەر بەڕێکەوت لە ماڵێك دامەزرام پیرەمێردێك و پیرەژنێکی لێبوو بە تەنها دەژیان، پیرەمێردەکە ریشێکی زۆری هەبوو پێمووت: خاڵە بەم ریشەوە زۆر بێتاقەت و خەمبار دەتبینم! ؟ خۆی بۆ رانەگیراو دەستی بە گریان کرد! وتی: من باوکی مەلا زەوقیم، کوڕەکەم لە گوندی قزلەر گرتوویانە و دواتر تەسلیمی رژێمیان کردووە، ئیتر چۆن خەمبار نەبم و رووناکی لە دڵمدا بێت، دواتر ئەو دڵخۆشی منی دایەوە و دەیووت: ئێوە هەمووتان کوڕی منن، نانەکەت بخۆ کە چاوم بە پێشمەرگە دەکەوێت وا دەزانم مەلا زەوقی گەڕاوەتەوە. دواتر بۆ برادەرانم گێڕایەوە و ئەوانیش زۆر نیگەران بوون کە ئەو ژن و پیاوە پیرە ئاوهایان بەسەرهاتووە.

لە کاتی پێشمەرگایەتیدا چەند ماڵێك هەمیشە لە خزمەتکردنماندابوون کە جێگای رێزە و هەمیشە لەبەرچاومانە وەکو: ماڵی عوسمانی شێخ عارف و کەریمی مام سلێمان و قادری برای کە خەڵکی گوندی قزلەرن، قادری کوێخا تۆفیق و مام رەشید لە گوندی چۆخماخ، عەبدوڵلای مام وەسمان و ئەحەگوڵە لە گوندی مالومە، ماڵی حەمەی سوارە و براکانی لە گوندی هەڵەدن، ماڵی خدر سعید رەش و محەمەد سمایل و محەمەد کوێخا پیرۆت لە گوندی گەڕەدێ، ماڵی عەلی مام براهیم و مارف مام رەشید و براکانی لە گوندی گاپیلۆێن، ماڵی شێخ حسەین لە گوندی قەیوان، ماڵی حاجی عەبدوڵلا و کوڕەکانی لە گوندی ولاغلو بە تایبەتی عومەری کوڕی کە خێزانی برادەرانی بۆ دەگەیاندینە بێتووش، بە داخەوە هەتا ئێستا نەمتوانیوە پاداشتی ئەو برادەرانە بدەمەوە.

حیزب بە چاکی زانی بۆ بەرزکردنەوەی باری دەروونی پێشمەرگە بە قەبارەیەکی باشتر دابەزین بۆ خوارەوە کە بیست و دوو پێشمەر گە دەبووین و چەکەکانمان لە چاو جاران باشتربوو، تا قەرەچەتان چووین ئەمجارە عەبدولله رەمەزان کە ناسرابوو بە جوامێر و قادر کە خەڵکی کلێسە بوو لەگەڵ سامی وەستا سابیر لەگەڵمان بوون، بەڵام مانگی ٥ / ١٩٨٠ بۆ زیاتر لە مانگێك لە خوارەوە بووین، جوامێر پیاوێکی ئازا و بەوورە بوو، بەڵام قادر هەر بۆڵەبۆڵی بوو. ئەوکاتە گوندی قزلەر چۆڵکرابوو نەمزانی بۆچی!؟ بەڵام ئێمە چووینە مێرگەپان چەند رۆژێك لەوناوە بووین لەو ماوەیەدا تووشی هیچ نەبووین و گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی بۆ زەڵێ کە بارەگای زستانەی حیزبی لێبوو.

لە مانگی ٦ / ١٩٨٠ سەردانی بارەگای هەولێرمان کرد، من و عەتا و ئەحمەد رەجەب و دکتۆر فارس لە دۆڵی ناوەنگ بوون، کە چووین هەموویان پێدەکەنین و مەلا نەوتە لە هەموویان زیاتر پێدەکەنی، کانەبی چاوڕەش و مەلا حەسەن پێشوازییان لێکردین و چووین دانیشتین و وتمان: بۆ پێدەکەنن!؟ وتی: ئەوە شەڕە ئاو دەکەن، مەلا نەوتە گۆپارەکەی دەدا بە ئاوەکەدا و برادەران تەڕ دەبن، بۆیە پێدەکەنن. دکتۆر فارس سەری خستە پەناگوێم وتی: ئەوە پێکەنینی دەوێت!؟ وتم: ئەی قسەی خۆش نازانن، چۆن پێبکەنن!!؟ دواتر گەڕاینەوە بۆ زەڵێ. لە زەڵێ نەخۆشخانەیەکی گەورەی لێبوو لەوێ خۆم فێری دەرزی لێدان دەکرد بە سەرپەرشتی دکتۆر دڵشاد و دکتۆر ئەلیاس و دکتۆر صادق. دکتۆر دڵشاد ژنەکەی لەگەڵ بوو کە کچی سەلام عادل بوو کە سکرتێری حیزب بوو لە ساڵی ١٩٦٣ لە سێدارەدرا لە کاتی ئینقلاب دژی عەبدولکەریم قاسم.

من نەخۆش بووم دەوری موزەمیدم دەبینی، خەڵکی ئەو ناوچەیە سوودیان لێدەبینی بۆ چارەسەرکردن، رۆژێك نەخۆشێك هاتبوو بە دەنگی بەرز دەیووت: دکتۆر صالّح لە کوێیە؟! بە دکتۆر دلّشاد رازی نەببوو! ! دکتۆر تووڕە ببوو لێی و پاڵی پێوەنابوو بۆ دەرەوە و پێیوتبوو: یا معود شنو دکتۆر صالّح ما یعرف تمریس!؟ من چووم کابرام هێنایەوە ژووریّ و دلّنەواییم کرد و تێمگەیاند کە من دکتۆر نیم و ئەوان دکتۆرن و تەنها ئەتوانم دەرزی لێبدەم. دکتۆر دلّشاد دلّی چاك بووەوە و چارەسەری بۆ کرد و ئاشتی کردەوە، دوای رۆیشتنی کابرا دەستمان بە پێکەنین کرد.

لە هاوینی ١٩٨٠ لەگەڵ حمەسعید قەرەداغی لە رێگەی پارتی دیموکراتەوە بەڕێکەوتین بۆ تاران، لە گوندی داوداوی زۆرمان پرسیبوو بسکیت و ساردیمان خوارد، لە دوکانێك دوو خوشکی لێبوو زۆر پرسیاریان دەکرد من تاقەتی ئەوەم نەبوو وەڵام بەمەوە، حەمە سعید وەڵامی دەدانەوە، هەواڵی دکتۆریان دەپرسی و ئەیانووت: عێراقییەکان دکتۆریان لەگەڵە، حەمەسعید وتی: ئەم برادەرە دکتۆرە! منیش نەموویست تەریقی بکەمەوە وتم: من هیچم پیّ نییە بۆ چارەسەرکردن. دواتر چووین بۆ شیناوە ئەوکاتە مولازم عەلی لەویّ بوو کە ئێستا پێیدەڵێن زەعیم عەلی. بەرگەی بۆ کردین بۆ ئورومییە واتە رەزاییە. کە چووینە ئەویّ خاڵە حاجی لەویّ بوو بەرگەی بۆ کردین بۆ تاران، کە چووینە تاران لەویّ کێشە لە نێوان خومەینی و حەسەن بەنی صدر هەبوو، لەسەر خیابانەکانی تاران دەبابە دابەزی بوو، لەویّ حەمەڕەشید قەرەداغیمان بینی ئەویش بۆ چارەسەر لەویّ بوو ئازاری گورجیلە و میزەڵدانی هەبوو، نزیکەی مانگێك لەویّ بووین حیزب خانوویەکی بە کریّ

بۆ گرتبووین و صالّح مامۆیی خەرجی بۆ ئەكردین. جارێك هات وتی: كیلۆیەك توخمە مرخم كڕیوە، ئێمە پێمان سەیر بوو وامانده‌زانی گاڵتە دەكات! سەیری یەكمان دەكرد دواتر زانیمان لەوێ هێلكە بە كیلۆیە.

دواتر گەڕاینەوە بۆ بێتووش هەر هاوینی ١٩٨٠ گوندی بێتووشمان بەجێهێشت و چووین بۆ لاقەدی زەرتك كە كوێستانێكی سارد بوو پێیاندەووت: دۆڵی مووسا.

لە مانگی ٧ / ١٩٨٠ مام عەلی كە ناوە ئەصلییەكەی هیدایەت بوو، تووشی نەخۆشی اعصاب ببوو، لەگەڵ براكەی كە ناوی گۆران بوو چووبوو بۆ سەردەشت بۆ چارەسەركردن، لەوێ چووبوو بۆ حەمامی نمرە كە ژنان لەبەرێك و پیاوان لە بەرێك دانیشتبوون بۆ سەرەی حەمام، هەر كەسە و حەمامی خۆی جیابوو، مام باوەشی كردبوو بە ژنێكدا و ماچی كردبوو وتبووی: هاتووی بۆ لای من!؟ دواتر برا و كەسوكاری ژنەكە پێیانزانی بوو هاتبوون بۆ لێدانی مام و دەستیان كردبوو بە لێدانی مام عەلی، گۆرانی برای هەرچەند وتبوی: نەخۆشە و پیاوی چاك بن لێی مەدەن، بەڵام سوودی نەبوو، دواتر لە گۆرانیشیان دابوو.

لەو ساڵەدا مام عوسمان كۆیی گەڕابووەوە بۆ ناوشار بۆ كاری حیزبی، بەداخەوە گیرا و بێسەروشوێن كرا، دواتر لە سێدارەدرا، كوڕێكی لەگەڵ ئێمە ببوو بە پێشمەرگە ناوی عەلی بچكۆل بوو زۆرمان خۆشدەویست، چونكە باوكی نەمابوو خۆشی كوڕێكی قسەخۆش و سوبعەتچی بوو دایم پێدەكەنی لە پاداشتدا هەر چەكێكی باشمان هەبووایە دەماندا بەو، ئەگەر موزەڵی بووایە نەماندەدا بە جەلال عەلی كە زۆر حەزی لێبوو خۆی پێوە دەربخات.

لە ساڵی ١٩٨٠ پەیوەندیمان لەگەڵ کەرتی ئیسماعیل گەورەدێی سەر بە هەرێمی چواری یەکێتی زۆر پتەو بوو، چالاکیمان پێکەوە دەکرد لەسەر ڕێگای سلێمانی دوکان، ئەم کەرتە زۆر حەزیاندەکرد لەگەڵ ئێمە جەولە بکەن، بەڵام بەداخەوە شەڕی نەگریسی ناوخۆ وایکرد ئەو برادەرانە شەهید بن.

## شەڕی ناوخۆی نێوان حسك و یەکێتی:

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ لە گوندی سێکانیان لە ناوچەی دۆڵێ ئەم شەڕە ڕوویدا، لە کاتێکدا یەکێتی هێزێکی زۆری لە گوندی سەرگەڵو کۆکردبوەوە، شەهید جەمالی عەلی باپیر لەگەڵ مەفرەزەیەکی ١٥–٢٠ کەسی هەڵبژاردە لە هێزەکەی سەرگەڵو بەرەو گوندی سێکانیان بەڕێدەکەوێت بۆ سەردانی شەهید شێرکۆی شێخ عەلی، لەسەر کانی و ئاوەکە دانیشتبوون، نێوانی ئەم دوو شەهیدە زۆرخۆش بوو وەکو برا وابوون، پێشتر شێرزادی برای شەهید شێرکۆ وتبووی: یەکێتی دێن بۆ لێدانی ئێمە، بەڵام شەهید شێرکۆ باوەری نەکردبوو بە شێرزادی برای و وتبوی: جەمال وەك برای منە، شێرزادیش لە مەفرەزەکەی شێرکۆ دادەبڕێت و بەرامبەر کانی و ئاوەکە خۆی ئامادە دەکات و سەنگەر دەکرێت بۆ هەر کارێکی نەخوازراو، بەداخەوە ئەم دوو شەهیدە دەست دەکەن بە شەڕ و کووشتار، بەداخەوە کورد دوو جوامێری وای لە دەستدا، کە ڕژێم بە شەهیدبوونیان ئاهەنگیان گێڕابوو، شەهیدەکان ئەم ناوانە بوون

١. شەهید جەمال عەلی باپیر، فەرماندەی هەرێم
٢. شەهید ئیسماعیل گەورەدێی، فەرماندەی کەرت

٣. شەهید حەسەن قارەمان، فەرماندەی کەرت

٤. شەهید ئەنوەرعەبدوڵڵا مەلا صالح، فەرماندەی مەفرەزە

٥. شەهید کاروان قشلاغی، پ. م

عومەر کۆکۆیی و چەند کەسێکی تر برینداربوون

دوای شەڕەکە هەردوولایان بەدوای یەکتردا دەگەڕان، چونکە هەردوو لایەن پەردەوازە ببوون، زۆربەی پێشمەرگەکانیان کەوتنە لای من، منیش بە ئەمانەتەوە بە لایەنەکانی خۆیانم گەیاندەوە، کاتێك تەرمەکەی شەهید ئەنوەر لە لایەن حمەتاڵی مامی شەهیدەوە ڕەوانەی سلێمانی کرایەوە، لە گوندی قزلەر لەسەر تەرمەکەی وتارێکم پێشکەشکرد و ئەو شەڕەمان تێدا مەحکوم کرد، کە تێیایدا دوو هاوڕێی زۆر خۆشەویستم لە دەستدا، کاك حمەتاڵ دەستیکرد بە گریان و منیش دڵخۆشیم دایەوە، چونکە شەهید ئەنوەرم زۆر خوشدەویست.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ لایماڵەکانی قزلەر دوو حەیوانمان کڕیبوو، نزیکەی ٢٥ پێشمەرگە دەبووین، برادەرێکمان ناوی زەکی بوو خەڵکی کەرکوك بوو، چووبووە سەرکانی و ئاوەکە دەستی کردبوو بە دەست بەئاوگەیاندن، عومەر حامید هات وتی: برادەرێك چووە دەستی بە ئاوگەیاندووە لەسەر ئاوەکە، با خۆی قسە بکات بڵێ من بووم، ئەگینا لێکۆڵینەوە دەکەین و دواتر سزای دەدەین. دواتر بە منی وت: زەکی بووە با تووڕەی بکەین، زەکییان تووڕە کردبوو وتبووی: لەسەر دەست بەئاوگەیاندن سزام دەدەن قبوڵی ناکەم، پێمانووت: باشە تۆ لە سەرەوەی ئاوەکە دەست بە ئاو دەگەیەنیت و ئێمەش لە خوارەوە بەکاریدێنین بۆ ئاوخواردنەوە ئەی ئەمەیان قبوڵە ! ؟ بۆ خۆشی ٣ ڕۆژ چەکمانکرد و گوللە ئاربێجیمان پێهەڵدەگرت.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٠ جارێك لەگەڵ مەحمود دیکتارۆف و جەزای ئەستێل، بێتەلێکی رەقەم ١٠ مان هێنابوو بۆ ئەوەی تاقیبکەینەوە، بۆ ئەوەی بزانین پەیوەندیمان دروست دەبێت لەگەڵ سەرکردایەتی لە خوارەوە، چووینە گوندی مالومە و پیاوێکی گوندەکەمان بەکرێ گرت ناوی مەجید بوو، بێتەلەکەمان پێهەڵگرت بۆ سەرشاخی ئاسنگەران، بەڵام زۆر هەوڵماندا پەیوەندی بکەین بە سەرکردایەتی نەمانتوانی، دوای ١٠ رۆژ گەڕاینەوە بۆ بێتووش بۆ بارەگای لق.

لە مانگی ٨ / ١٩٨٠ ئەبو سەلام (بەهادین نووری) و مەلا عەلی و سەید تۆفیق بانگیان کردم بۆ بارەگای سەرکردایەتی، پێیانوتم: بچۆ بۆ ناوچەی ئالانی ئێران بزانە لەبارە بۆ دانانی بارەگای سەرکردایەتی کەرکوك و سلێمانی؟ منیش مەفرەزەیەکم برد بۆ ناوچەکە و شەوێك لە کونە مشکێی لای بێوران ماینەوە، بورهان شێخ ئەحمەدمان لەگەڵ بوو کە پێیاندەووت سامان و پورزای بێکەس بوو خەڵکی گوندی داری زیاین بوو لە قەرەداخ، بڕیارماندابوو کە بچووینایە بۆ هەر گوندێك شەو بماینایەتەوە یەك کەسمان دەبوو بە خەفەری پاککردنەوەی مزگەوت لە پێش بەجێهێشتنی گوندەکە، پێش بەجێهێشتنی گوندەکە من دوا نەفەر دەڕۆیشتم، برادەرێك هات وتی: ئەو چەکە هی کێیە؟ وتم: بیهێنە بۆ لام من ئەزانم هی کێیە، چەکەکەم لەگەڵ خۆم برد کە نزیك بێوران بوومەوە، سامان دوامکەوت و وتم: ها سامان چیت ئەوێ؟ وتی: بێقەزابیت ئێوە ئەوەندە عەجەلە ئەکەن چەکەکەم لێبەجێماوە! وتم: خەمت نەبێت وا لای منە و دەبێت جارێکیتر ئاگات لە چەکەکەت بێت. وتی: باشە، بەڵام قایشی رەزنەکەم گرتبوو وامزانی چەکەکەیە. ئێستا لێپرسراوی کۆمیتەی پێشمەرگە دێرینەکانە، دەبێت ئەوەی لەبیر بێت!؟ کە گەیشتینە بێوران

نان و خواردنمان بۆ مزگەوت بۆ هات کە دەستووریان بوو، من سەروپێم بەرکەوت و هی وا هەبوو نان و پەنیری سوێری بەردەکەوت، خۆمان و شانسی خۆمان، دواتر گەیشتینە گوندی بێتووش لەوێ سەردانی چەند ماڵێکم کرد، لە بێتووش کە کەسوکاریان خەڵکی گوندی کۆکە بوون، لەگەڵ قەرەچەتانییەکاندا خزمایەتی ژن و ژنخوازییان هەبوو، وەکو مەلا محەمەد و قازی عەبدوڵڵا و قازی ئیبراهیم و مام قادر، پاش هەفتەیەک گەڕامەوە بۆ سەرکردایەتی و راپۆرتێکم نووسی بۆیان، کە ناوچەیەکی لەبارە بۆ بارەگا، چونکە خەڵکی ناوچەکە هاوکاریمان دەکەن و لە سنووری عێراقەوە نزیکە، لە کۆتایی ئەو مانگەدا بڕیاریان دا کە بارەگا بگوێزنەوە بۆ بێتووش. لە مانگی ٩ / ١٩٨٠ لە کاتێکدا بوو شەڕی ئێران و عێراق دەستیپێکرد ئێمە لە بێتووش بووین، چەند ژوورێکی لێبوو لەسەر دێبەرەکانیان خۆشمان چەند ژوورێکمان لە تەنیشتی دروستکرد، چووین بۆ دارهێنان لە بەشی خاکی عێراق کە پێیاندەوت: سەر قەدەخە کە داری باشی لێبوو بۆ دارەڕێی خانوو، هەر کەسە و دارێکی بەشان دەهێنا یان بە دوو کەس دارێکیان دەهێنا ئەگەر قورس بووایە، هەروەها دارمان بۆ سووتاندن دەهێنا لە هەمان جێگا، خەڵکی ئێران نەیاندەهێشت دارەکانیان ببڕین.

دکتۆر دڵشادمان هێنابووەوە بۆ ئەوێ و نەخۆشخانەیەکمان بۆ دروستکرد بۆ چارەسەرکردن، کە خەڵکی ئەو ناوچەیە سوودی لێدەبینی بە تایبەتی گوندەکانی بێتووش و دەرماناوێ و هەرزنە، دکتۆر فارسیش یارمەتی دەدا، دەرمانمان لە ئێران دەکڕی و لە سلێمانیش بۆمان دابین دەکرا لە ڕێگەی برادەرانی شارەوە، هەروەها لە ڕێگەی مەفرەزەکانەوە دەرمانمان بۆ دابین دەکرا لەو نەخۆشخانانەی لە گوندەکان بوو، ئەگەر

دەرمان نەبووایە دەیاننووسی بۆ نەخۆشەکان و لە شارەکانی ئێران دەیانکڕی. لەوێ هێز دابەشکرایەوە و مامۆستا بەهادین لێپرسراوی گشتی بوو، مەلا عەلی سەرکردایەتی عەسکەری سلێمانی و کەرکوکیان دەکرد و سەید تۆفیق ئەندامی ئیقلیم بوو لێپرسراوی سیاسی بوو، شێخ سەعید لێپرسراوی ئیداری بوو، نەسرەدین هەورامی جێگری بەشی عەسکەری بوو، حەمەڕەشید قەرەداخی ئامر بەتالیۆن بوو لەوێ بووین بە چوار لق، لێپرسراوی لقەکان بریتیبوون لەمانە:

١. حەمە صالّح قەرەچەتانی، سەر لقی سلێمانی و شاربازێڕ

٢. بەکر تەلانی، سەرلقی چەمی ڕەزان و بۆڵقامیش تا خاڵخاڵان

٣. عەلی حاجی نادر، سەرلقی بتوێن و دەشتی کۆیە

٤. قادری حاجی محەمەد، سەر لقی قەرەداخ و گەرمیان بوو

لقی شاربازێر بەمشێوەیە دانرابوو:

مامۆستا خالید، رابەر سیاسی

عومەر حامید، جێگر و لێپرسراوی عەسکەری

جەمال حەمەئەمین، لێپرسراوی ئیداری

عەتا خڕە، سەرپەلی دۆڵێ و ئەبو ڕەزا جێگری بوو

جەلال عەلی، سەرپەلی شاربازێری تەخت و شەهید زاهیر جێگری بوو

دوای دروستبوونی ئەو لقە من لێپرسراوی بووم، بەتەواوی دابەزیینەخوارەوە، هەرچەندە چەکەکانمان زۆر ببوو، بەڵام باش نەبوون هەرچەندە لە جاران باشتربوون.

لە ساڵی ١٩٨٠ لە دۆڵی گەڵاڵەوە هاتین نزیکەی ٢٠ کەس دەبووین، چەند برادەرێکی عەرەبمان لەگەڵ بوو لە هەرزنەوە هاتین گەیشتینە هەورازی گەڵاڵە کە سەر ئەکەوێ بۆ پشتی گەورەدێ، برادەریك هیلاك بوو ناوی جەمال عەرەب بوو، مانی گرت و وتی: من نایەم، ناتوانم بەم هەورازەدا سەربکەوم، چونکە کەمێك نەخۆشی کەئابەی هەبوو. بە مامۆستا خالیدم وت: بچۆ بزانە بۆ نایەت؟! باماننەگرێت لەم ناوچە چۆڵە چی ئەکات، هەر دەبێت بێت! ؟ مامۆستا خالید هاتەوە وتی: ئەڵێت من نایەم! وتم: مامۆستا جەمال تۆ بچۆ. وتی: باشە، ئەویش چوو قسەی لەگەڵ کرد، بەڵام سوودی نەبوو، خۆم چووم بە نیوە عەرەبی و بە نیوە کوردی پێمووت: جەمال ئیمشی یا کەتلەك! وتی: رەفیق هەسە ئیمشی، ملیم لێڕاکێشا و پێشی خۆمدا، برادەران وتیان: ئەوە چۆن قەناعەتت پێکرد؟ وتم: دوایی بۆتان باس دەکەم، کە گەیشتینەسەر شاخ شەو لەوێ ماینەوە، باسم بۆ کردن کە چۆن رازیم کردووە، برادەران وتیان: بەڕاستی تۆ لێپرسراوی عەسکەرییت و بەوشێوەیە دەبێت پێووتن. جەمال بە عەرەبی پێیوتبوون: ئەگەر نەهاتمایە خراپم لێ بەسەردەهات، بۆیە شەو ماینەوە لەبەر ئەوەی سوپای عێراق دەستی بەسەر ئەو گوندانەدا گرتبوو، نەماندەوێرا بچینەناو گوندەکان. بڕیارماندا شەو لەوێ بمێنینەوە، چونکە رێگایەکی سەخت بوو بە ئاسانی نەماندەتوانی بچینە دامێنی شاخەکە، هەروەها لەو جەولەیەدا ئیسماعیل دیکتارۆفمان لەگەڵ بوو کوڕێکی زۆر ئازابوو، لەبەر ئەوەی زۆر قەڵەو بوو لە هەورازەکاندا هیلاك دەبوو دەستەسرەکەی دەردەهێنا و دەستیدەکرد بە باوەشێنی خۆی بۆ ئەوەی فێنکی بێتەوە. ئەو شەوە زۆر برسیمان بوو، هەر لەوێ

مەفرەزەیەکی یەکێتی لێبوو لە برسا بەرسیلەیەکی زۆریان خواردبوو تووشی شانەسك و رژانەوە ببوون، ئامر مەفرەزەکە ناوی هێمنە رەش بوو، ناوە ئەصلّییەکەی قەیسەر بوو، پێشتر ماڵیان لە شێخ محێدین بوو. بۆ بەیانی برادەرێکمان نارد بەبێ چەك بۆ گوندی گەڕەدێ بۆ ئەوەی نان و خواردنمان بۆ بێنێت، تا ئێوارە لە ناودێی چۆڵکراوی گەورەدێ ماینەوە، بۆ ئێوارە چووینە مالومە و سوپای عێراق لە گوندەکان کشابوونەوە. چەند رۆژێك لەو ناوچەیە ماینەوە و دواتر هەموومان چووینەسەر سەرچنار و بارەگاکانی حیزبی بەعسمان دایەبەر نارنجۆك ئەنداز و ئاربێچی دوو، کە یەکەم چالاکی لقەکەی ئێمە بوو، تا درەنگانی شەو شەڕ بەردەوام بوو، بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ دۆڵی هەناران، ئەبو سەلام زۆر رازی بوو لەم چالاکییە و وەکو چالاکی لە دەنگی گەلی عێراق بڵاوکرایەوە، کە یەکەم چالاکی بوو لەم ئیزگەیە بخوێنرێتەوە، پاش چەند رۆژێك لەم چالاکییە گەڕاینەوە بۆ بێتووش بۆ بارەگای بەتالیۆن.

لە مانگی ٩ی١٩٨٠ کە جەنگی ئێران عێراق هەڵگیرسا تازە چووبووینە بێتووش، بەهادین نوری ناردمی بۆ سەرکردایەتی بۆ خڕی ناوزەنگ بۆ لای ئەبو ئەحمەد بە نامەیەك کە کۆگایەکی ئاردمان لە سەردەشت هەیە بچم بۆ ئەوێ بۆ هێنانی ئارد بۆ زستانی ئەو ساڵە، چونکە شەڕ گرانی بە دواوەیە. (ئەبو ئەحمەد لێپرسراوی ئیداری سەرکردایەتی بوو کە لێپرسراوێکی زۆر باش بوو) کە چووم بۆ لای زۆر رێزی لێکردم لەبەر ئەوەی دادەبەزین بۆ ناوچەکانی کوردستانی عێراق بۆ چالاکی (ئەم ئەبو ئەحمەدە لە بنەڕەتدا خەڵکی موصل بوو، ناوی خۆی عەبدولرەحمان قەصاب بوو لێپرسراوی حیزب بوو لە موصل لە کاتی کودەتاکەی شەوافدا). ئەبو ئەحمەد پسووڵەی ٥٠ فەردە ئاردی بۆ کردم

بۆ سەردەشت، لەوێ لە كۆگاكە ئۆتۆمۆبیلێكم بە كرێ گرت بۆ گوندی دەرماناوێ، لەوێوە كاروانچیم بۆ بە كرێ گرت بۆ گوندی بێتووش، دانیشتووانی گوندەكە زۆربەیان خزمی نزیكی خۆم بوون لەوانە: كاك حەمەئەمین هەبوو لە خزمانی كۆكە بوو خوشكەزای كوێخا عەلی كۆكە بوو، كوڕێكی كاك حەمەئەمین یارمەتی زۆری داین لە دابینكردنی ولاغ بۆ گوێزانەوەی ئاردەكە، لەبەر ئەوە كاك حەمەئەمین داوای فەردەیەك ئاردی لێكردم دامێ. هەر لە گوندی بێتووش كۆگایەكمان بۆ خەزنكردنی ئاردەكە بە كرێ گرت، چووم بۆ لای بەهادین نوری كارەكەی زۆر بە دڵ بوو، پەیوەندیم لەگەڵ خزمانی گوندی بێتووش بە هێز بوو، ماڵێكی تری گوندەكە ماڵی قازی كوڕی قازی مەحمودی قازی عەبدوڵڵا بوو، ژنەكەی كچی حاجی مارف بوو كە خوشكەزای نوری حاجی گورون بوو، پێشتر لە گوندی تووژەڵە بوون ماڵیان لە خێمەیەكدا بوو لە نزیك بارەگای ئێمە و پێشمەرگەی یەكێتی بوو، زستان ماڵەكەی هێنابووە بێتووش، چونكە باوكی خەڵكی گوندەكە بوو لە بنەماڵەی قازی بێتووش، هەروەها زاوایەكی خۆم ماڵیان لەوێ بوو بەناوی ئیسماعیل لەگەڵ ئەنوەری برای كە كوڕی محەمەدی كوڕی ئایشەی كچی قازی مامی باوكم بوو، ژنەكەی ئیسماعیل كچی ئەحمەدی برام بوو، لەبەر ئەوە وەكو خەڵكی گوندەكە وابووم.

پێش چوونمان بۆ گوندی بێتووش لە ساڵی ١٩٨٠ لە قەرەچەتانەوە سەركەوتین بۆ شاخی پیرەمەگرون لەناو قەدی شاخەكە كانییەك هەبوو پێیاندەووت: دایمەكانی و ئەو شوێنەش پێیدەڵێن: قوڵەڕەش، ئەو شوێنە لەبار بوو بۆ خۆحەشاردان و پشوو، لەوێ پشوومان‌دا و دەستمانكرد بە جلوبەرگ و كەلوپەل شووشتن، دكتۆر

فارس دەستیکرد بە موجامەلەی شێخ رەسوول و دەیوویست تووڕەی بکات، چونکە تراکسوودێکی لە پێ بوو لە تراکسوودی ئەو مشکە دەچوو کە وێنەکەی لە کتێبی پۆلی ٣ی سەرەتاییدابوو، هەروەها لە ژێریدا نووسرابوو ٧ مشك بە مەشق هاتن مشکێك سەرداریانە! دکتور لە بەرخۆیەوە ئەیووت و شێخ رەسوول وتی: جارێکی تر بیلێی تووڕە دەبم، دکتور دەیووت: بە روخسەت با جارێکی تر بیلێم، دوای پشوو چووین بۆ گوندی زێویێ بۆ دامەزراندن و نانخواردن.

لە مانگی ١٢ی١٩٨٠ بەهادین نوری وتی: بچۆ بزانە لەسەر سنووری ئێران عێراق جێگایەکی باش پەیدا ناکەیت بۆ ئەوەی بارەگای سلێمانی–کەرکوك بەرینە ئەوێ، منیش چووم بۆ گوندی بێتووش، لەوێ ئەو خزمانەم دی کە ئامۆزاکانیان دانیشتووی کۆکە بوون، لەگەڵیان دەستمانکرد بە گفتوگۆ بۆ دانانی بارەگا، دواتر چووم بۆ کەڵوێشکە و سەرقەدەغە کە نزیکی گوندەکە بوون، بەڵام بە شوێنێکی باشمان نەزانی بۆ دانانی بارەگا، دوای گەڕان دێبەرێکی ماڵی مەلا رەشیدمان دیاریکرد بۆ بارەگا، مەلا رەشید زاوای مەلا محەمەدی بێتووش بوو، کە کوڕەکانی پێشمەرگەی حیزبی دیموکرات بوون، رێکەوتین لەگەڵیان کە بچینەسەر ئەو دێبەرە و خانوومان لەوێ دروستکرد کە دارەکانیمان لە عێراقەوە هێنا لە گوندی کەڵوێشکە و سەرقەدەغە کە تازە چۆڵ کرابوون، بۆ ئەوەی داری گوندی بێتووش نەبڕین. دانیشتووانی گوندەکە زۆریان بێخۆش بوو کە داروپەردووی ئەوان بەکارناهێنین، دوای دروستکردنی خانووی زستانە و خانووە چۆڵەکانی دێبەرەکەمان بەکارهێنا بۆ بارەگا. بەیانیان دوای نانخواردن دەچووین بۆ سەرقەدەغە و کەڵوێشکە و قندۆڵ بۆ هێنانی دار کە هەر پێشمەرگەیەك دەبووایە دارێکی گەورە بە شان

بهێنێت بۆ دروستكردنی خانووەكە و سووتانی دارەكان بۆ چێشتلێنان. ئەوەی جێگەی ئاماژەیە و پێویستە بووترێت كە هێشتا بارەگامان دروست نەكرد بوو، بەڵام كەلوپەلی بارەگامان پێبوو، لەوێ لەسەر كەلوپەلەكان دەخەوتین شەری ئێران  عێراق دەستیپێكرد كە جێگەی خۆشحاڵیمان بوو، چونكە رژێم بواری بۆ راودوونانی پێشمەرگە نەما و بە ئاسانی دەمانتوانی بە ناوچەكانی خۆمان بگەڕێین و پەیامی شۆڕش بگەیەنین بۆ شارەكان و گوندەكان. دوای كردنەوەی بارەگا دەستمانكرد بە دابەشكردنی هێز بۆ خوارەوە، هەر كەس بۆ ناوچەی خۆی، چونكە سەركردایەتی هەموو لایەنەكان پێیان باش بوو جموجۆڵی پێشمەرگایەتی زیاتر بكرێت، حیزبیش بە پێویستی زانی كە چالاكی پێشمەرگانە زیاتر بكرێت، من كە لێپرسراوی لقی شارباژێر– سلێمانی بووم دابەزین بۆ ناوچەی دۆڵێ، پێمان باشبوو كە پێكەوە دابەزین بەهێزی زۆر. حیزب بیری لەوە كردەوە كە هێزەكان فراوان بكرێت لە لقەوە بۆ بەتالیۆن.

سەركردایەتی سلێمانی و كەركوك دوای فراوانبوونی هێزەكان بەمشێوەیە بوو: ئەبو سەلام سەرپەرشتیاری سەركردایەتی، مەلا عەلی لێپرسراوی سەربازی، سەید تۆفیق عەبابەیلێیی لێپرسراوی سیاسی و شێخ سەعید بەرزنجی لێپرسراوی ئیدارە واتا كارگێڕی، ئەم سەركردایەتییە بەمشێوەیە پێكهات:

بەتالیۆنی سلێمانی حەمەڕەشید قەرەداغی لێپرسراوی بوو لە هەمانكاتدا نەسرەدین هەورامی جێگری مەلا عەلی بوو بۆ كاری سەربازی كە سەركردەیەكی مەیدانی بوو، مەحمود دیكتارۆڤ لێپرسراوی سەربازی بوو لە بەتالیۆنی سلێمانی، ئەم بەتالیۆنی سلێمانییە پێك دەهات لە سێ لق، لقی سلێمانی شارباژێر كە حەمەكەریم قەرەچەتانی لێپرسراوی بوو و

عومەر حامید جێگری و مامۆستا خالید ڕابەر سیاسی و جەمال حەمەئەمین لێپرسراوی ئیدارە بوون، ئەم لقە سەرپەرشتی دوو پەلی دەکرد، یەکێکیان هاوڕێ عەتا لێپرسراوی بوو کە تایبەت بوو بە ناوچەی دۆڵی جافایەتی و ئەبو رەزا جێگر و حەمە سیروان ئیدارە و مامۆستا سەردار سیاسی بوون، پەلی شاربازێڕی تەخت کە جەلال عەلی لێپرسراوی بوو، زاهر قرگەیی جێگر و ئیدارەکەی نەژاد قرگەیی و سیاسییەکەی سامی وەستا سابیر بوون، لق خۆی شانەی چەکداری هەبوو کە خالید شەدەڵەیی سەرپەرشتی دەکرد، بڕیاردرا حەمەڕەشید قەرەداغی کە ئامر بەتالیۆن بوو لەگەڵ لقەکەی من. هەردوو لقی عەلی حاجی نادر و بەکر تەلانی دابەزین گەیشتینە گوندی سەرگەڵو، دواتر لقی گەرمیان لێمان جیابووەوە کە کاك بەکر سەرلقی بوو چوون بۆ ناوچەی خۆیان. چەند مانگێك لەناوچەی دۆڵێ بووین هەوڵماندا چالاکی بکەین، بەڵام سەرکەوتوو نەبووین گەڕاینەوە بۆ بارەگای هێز لە بێتووش. ئەم لێپرسراوە سەربازییانە سەرپەرشتی لقەکانی شارەزوور و هەڵەبجە و قەرەداغیان دەکرد. لقی شارەزوور و هەڵەبجە تۆفیقی حاجی و فەتاح گەلاڵی و نەجیمی صۆفی و کەریمی حاجی و ئەسعەد گامێش تەپەیی و عەبەی مامە سەرپەرشتی سیاسی و سەربازی و کارگێری ئەم لقەیان دەکرد. لقی گەرمیان و قەرەداغ قادری حاجی محەمەد ناسراو بە ئەسکەندەر و رەئوفی حاجی محەمەد و مەجید دوکانی و تۆفیق فەتحوڵا و عەبدولقادر فارس و مەلا شکور و مام صاڵح سەرپەرشتی سیاسی و سەربازی و کارگێری ئەم لقەیان دەکرد.

ئەم لق و بەتالیۆنانە سەرقاڵی کار و چالاکی خۆیان بوون لە ناوچەکانی خۆیان و هەندێك جار هەموو هێزەکە کۆدەبوونەوە و بە

ناوچە جیاجیاکاندا جەولەیان دەکرد، کە نزیکەی ٢٠٠ پێشمەرگە دەبووین. لە مانگی دووی ساڵی ١٩٨٢ ئەم هێزە پێکەوە دابەزیین بۆ ناوچەی قەرەداغ، لە بناری شارەزوور هێزەکانمان دابەش کرد بۆ چالاکی پێشمەرگانە بەمجۆرە:

هێزی دەربەندیخان کە نەسرەدین هەورامی سەرپەرشتی دەکرد، هێزی قەرەداغ کە حەمەڕەشید قەرەداغی سەرپەرشتی دەکرد، ئەم لقە کە من لێپرسراوی بووم بەر ئەم هێزە کەوت، هێزی شارەزوور و هەڵەبجە کە تۆفیقی حاجی لێپرسراوی بوو، ئەبو سەلام و مەلا عەلی و سەید تۆفیق سەرپەرشتی ئەم هێزانەیان دەکرد لە گوندی بەلەکجار لە قەرەداغ، ئەم دابەشبوونی هێزە تەنها مەبەستی چالاکی سەربازی بوو بە شێوەیەکی کاتی. چەند مانگێك بەمشێوەیە بوو، دواتر گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی هەر کەس بۆ ناوچەی خۆی.

لە زستانی ساڵی ١٩٨٠ چووینە گوندی سەرخوار لە ناوچەی شاربازێڕی سەخت لەبەر هەیوانی مزگەوتەکە ئاگرمان کردبووەوە و بە چواردەوری ئاگرەکەدا راوەستابووین و مامۆستا خالید خوالێیخۆش بێت قسەی خۆشی بۆ دەکردین، لە پڕ کەسێك هات کە کلاشینکۆفێکی پێبوو وتی: ئەم تفەنگە هی کامتانە لە ماڵی ئێمە بە جێماوە؟! مامۆستا خالید کە دەستی بە رەزنەکەیەوە گرتبوو وایزانی بوو تفەنگەکەیەتی وتی: بێنە هی منە، ماڵی ئەو کەسە ئاوا بێت، ئەگینا نەیدەزانی لە کوێ ونی کردووە! بە گشتی دانیشتوانی گوندەکان هیچ تەماعێکیان لە کەلوپەلی پێشمەرگە نەبوو، پێشمەرگە هەرچییەکی لێ بەجێبمایە بۆیان دەهێنایەوە بۆ مزگەوت.

لە زستاندا کە ئاوی باران زۆر دەبوو بە سیم لە چەمی هەرزنە لەسەر سنووری ئێران دەپەڕینەوە، لە زستانی ١٩٨٠ دەگەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی لە وڵاغلو زوو دەردەچووین بۆ ئەوەی رەبایەکانی پشتی قامیش نەمانبینێت، لە دۆڵی سەفرە و زەروون تا دەچووینە هەرزنە هەر ئاو بوو، نزیکەر ٥٠ جار ئەمبەر و ئەوبەرمان دەکرد، تا دەگەیشتینە هەرزنە ٤ کاتژمێرمان پێدەچوو. لەسەر چەمەکە بە سیم و جۆلانە دەپەڕینەوە بۆ ئەوبەر. جارێك برادەرێکمان لەگەڵ بوو ناوی ئەبو محەمەد بوو عەرەب بوو دەیووت: من ناوێرم بەو سیمە بپەڕمەوە ئەگەر بچڕا چی بکەم. ١٠ کەس پەڕینەوە و ئەو نەیوێرا ناچار هەردوو دەست و قاچی و چاویمان بەستەوە بۆ ئەوەی نەترسێت، پاڵمان پێوەنا بۆ ئەوبەر، لەوبەر دەست و چاویمان کردەوە ئینجا بۆ جارێکی تر راهات.

هەر لەو ساڵە ١٩٨٠ لە شارباژێرەوە هاتین بۆ کوڕەداویێ، لە شاخی گمۆ سەرکەوتین بەرەو ناوچەی ئالان دابەزین، ئەو ناوچەیە گوندەکانی چۆڵ کرابوون و لە شوێنی خەرمان و مووشتاقی گوندەکان قارچکێکی زۆری لێبوو، نزیکی نیوەڕۆ بوو زۆرمان پرسی بوو دەستمانکرد بە قارچك برژاندن، نەماندەزانی کامە باشە و کامە خراپە! زۆرمان خوارد زۆر لامان خۆش بوو، بۆ ئێوارە هاتینە گوندی رەشەکانی ئێران لە رێگا دوو برادەر باریان ناجێگیربوو، بە کۆڵ هێنامانن خوارەوە بۆ ئێران لەبەر ئەوەی زۆر قارچکیان خواردبوو، کە گەیشتینە گوندی رەشەکان چووینە ماڵی ئاغا دوو شەو ماینەوە، چونکە رەشەبا بوو کەس نەیدەتوانی سەر بێنێتەدەرەوە، لە ماڵی ئاغا چایچییەکی لێبوو بە نانەسکێ کاری بۆ ماڵی ئاغا دەکرد، برادەران پێیانووتبوو: ئێمە جلوبەرگت بۆ دەکەین و مانگی ٥ دینارت دەدەینێ وەرە ببە بە

پێشمەرگە، ئەویش بە قسەی کردن و هات لەگەڵمان، ئاغاش بە سواری ولاغ بە غار هاتبوو بە دواماندا بە برادەرانی وتبوو: لێپرسراوەکەتان کوا لە کوێیە؟ هێنایان بۆلام، پێیوتم: ئەوە وەفای ئێوەیە من دوو رۆژە خزمەتتان دەکەم کەچی چایچییەکەمتان بردووە لەگەڵ خۆتان!؟ منیش ئەوم بە راستزانی و پێموت: فەرموو ئەوە چایچییەکەیە بیبەرەوە، ئاغاش چایچییەکەی بردەوە لەگەڵ خۆی، چونکە ئێمە لەناو خەڵکەوە هاتووبووینە دەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی هەر لەناو خەڵکدا هەوڵمان دەدا پێشمەرگە بۆ حیزب پەیدا بکەین، لەبەر ئەوەی ئەوان خەڵکی گوندەکانی ئێران بوون نەماندەتوانی بە قسەی ئاغا نەکەین، دوای ئەوە بەبێ چایچی کەوتینەڕێ بۆ سەرکردایەتی.

لە دوای شەڕی عێراق ئێران کە سەرکردایەتیمان لە بێتووش بوو دادەبەزینە خوارەوە، حەزمان دەکرد هەر لە خوارەوە بین، بەڵام پێشتر لە هەر گوندێك بووینایە رژێم بۆمان دەردەچوو بۆ لێدانمان، چەند جارێك کە لە قەرەچەتان بووین شەو سوپای رژێم بۆمان دەهات. جارێك لە قەرەچەتان خۆمان دەرخست و ئێوارە لەوێبووین، شەو کەس نەیزانی چووین بۆ گوندی یەلانقۆز، لەوێ گوێمان لە دەنگی سەگوەر بوو، بە جارێك هەموو سەگی قەرەچەتان دەوەڕی!؟ وتم: برادەران سوپا وا لە نزیکی قەرەچەتانە، ئیتر نازانم لەبەر ئەوە بوو گوندەکە نزیکی مەعەسکەری سووسێ بوو یان جاسووسی گوندەکە هەواڵیان لێدابووین، چونکە رژێم جاسووسی لە هەموو گوندێك هەبوو، بەڵام زۆر سەهوو بوون، چونکە پێشتر پێشمەرگایەتیم کردبوو زۆر وریا بووم، حسابم بۆ هەموو شتێك دەکرد. هاوڕێ عەتام هەمیشە لەگەڵ بوو، هەم خزمم بوو هەم لە ساڵی ١٩٧٤ لەگەڵم بوو زۆر وریا بوو لە قسەم دەرنەدەچوو،

منیش هەمیشە حسابم بۆ قسەکانی دەکرد. لە دوای دەستپێکردنی شەڕی ئێران عێراق ڕژێم ئەوەندەی بەم شەڕەوە سەرقاڵ بوو نەدەبەرژایەسەر ئەو ناوچانەی کە ئێمەی لیّ بووین، بۆیە پێشمەرگایەتی ئاسانتر و خۆشتر بوو، بۆیە حەزماندەکرد هەر لە خوارەوە بین و نەچینەوە بۆ سەرکردایەتی.

لە زستانی ١٩٨٠ چەند برادەرێك چوون بۆ سلێمانی بریتی بوون لە مەحمود دیکتارۆف و عەتا خڕە و عەلی بچکۆل بۆ دانانی چەند گوللە صاروخێك کە بە دانانی کاتژمێر دەدەقینەوە، چەند شوێنێکیان بۆ دانرا بوو بۆ دانانی صاروخەکان. بۆ دانانی صاروخەکان چەند ڕۆژێك لە سلێمانی بوون لەو ماڵانە مابوونەوە کە بۆیان دیاری کرابوو، لەبەر ئەوەی ئەو زستانە بەفر زۆر باری بوو ڕێگایان نەمابوو زوو بێنەوە و هەواڵیان نەمابوو، بەڵام ئەوکاتەی بۆیان دیاری کرابوو بۆ گەڕانەوە هاتنەوە، ئێمە چووین بۆ گوندی دۆڵپەموو ئەوان لەویّ بوون، بە گەڕانەوەیان زۆر خۆشحاڵ بووین، دواتر زانیمان لە سلێمانی چەند پەیوەنییەکیان کردبوو کە جێگای خۆشحاڵی بوو، چەند ڕۆژێك لەوناوە بووین دواتر گەڕاینەوە بۆ سەرکردایەتی لە بێتووش، لەبەر ئەوەی چەند دکتۆرێکمان لەگەڵ بوو پێمان باش بوو نەخۆشخانەیەك بکەینەوە، لەو دکتۆرانە، دکتۆر فارس و دکتۆر دڵشاد کە ناوی ابراهیم کوبەیسی بوو خەڵکی نەجەف بوو، پێداویستی نەخوشخانەمان پەیداکرد لە نەخۆشخانەکانی گوندەکانی دەوروبەری سلێمانی کە ڕژێم ئیدارەی دەدان و لە ڕێگەی حیزبەوە لە دەرمانخانەکانی سلێمانی هەوڵی دابینکردنی پێداویستی دەدرا. دوای کردنەوەی نەخۆشخانەکە ڕۆژێك ژنێك هات بۆ لای دکتۆر فارس پێیوتبوو: دکتۆر ئاوم پێناخورێت!؟

وتی: دیارە چا زۆر دەخۆیت. وتی: نەوەڵا چاشم پێناخورێت! دکتور پێیوتبوو: دیارە فیرنەگوللەی نە چا دەخۆی نە ئاو. رۆژێکی تر پیاوێك هات وتی: دکتور دایکم نەخۆشە، دکتور فارس لەگەڵ پیاوەکە چوو بوو بۆ لای دایکی بۆ چارەسەرکردنی کە ئازاری کەمەری هەبوو، ئەو دکتۆرانە جگە لە چارەسەرکردنی بریندار و نەخۆشی حیزب چارەسەری خەڵکی ئەو گوندانەیان دەکرد کە نزیکی بێتووش بوون.

لە بەهاری ۱۹۸۰ جەولەمان دەکرد بەرەو گوندی قرگە چووین، لەوێ شەهید زاهیرم بینی کە ماڵیان لەوێ بوو، لە شارەوانی سلێمانی کرێکار بوو، لەگەڵ بینینم باوەشی کرد بە ملمدا و وتی: من بێ تۆ ئیدارە ناکەم دێم دەبم بە پێشمەرگە لەگەڵتا، پێموت: جارێ تۆ لە سلێمانی بە بۆ ئیشوکاری رێکخستن، بەڵام وتی: ژیانی سەرشۆڕی قبول ناکەم و لە تۆ زیاتر نیم هەر دێمەدەرەوە، بەڵام ئەمجارە نا، دەچمەوە سلێمانی و گەڕامەوە ناچمەوە دەبم بە پێشمەرگە، دوای چەند مانگێك هاتەدەرەوە و نەگەڕایەوە بوو بە پێشمەرگە لەگەڵمان لەگەڵ ئازاد و نەژادی برای، حاجی محەمەدی باوکی کوڕی لەسەر ماڵ نەما هەرسێکیان لەگەڵمان پێشمەرگە بوون، نازانم چۆن باسی خەباتگێری و تێکۆشانی ئەو ماڵە بکەم، هەتا ماوم قەرزاریانم، دوای ئەوان دوو کوڕی تایەری برای حاجی محەمەد هاتن بوون بە پێشمەرگە بە ناوی ئاوات و حەمید، دواتر دوو خوشکەزای حاجی محەمەد هاتن بوون بە پێشمەرگە بە ناوی بکر و صلاح، بەهۆی ئەوانەوە چەند کەسێکی گوندی قرگە و گوندەکانی دەوروبەری هاتن بۆ پێشمەرگایەتی وەکو بختیار حاجی نجم لە گوندی قرگە و محەمەد سعید لە گوندی داربەڕوو، لە پاداشتی ئەم هەڵوێستە شەهید زاهیرمان کرد بە معاون سەرپەل، من بە حاجی محەمەدم وت:

حیزب چۆن تۆی پەروەردە کردووە وا ئەم هەڵوێستی جوامێرییەت هەیە و ئەو هەموو پێشمەرگەیەت بۆ حیزب ناردووە لەبەر نیشتمانپەروەریتە.

گوندی قرگە لە خەباتی چەکداری دژی رژێم جێگای خۆی گرتووە کە مێژوو قەرزاریانە وەکو ١٧ شەهیدی قرگە کە شەهید جەمیلە سوور و هاورێیەکانی داستانێکی قارەمانانەیان تۆمارکردووە، کاتێك پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی بوون، لە خەباتی حیزبی شیوعیدا هەمان دەور و خەباتیان هەبووە کە مافی خۆیانە مێژوو قەرزاریان بێت، دوای راپەڕین لە پرسەی قادر سووری قەرەچەتان فاخیری کوڕی شەهید زاهیرم بینی باوەشم پێداکرد وتم: بۆنی شەهید زاهیر و حاجی محەمەدت لێدێت.

لە هاوینی ١٩٨٠ لە تووژەڵە بووین، دکتۆر کمال خۆشناو بارەگای لە نزیکی ئێمە دانابوو، سەردانی کردین و وتی: حەز دەکەم دەعواتتان بکەم، بەڵام پێشمەرگەی لانە بوو وتی: با رێکبکەوین من پارەی سێ حەیوان دەدەم و ئێوەش ئامادەی بکەن، لای ئێمەش ئەحمەد رەجەبمان هەبوو کە وەستای نان دروستکردن بوو، رێککەوتین چووین لە گوندەکانی دەوروبەری تووژەڵە سێ حەیوانی باشمان کڕی و بۆ رۆژی دواتر بۆ نانی نیوەڕۆ کاك ئەحمەد دەستی کرد بە دروستکردنی شلە و پلاو، ئێمە نزیکەی ٧٠ پێشمەرگە دەبووین و کاك دکتۆریش خۆی و دوو پێشمەرگە بوو، لە گۆشتەکە بەشی رۆژێکی ترمان هەڵگرت و بۆ رۆژی دواتر کاك دکتۆرمان هەر بە گۆشتەکەی خۆی دەعوەت کردەوە ! ؟

لە زستانی ١٩٨١ لەگەڵ وەستا بایز و ئەحمەدی حاجی قادر لە گوندی زێوێوە چووین بۆ شاخی پیرەمەگرون بۆ لای ئەشکەوتی پلێنگەکە، من چەکی باشم پێبوو، بەڵام ئەوان سەربازی هەڵاتوو بوون بێ چەك بوون، سێ برنەومان برد و چووین، شەو لە ئەشکەوتەکە

مابنەوە بۆ بەیانی کە هەستاین لە خەو کاژێك بەفر باریبوو، راومان دابەست و نێرییەکی سێ ساڵەمان کوشت و بۆ ئێوارە گەڕاینەوە بۆ زێوێ و نێرییەکە نزیکەی ٢٥ کیلۆی هەبوو وتیان: با بەشی بکەین، من وتم: ١٦ پێشمەرگەم لەگەڵە و بەشم ناوێت و ئێوە بیکەن بە دوو بەش و هەر ٨ پێشمەرگە و لە ماڵی یەکێکتان دەبین، ئەحمەدی حاجی قادر وتی: واتا تۆ بە کولاوی دەتەوێت لەگەڵ قوبلی برنج وتم: وا باشە. بۆ بەیانی نیوەڕۆکەی پێشمەرگەکانم ئاگادار کردەوە کە گۆشتی ئاژەڵە کێویتان دەدەمێ و پێیان سەیر بوو، هەر ٨ نەفەرە و چووینە ماڵی یەکێکیان تێرمان گۆشتی ئاژەڵەکە خوارد و بەرەو قزلەر کەوتینەڕێ، هەر جارێك کە دەچوومەوە بۆ زێوێ ئەحمەد قادر و عەبدوڵڵا حمەسوور پێیان دەوتم: نەچین بۆ راو، منیش لەگەڵیان دەچووم یان نا.

لە بەهاری ١٩٨١ هەر لە تووژەڵە بووین لەبەر ئەوەی کوێستانێکی خۆش بوو بە تایبەتی مامەندە و مالیمۆس و باسکەرێوی، چەند پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو، یەکێکیان خەڵکی سەیدصادق بوو ناوی عارف دەبابە بوو لەگەڵ ٤ پێشمەرگەی تر رۆژانە ون دەبوون نەماندەزانی لە کوێن، یەکێکیان ناوی یاسین بوو کوڕی شەهید مەحمود بوو کە ساڵی ١٩٧٤ چوو بوو بۆ نانکڕین تەقەیان لێکرد و شەهیدیان کرد. کەوتینە چاودێرییان، برادەرێك هات وتی: تۆ دەزانی عارف لە کوێیە و لەگەڵ برادەران دەچێت بۆ کوێ! ؟ وتم: نازانم! وتی: ئەگەر تاقەتت هەیە وەرە دەچین بۆ ئەو شوێنەی کە عارفی لێیە، پێم باش بوو، کە چووین بەرەو شاخی مامەندە کاتی نیوەڕۆ بوو ئاگر کرابووەوە و چا لێنرابوو شایی گەرم بوو، کاك عارفیش گۆرانی دەچڕی لەناو گیای بەهار و گوڵاڵە و چنوور و شەوبۆ و گیابەن و سەوسەن لە ناوەڕاستی

کۆمەڵێك کچ و ژنی گوندەکانی دەورەبەری تووژەڵە کە شایی و لۆغانیان بوو، کاك عارف کە ئێمەی دی ساردبووەوە و لە گۆرانی وتن کەوت و شایی کۆتایی هات، باش سزادانی کاك عارف جارێکی تر خۆی ون نەکرد.
لە ساڵی ١٩٨١ پێشمەرگەکانمان لە رووی چەکەوە وەکو لایەنەکانی تر نەبووین بە تایبەتی چەکی ئاربێجی و بیکەیسی کلاشینکۆف کەمبوو، ئێمە بە زۆری ژێرسەمان پێبوو، تەنها چەند کلاشینکۆفمان پێبوو، لەبەر ئەوەی عەلی بچکۆل زۆر منالێ بوو تەمەنی ١٦-١٧ سالێ دەبوو موزەلییەکە درابوو بەو، لەگەڵئەوەشدا پێشمەرگەیەکی گورجوگۆڵ بوو، جەلال عەلی زۆر حەزی بەوە دەکرد کە کلاشینکۆفە موزەلییەکە لای ئەو بێت، قەناعەتمان پێکرد کە یەك لاقەکە با لای ئەو بێت، رۆژێك چووینە نۆدێ وا خۆی دەرخست کە لێپرسراومانە، ئێمە بە لامانەوە گرنگ نەبوو، بەڵام مامۆستا خالید زۆر بە جدی وەریگرتبوو وتی: دەبێت سزا بدرێت، کە چووینە گوندی هەرمێلە لەوێ کاك جەلالمان بانگکرد بۆ سزادان، مامۆستا خالید وا دابەزییە سەری، کاك جەلال تاقمەکەی لە خۆی کردەوە وتی: من پێشمەرگایەتی ناکەم، منیش کاك جەلالم ساردکردەوە و باوەشم پێداکرد و نەمهێشت بڕواتەدەرێ.

لە بەهاری ١٩٨١ هەردوو لقی بتوێن و شارباژێر پێکەوە دابەزین بۆ سەر رێگای سلێمانی دوکان بۆ ئەوەی چالاکی گەورە بکەین کە حەمەڕەشید قەرەداغی و ئیسماعیل دیکتارۆفمان لە بەتالیوێن لەگەڵ بوو، چەند جارێك چووینەسەر رێگای دوکان لە ئاستی قەرەچەتان و زێوێ، دەمانویست لەو جێب و ئیلفایە بدەین کە رۆژانە دەهاتن دەچوون بۆ قەلاکەی سووسێ، لەوکاتانەدا کە ئێمە دەچووین رێکەوت نەدەهاتن، چەند رۆژێك لەوناوە بووین کە یەکەمجار بوو بە هێزێکی وا زۆرەوە لە

ناوچەی سورداش و شارباژێڕ بین كە نزیكەی ٥٠ پێشمەرگە دەبووین، پێشتر پڕوپاگەندەی واهەبوو كە تەنها مەفرەزەیەكن و هەر جارەی دەچن بۆ شوێنێك، دواتر لە گوندی سەرگەڵو جیابووینەوە و لقی بتوێن چوو بۆ بناری كۆسرەت و ئێمەش لە ناوچەكە ماینەوە.

لە بەهاری ١٩٨١ لەگەڵ هاوڕێ عەتا چووین بۆ سەقز، لەوێ عەتا وتی: دەچین بۆ ماڵی پوورم، پیاوێكی گێلی لێبوو پێیووتین: ئێوە ئیشتان لێرە چییە؟ لەبەر ئەوەی ماڵی پووری عەتا بوو قسەم نەكرد، عەتا وەڵامی دایەوە وتی: پێشمەرگەین. وتی: پێشمەرگە چییە!؟ عەتا پێیوت: نازانیت پێشمەرگە چییە!؟ وتی: نەوەڵا ئاغا گیان نازانم و قەد ئەو ناوەم نەبیستووە و پێشمەرگە ئیشی چی دەكات!؟ عەتا وتی: ئێمە شەڕ لەگەڵ حكومەتی عێراق دەكەین. كابرا وتی: چۆن شەڕ دەكەن یەعنی پیاوكوژن! عەتا وتی: ئێمە ئەو كەسانە دەكوژین كە پیاوی حكومەتن. كابرا چاوی ئەبڵەق بوو وتی: كەواتە ئێوە پیاوكوژن!؟ عەتا وتی: بەڵێ ئێمە پیاوكوژین، كابرا لە ترسا هەڵسا و ڕۆیی و بەجێیهێشتین و نەمانبینییەوە.

لە هاوینی ١٩٨١ برادەرێكمان هەبوو خەڵكی گوندی شەدەڵە بوو پەیوەندی بە منەوە هەبوو، منیش هەموو خێزانەكەیم دەناسی، لە ناوشار چەند چالاكییەكی ئەنجامدا كوڕێكی زۆر ئازابوو. لەو هاوینەدا سەیارەیەكی جێبی قائید فیرقەی فڕاند و هاتەناو گوندی قزلەر، لەوێ برادەرانی یەكێتی لێیان سەندبوو، دوایی هات بۆ لام وتی: سەیارەیەك و موزەڵییەكم هێناوە بۆ تۆ، پاش چەند ڕۆژێك برادەرانی یەكێتی هاتن بۆ چەكەكە لە گوندی هەڵەدن لێیانسەندم بە زۆر، منیش چووم هاوڕێ عەزیز محەمەدم ئاگاداركردەوە و نامەیەكی بۆ نووسیم بۆ لای مولازم

عومەر عەبدوڵڵا. کە گەڕامەوە بۆ گوندی هەڵەدن مولازم عومەر لەوێ بوو، بۆ ئێوارە هاتە سەردانی ماڵم، چونکە ماڵم لە گوندی هەڵەدن بوو. لەوکاتەدا برادەرێکی قەرەچەتانی لەگەڵ بوو ناوی عەزیز حەسەن بوو، بۆ دڵنەوایی کردنم وتی: چەکەکەت بە مستەفا سەرگەڵوویيدا بۆ دەنێرمەوە، ئێمە ئەمشەو دەچین بۆ لێدانی حیزبی ئیسلامی لە سەرگەڵو، کاك مستەفا رۆژێك هات چەکەکە و ئەو پارانەی بۆ هانیمەوە کە لەو برادەرەی ئێمەیان سەندبوو. شەهید خالید بە داخەوە جارێکی تر رۆیشتەوە بۆ ناوشار بۆ چالاکی تر، چووبوو بۆ ناو گەڕاجی سەیارە لە نزیك چواڕیانی سەرچنار، سەیارەکی باشی دەرکردبوو، ئاگری لە گەڕاجەکە بەردابوو، لە کاتی دەرچوونی پیاوەکانی رژێم تەقەیان لێکردبوو، بە برینداری گیرابوو، لە نەخۆشخانەی سلێمانی دووجار هەوڵمدا رزگاری بکەم بەداخەوە سەرکەوتوو نەبووم، پاش چاکبوونەوەی بێ سەروشوێن کرا و کەس نەیزانی لە کوێیە. ئێستا ئەسعەدی برای دەبینم وا دەزانم شەهید خالیدە. پاش ماوەیەك دکتۆر یەشار هاتەدەرەوە باسی پاڵەوانی ئەم پێشمەرگەیەی دەکرد کە بە برینداری گیرابوو لە نەخۆشخانە تەداوی دەکرا، کاتێك دەهاتن بۆ تەداوی ئەم تفی لێدەکردن و نەیدەهێشت تەداوی بکەن، دواتر کە دکتۆر یەشاری لەوێ ناسی بوو پێیووتبوو: دەمانچەیەکم بۆ پەیدابکە بۆ ئەوەی ئەو دوو پاسەوانەی خۆم بکوژم و بە برینداری رابکەمەوە بۆ لای برادەران. بەداخەوە دوای چاکبوونەوەی بێ سەروشوێن کرا. ئەم شەهید خالیدە لێپرسراوی شانەیەکی چەکدار بوو لە ناوشاری سلێمانی کە بریتی بوون لە: بەکر عەلی مارف و ئاکۆ عەلی زۆراب و چەند کەسێکی تر، دوای گرتنی شەهید خالید ئەم شانەیە لە چالاکی کەوت.

لە هاوینی ١٩٨١ ئەبو ئەحمەد کە ناوی تەواوی عەبدولڕەحمان قەصاب بوو لە عەرەبەکانی موصل بوو، حیزب لە ئیدارە داینابوو کە ئیدارییەکی باش بوو، بۆ هەر پێشمەرگەیەك هەفتەی شەش پەنجایی دانابوو بۆ گۆشتخواردن، ئێمە لەگەڵیدا ڕێککەوتین کە مانگانە پارەی گۆشتەکەی ئێمە بدات، کە نزیکەی ٢٠ پێشمەرگە دەبووین، کە پارەکەمان لێوەردەگرت جاری وا هەبوو چوار مانگی پێدەچوو، دەچووینە خوارەوە ئاژەڵێکمان پێدەکڕی. هەمیشە بێ گۆشت نەبووین لە سایەی ئەبو ئەحمەدەوە، جارێك چووینە گوندی هەولۆ کە ماڵی نائیب و سامی وەستا سابیری لێبوو، لەوێ دوو کورە نێرمان کڕی و سەرمانبڕین و چووینەسەر کانی و ئاوەکە دوو ڕۆژ دەستمانکرد بە خواردنیان، سەروپێیەکەشی بردمان بۆ ماڵی سامی و لەوێ خوشکە پەروینی خێزانی بۆمانی ئامادەکرد و ئەویشمان خوارد، ئەو گوندەی ماڵی برادەرانی خۆمانی لێبووایە زۆر پێمانخۆش بوو، چونکە وەکو ماڵی خۆمان هەڵسوکەوتمان دەکرد و زۆر یارمەتی دەدراین لەو ماڵە.

لە بەهاری ١٩٨١ لەگەڵ کەرتەکەی ئیسماعیل گەورەدێی نێوانمان خۆش بوو زۆرجار پێکەوە جەولەمان دەکرد، جارێك لە خڕی زێوێ لە کاروانێکی عەسکەریماندا برادەرێکی یەکێتی بریندار بوو. برادەرانی ئێمە زۆر ئارەزووی چالاکییان دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی ژمارەمان کەم بوو چەکەکانیشمان باش نەبوو لەبەر ئەوە نەماندەتوانی زۆر دەست لە دوژمن بوەشێنین، بەڵام لەگەڵ یەکێتی نیشتمانیدا چالاکیمان زۆر دەکرد، چونکە هەردوولامان پێمانخۆش بوو چالاکی هاوبەش بکەین.

لە زستانی ١٩٨١ لە دیوی ئێرانەوە هاتین بۆ خوارەوە بەفرێکی زۆر باری، ئەو ناوە زۆر کوێستان بوو، ویستمان لە گوندی دەرماناوێوە

بە شاخی زەرتکدا بڕۆین بۆ بێتووش، نزیکەی ٢٠ پێشمەرگە دەبووین، دانیشتوانی گوندەکە وتیان: مەڕۆن بە قسەمان نەکردن، کە گەیشتینە دامێنی شاخەکە هەورێکی رەش هات و دوایی سپی بوو نیشتەسەر شاخەکە و بەفرباراین دەستیپێکرد، هەر کلوویەکی بەقەدەر چۆلەکەیەك دەبوو، زانیم رێگامان لێدەگیرێت فەرمانم کرد کە بگەڕێنەوە بۆ دواوە، ٩ی بەیانی رۆیشتین کە بەفرەکە باری، بوو بە کاتژمێر ١٢، هەندێك لە برادەران نەیانویست بگەڕێنەوە دەیانووت: ئەوەندەمان نەماوە بۆ سەرشاخ. فەرمانمکرد ئەوەی نەگەڕێتەوە رەمی بکەن، کە گەڕاینەوە ئەگەر خۆش بووایە بە ٢ کاتژمێر دەگەڕاینەوە، بەڵام بەفر وای لێکردین کە بۆ ئێوارە کە تاریکی کرد گەیشتینە ناودێ و چەند برادەرێکمان پەلوپۆیان شکا بە کۆڵ هێنامانن، دانیشتوانی گوندەکە هاتن بە هانامانەوە وتیان: نەچنە بەر ئاگرەکە چوون ئاوی گەرمیان بۆ هێنایـن قاچ و دەستمان تێکرد تا بەفرەکەی سەری توایەوە، ئەگەر بە نازانی خۆمان بچووینایە بەر ئاگر قاچ و دەستمان پەکیاندەکەوت، باش بوو بە قسەی دانیشتووانی گوندەکەمان کرد، چونکە هەموو جلوبەرگ و قاچ و دەستمان بەستبووی، ئەگەر نەگەڕاینایەتەوە لەوانە بوو هەموومان رەق بووینایەنەوە.

زستانی ١٩٨١بارەگای بەتالیۆن چوو بۆ دولکان و بارەگای لقەکەی ئێمە لە بێتووش مایەوە، ئەبوو سەلام خەریکی دانانی ئێزگە بوو لەسەر شاخێکی بەرز لە نێوان بێتووش و دولکان، ئێزگەکە باش نەبوو، چونکە ئامێری باش بە ئاسانی دەستنەدەکەوت. هەر ئەو هاوینە دابەزین لە جنگیانەوە چووین بەرەو نۆدێ کە یەك کاتژمێر رێگایە، بەفرێکی زۆر بە باوە دەباری، ئێمە بە ٥ سەعات بڕیمان، کە کەوتینەڕێ بەفرباراین

دەستیپێکرد، نیوەی ڕێگامان بڕیبوو بەسەرە دەستمانکرد بە بەفر شکاندن کە زۆر زەحمەتە، هاوارم کرد وتم: بەناو دۆڵەکەدا مەڕۆن بەسەر سەرشاخەکەدا بڕۆن، دامانە قەدپاڵی شاخەکە، بەفر وا سەری لێشێواندبووین هەر بە دەوری خۆماندا دەسووراینەوە، چەند برادەرێك زۆر بەهێزبوون وەکو ئەبو شەهاب و نەژاد و شەهید زاهیر قرگەیی و نەژادی حەمە قرگەیی و من. هاوڕێ عەتا زۆر بە غیرەت بوو، بەڵام توانای بەفرشکاندنی نەبوو هەر هاواری دەکرد کوڕینە وریابن ئازابن، کاوەی برای نەژاد پەکیکەوت بەشان هەڵمانگرت، بۆ شەو گەیشتینە نۆدێ بە هیلاکی، بۆ بەیانی بەرەو گوندەکانی تر کەوتینەڕێ.

لە زستانی ١٩٨١لە حاجی مامەندەوە بەڕێکەوتین بۆ پاڕەزان، لە ڕێگا تووشی دووکەس بووین باڵی یەکێکیان پەستبوو دەیانبرد بۆ پاڕەزان بۆ نزرگەی عەلی کۆسە بۆ چاك بوونەوە، چونکە کاڵفام بوو. بە باڵ بەستراوی وتی: ئێوە کێن؟ منیش وتم: جەماعەتی حیزبی شیوعین. وتی: سەرەکەی تری لە کوێیە ! ؟ رامام وتم: سەری چی کاکە، یەکێك لەوانەی لەگەڵی بوو وتی: تێکچووە گوێی مەدەرێ، مەبەستی ئەوەیە ئێوە مەسافەتان وەرگرتووە، ئەڵێ ئەمە دوایەکەیەتی ئەی پێشایەکەی لە کوێیە ! ؟ بوو بە پێکەنین.

لە زستانی ١٩٨١ لە گوندی گەڕەدێ لەگەڵ شێخ کاوەی حەفیدا بووین هەواڵ هات وتیان: جاش و جەیش هێرش دەکات بۆ گەڕەدێ. لەبەر ئەوەی شێخ کاوە نەخۆشی مەعیدەی هەبوو ئەوکاتە ئازاری دەدا، من چووم ولاغێکم بۆ پەیداکرد و رەوانەی نۆدێمان کرد بۆ ماڵی خەلیفە، پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو ناوی شێخ نوری بوو دەیویست خۆی بشارێتەوە دەیووت: من دەچم کەمین دادەنێنم، شێخ کاوە لێیتووڕە بوو

پێیووت: تۆ بزانه‌ كاك صالّح ده‌لّێت چی لای ئه‌و بمێنه‌ره‌وه‌! ئێمه‌ دوای ره‌وانه‌كردنی شێخ كاوه‌ كه‌مینمان له‌ خوار گوندی گه‌ڕه‌دێوه‌ دانا و دامه‌زراین بۆ به‌رپه‌رچدانه‌وه‌ی دوژمن، به‌لاّم دیار بوو هه‌والّه‌كه‌ ناڕاست بوو ئێمه‌ گه‌ڕاینه‌وه‌ بۆ ناودێ.

له‌ زستانی ١٩٨١ نزیكه‌ی ٣٠ پێشمه‌رگه‌ ده‌بووین هاتین بۆ قه‌ره‌چه‌تان، كه‌ریمی مام عومه‌ری ئامۆزام مه‌ڕێكی بۆمان سه‌ربڕی میوانداری كردم و پێیوتم: ٥ بۆ ٦ پێشمه‌رگه‌ له‌گه‌لّ خۆت بێنه‌، منیش ئیسماعیل دیكتارۆف و عه‌تا و ره‌ئوفه‌ شه‌ل و شێرزادی عه‌لی ده‌ولّه‌تم له‌گه‌لّ بوو، خواردنیان بۆ هێناین، هه‌ر دوو پێشمه‌رگه‌ سینییه‌ك خواردنی پڕ له‌ گۆشتی به‌ركه‌وت. شێرزاد و ره‌ئوف زۆر ناته‌بابوون له‌گه‌لّ یه‌ك، كه‌وتنه‌ لای یه‌كتر، ره‌ئوف زۆری خواردبوو به‌ په‌له‌په‌ل بۆ ئه‌وه‌ی شێرزاد زۆر نه‌خوات! له‌ پڕ ره‌ئوف له‌سه‌ر سینییه‌كه‌ بوورایه‌وه‌، پاش راوه‌شان و ئاو پیاكردنی هۆشی هاته‌وه‌ وتی: هاوڕێ بۆ واملێهات!؟ پێموت: ئه‌وه‌نده‌ په‌له‌په‌لت كرد بۆ ئه‌وه‌ی شێرزاد زۆر نه‌خوات بۆیه‌ واتلێهات! وتی: ئه‌وه‌ چۆن زانیت!؟؟

له‌ زستانی ١٩٨١ به‌ شارباژێڕدا ده‌گه‌ڕاین و جه‌وله‌مان ده‌كرد، پێشمه‌رگه‌یه‌كمان له‌گه‌لّ بوو ناوی مامۆستا جه‌مال بوو دومه‌لّ له‌ شوێنێكی خراپی هاتبوو، دكتۆرێكی یه‌كێتی ته‌داوی ده‌كرد، شێخ كاوه‌ی حه‌فید هات بۆ سه‌ردانمان له‌ مالّی حاجی قادر له‌ بزه‌نیان، گولاجی بۆ هێنابوو بۆ ئازارشكاندن، به‌ پێكه‌نینه‌وه‌ وتی: مامۆستا چۆنی چاوت چۆنه‌؟! مامۆستا ده‌ستیكرد به‌ پێكه‌نین و وتی: باشترم. له‌وكاته‌دا منداڵه‌كانم هاتبوونه‌ سه‌ردانم له‌ مالّی حاجی قادر، به‌هۆی ئه‌وه‌ی كوڕێكی حاجی قادر له‌ سلێمانی پێشئه‌وه‌ی ببمه‌ پێشمه‌رگه‌

نیوەی سەیارەیەکی پیکابم پێ فرۆشتبوو بەداخەوە بوو بەژێر سەیارەکەوە و مرد. شێخ کاوەی حەفید لەگەڵم نێوانی خۆشبوو، پێکەوە جەولەمان دەکرد و مەفرەزەمان پێکەوە ئەنارد بۆسلێمانی، تا ئەوکاتەی لەگەڵ یەکێتی نێوانیان تێکچوو، چونکە ئەمان بە ناوی لەشکری شێخ مەحمود ناویان دەرکردبوو، یەکێتی هاتن چەکیانکردن و بردیانن بۆ سەرکردایەتی. دواتر پێشمەرگەکانیان زۆریان بوون بە پێشمەرگە لەگەڵ ئێمە، منیش بەرانێکم بۆیان سەربڕی لە نۆدێ، لەو پێشمەرگانەی شێخ کاوە کە هاتن بۆ لای ئێمە: ئەبو شەهاب ناوی ئەحمەد بوو، شێخ لەتیف کە زاوای حاجی خەلیفە بوو لە نۆدێ ناوی شێرکۆ بوو، رێبوار، ئەحمەد، ابوعەلی، ئاکۆ، سوارە، مامۆستا قادر، هتد، ئەو برادەرانەم هێنا بۆ بارەگای حیزب لە بێتووش ماوەیەکی زۆر لەگەڵمان بوون.

مامۆستا قادر کە خوشکەزای جەزای نیقابە بوو، لە گوندی باراو لەلایەن دوو تاوانبارەوە شەهید کرا بۆ تفەنگەکەی کە لە دەست یەکێتی رایانکردبوو، لە گوندی باراو بە خاکسپێردرا و ئێستاش گۆڕەکەی لەوێ ماوە، چونکە خەڵکی گوندەکە نەیانهێشت بیبەنەوە بۆ سلێمانی. دواتر ئێمە و یەکێتی دانیشتنێکمانکرد کە بریتی بوون لە بەکری حاجی سەفەر و شەوکەتی حاجی موشیر خوا لێیانخۆش بێت لە یەکێتی و لە ئێمەش من و ئیسماعیل نەسرولڵا خوالێیخۆش بێت، بڕیارماندا دوو مەفرەزە دروست بکەین یەکێکیان لە ئێمە و یەکێکیان لە یەکێتی، مەفرەزەکەی ئێمە بە سەرکردایەتی جەلال عەلی بوو. ئەو دوو تاوانبارە سەر بە کەرتی هەمەوەندی ناوچەی چەمچەماڵ بوون، دوای بەڕێکەوتنی مەفرەزەکە مامە ریشە هاتەلامەوە وتی: کاک صالح بۆ منتان دەستنیشاننەکرد لای

حكومەتیش بوونایە ئەو دوو تاوانبارەم دەهێنایەوە !؟ منیش وتم: دەستنیشانكردنی تۆ بە دەست كاك بەكر و كاك شەوكەتە. دوای مانگێك گەڕان ئەو دوو مەفرەزەیە نەیانتوانی بیانگرن.

پاش ماوەیەك حەلاوە خانی دایكی شێخ كاوە هات بۆ بارەگای حیزبی شیوعی لە نۆكان، لەگەڵ عەزیز محەمەد گفتوگۆی كرد دەربارەی شێخ كاوە، هاوڕێ عەزیز نامەیەكی بۆ مام جەلال نارد لە نامەكەدا نووسرابوو حەلاوەخان هاتووە بۆ ئێرە، بەڵكو شێخ كاوە بنێریت بۆ لای. شێخ كاوە هات بۆ لای دایكی و ئیتر نەچووەوە بۆ بارەگای یەكێتی، شێخ كاوە چوو بۆ قرناقە ویستی لەگەڵ محەمەدی حاجی مەحمود و ملازم تایەری قلیجە رێكخراوێك دروستبكەن، بەڵام بەداخەوە لە زستانی ساڵی ١٩٨٢ بەفرێكی زۆرباری، لەگەڵ ملازم تایەر لە ناوچەی كۆنەلاجان لە دیوی خانێ، بوون بەژێر هەرەسی بەفرەوە. بەداخەوە زۆربەیان لە ژیاندا نەماون خوا لێیانخۆش بێت.

كاتێك مەولود تەلانی و هاورێكانی چووبوون بۆ دەرهێنانەوەی تەرمی پیرۆزیان، شێخ كاوە پێشتر كەوێكی پێبوو لەسەر تەرمەكەی دەیخوێند لەناو قەفەزەكەیدا، تەرمەكانی هێنایەوە بۆ كەرەجاڵ، لە كاتی ناردنەوەی تەرمەكان بۆ سلێمانی كاك مەولود وتاری لەسەر تەرمەكان خوێندبووەوە و رەوانەی سلێمانی كردنەوە.

لە زستانی ١٩٨١چووین بۆ بێتووش وتیان: حیزبی سوشیالیست نامەیان بۆ ناوچەی دوكان نووسیوە چۆن وەڵامیان بدەینەوە؟ وتم: دەچین بۆ گوندی سەرگەڵو لەوێ ماڵی دایكی شەهید شێركۆ لەوێیە، وەڵامی نامەكە دەبەین بۆ ئەوێ و پێیان دەگات، نامەكە بۆئەوە بوو ئەو برادەرانەی حسك لە خوارەوەن بە رێگەی حیزبدا بیانهێنین بۆ سەرەوە

بۆ ئەوەی یەکێتی چەکیان نەکات، چونکە ئێمە لەگەڵ حیزبی دیموکرات نێوانمان خوش بوو، بڕیاردرا من بچم بۆ سەرچەمی هەرزنە چاوەڕێیان بکەم، تا نیوەڕۆ لەویَ بووین نەهاتن، ئەوان لای دیناران و کەڵەکان لە پردی تەیەت پەڕیبوونەوە و چووبوونە بارەگای بەتالیۆن لای حەمەڕەشید قەرەداغی، لە دولکان خولە تەشویَ و شێخ صدیقیان دیبوو بە هەڵە هەواڵیان دابوو بە حیزبی دیموکرات کە قیادە مۆقەدە هاتوون بە نیازن هەمووتان بکوژن، لەبەر ئەوەی حاجی مەحمودی گەورەدێیان لەگەڵ بوو، کە بە پارتی ناسراو بوو. منیش لە مەزناویَ نانی نیوەڕۆم خوارد و چوومە سەردانی عومەر کۆکۆیی کە یەکێك بوو لە بریندارەکانی شەڕ لەگەڵ جەمالی عەلی باپیر، زۆری پێخۆش بوو، گەڕامەوە بۆ بێتووش چواردەوری بارەگای ئێمە گیرابوو لە لایەن حیزبی دیموکراتەوە، هەواڵم نارد بۆ بارەگای بەتالیۆن وتیان: چوار دەوری بارەگای بەتالیۆنیش گیراوە، بەبیَ تەل سەرکردایەتیم ئاگادارکردەوە، بەڕێکەوت ئەمیری قازی میوانی حیزب بوو لە سەرکردایەتی، ئەویش بەبیَ تەل ناوچەی ئالانی ئاگادارکردەوە ئەوانە قیادە مۆقەدە نین حیزبی سوشیالیستن، لەگەڵ حیزبی شیوعی بە مەفرەزەی هاوبەش ڕەوانەیان بکەن بۆ سەرکردایەتی. عەبدوڵڵا هەمزە و قادر چاوشین و صاڵحەسور وتیان: ئێمە ناچین بۆ سەرکردایەتی و ئێوە لێرە بەرگریتان لێکردین بۆ ئەوەی لێمان نەدەن، ئەگەر بڕۆین لە ڕێگا هەر لێمان دەدەن، ئێمەش لەگەڵ حیزبی دیموکرات مەولود تەلانی و کمالی کوێخا عەبدوڵڵامان گەیاندە سەرکردایەتی. دوایی عەبدوڵڵا هەمزە و قادر چاوشینی حسك لە کەڵکی قامیش بازگەیان دانا هەر کاروانچییەك لە ناوچەی ئالانی ئێران بهاتایە دەیانگرت و ڕەوانەی ئێرانیان دەکردەوە و پێیاندەووتن: ئێوە ڕێگەی ئێمەتان نەدا بچینە

سەرکردایەتی بچنەوە بە لێپرسراوی ناوچەی ئالان بڵێن تا لەم ناوچەیە بین ناهێڵین ئێرانییەك بێتە ئەمدیو.

لە مانگی ١٢ی ١٩٨١ لە دولکانەوە هەردوو لقی شاربازێر و گەرمیان دابەزین بۆ ناوچەی دۆڵی جافایەتی، کە هاوانێکی ٦٠ ملم و چەند گوللەهاوانێکمان بە هێستر بارکردبوو، بەفرێکی زۆرباری چەند رۆژێك لە گوندی هەڵەدن ماینەوە لە ماڵی سەعیدی برای حەمەی سوارە، دواتر بەرێکەوتین بەرەو سەرمۆرد و لەوێوە بۆ گوندی قەمچوغە، لەوێ چەند برادەرێکی شیوعی کۆنمان بینی وەکو حاجی عەبدوڵڵا و عومەری برای، رێنماییان کردین و زانیارییان داینێ کە چۆن بپەڕینەوە بۆ گوندی تەلان، چووینە گوندی سردی گەورە لەوێ بە برادەرە عەرەبەکانمان وت: کە بە عەرەبی قسە نەکەن بۆ ئەوەی نەزانن پێشمەرگەی حیزبی شیوعین بۆ ئەوەی کەشف نەبین تا جاسووسەکانی رژێم هەواڵ بە رژێم نەدەن، چونکە رژێم لە گوندەکان جاسووسی دادەنا دژی شۆڕش. برادەرێکی عەرەبمان هەبوو ناوی ئەبو هنا بوو چووبوو بۆ دوکانێك وتبوی: برا جوغەر هەیە ! ؟ کابرا زانی عەرەبە، بەڵام دواتر پێیووترا کە جارێکیتر دوبارەی نەکاتەوە. بۆ بەیانی چووینە چەمی سوورقاوشان و لە ماڵەکانی خێڵی مەولە کە جاف بوون ماینەوە، لەوێ برادەرانی یەکێتیمان بینی لە هەرێمی دوو کە عەلی بچکۆل ئامر هەرێمیان بوو، تا ئێوارە لەگەڵیان بووین، برادەرانی یەکێتی پێشتر تووشی شەڕبوون فیشەکیان پێ نەمابوو، ئێمە فیشەکی زیادەی خۆمان پێشکەشی ئەوان کرد، هەردوولامان بە هاوبەشی بەرێکەوتین بۆ بۆڵقامیش، بۆ بەیانی چووینە کلێسە، دوای پشوویەك بەرەو کۆپتەپە بەرێکەوتین و چەند رۆژێك لەو ناوچەیە ماینەوە، شەهید بەکر تەلانی و کۆمەڵێك کوڕی ئازا

کۆمەڵێك چالاکییان کرد لە هۆکاشە و ناحیـەی ڕێدارە و نەبی ئـاوا، گەڕانەوە بۆ دەوروپشتی عەسکەر و کۆپتەپە، لەو ناوچەیە نزیکـەی مانگێکمان پێچوو، لە گەڕانەوەماندا لە ڕەبایەکانی قەشقۆلیمان دا بە هاوەن، تا ئێوارە شەڕ بوو هێز لە دوکانەوە هات دژمان، ئێمە سەرکەوتین بەرەو تەلان، بۆ بەیانی چووینە قەمچۆغە و لەوێ بەشی هەندەسە بە سەرکردایەتی ئەبو ڕەزا چەند ئەڵغامێکیان دانا بۆ ڕەبایەکانی مەشروعی ئاو و شەریکەی کەتانە، ئەڵغامێك بە زیلێکدا تەقییەوە و چەند جوندییەکی کوشت، دواتر گەڕاینەوە بۆ زێوێ کە بەفرێکی زۆر شاخەکانی داپۆشیبوو، منیش کۆمەڵێك عەلاکە و پەتم هەڵگرت برادەران پێیانوتم: بۆ چیتە ! ؟ منیش وتم: دوایی پێتاندەڵێم. پێش برادەران کەوتم و بەسەر شاخەکەدا سەرکەوتم کە دەگەیشتمە هەر دارێك عەلاکەیەکم بە پەت دەبەست بە دارەکەوە بۆ ئەوەی برادەران لە کاتی سەرکەوتنی شاخەکەدا ڕێگایان لێ هەڵە نەبێت و نەکەونەخوارەوە، ئەنجا بۆیان دەرکەوت ئەو عەلاکانەم بۆ چییە ! دواتر چووین بۆ قزلەر و لەوێوە بۆ گوندی هەڵەدن، ئەو هێسترەی پێمان بوو مانی گرت و لە پڕ دەرچوو، چوو بۆ ئەوماڵەی پێشتر ئالیکی لێخواردبوو، دواتر گەڕاینەوە بۆ دولکان.

لە زستانی ١٩٨١ لە سەرگەڵو شەوماینەوە، گوندێکی قەرەباڵغ بوو، پێشمەرگە ئێوارە لە هەر ماڵێك کە دادەمەزرا، پاش نانخواردن هەر پێشمەرگە و بەتانییەکیان دەداپێی بۆ ئەوەی لە مزگەوت پێی بخەوێت، بۆ بەیانی دەچووەوە و هەر لەو ماڵە نانی بەیانی دەخوارد و بەتانییەکەی دەدایەوە بە خاوەن ماڵەکە. ئەو ئێوارەیە زۆر تاریك بوو دوو پێشمەرگە چووبوونە ماڵێك بۆ بەیانی ڕێگای ماڵەکەیان لێ هەڵە

ببوو، هەواڵی ماڵەکەیان لە پیاوێکی بەساڵاچوو پرسی بوو، پێیووتبوون: ئێوە ئالیکتان لەوێ خواردووە چۆن نایدۆزنەوە ! ؟ نەیاندەزانی ئالیک مانای چییە، هاتبوونەوە بۆ لای من وتیان: ئەو پیاوە وای وتووە، ئالیك مانای چییە ! ؟ منیش بە پێکەنینەوە وتم: ئالیك مانای نانی ئێوارەیە کە خواردووتانە.

لە مانگی ٣ی١٩٨١لەگەڵ عەتاخڕە و چەند برادەرێك چووین بۆ قەرەچەتان لەوێ وتیان: ئەمڕۆ قادر چاوشین و عەبدوڵڵا همزە و صاڵحە سوور و حاجی مەحمودیان لە حەسیب صاڵح بینیووە و تەسلیم بوونەتەوە، ئێمەش زۆرمان پێناخۆش بوو. بۆ بەیانی هاتین بۆ هەناران لە ماڵی عەلی برای رەشە قالە ماینەوە کە ژنەکەی منی دەناسی وتی: کاك صاڵح ئێوە لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە هیچتان نییە ! ؟ وتم: کێن؟ وتیان: جەماعەتی حسکن و قادر چاوشین و عەبدوڵڵا همزە و صاڵحەسوور و حاجی مەحمودیان لەگەڵە، پێمووتن: نێوانمان خۆشە و منداڵێك بنێرە و پێیانڕابگەیەنە کە من لێرەم. ئەوانیش سەردانیان کردم و پێمووتن بە هەموو باوەڕی خۆم باوەڕم کردبوو کە ئێوە تەسلیم بوونەتەوە ! ئەوانیش وتیان: ئەوە تەنزیماتی یەکێتییە کە هەواڵی وایان بڵاوکردۆتەوە. تا ئێوارە لەوێ بووین، بەڵام دوای ئەوە من بەجێمهێشتن و بەرەو چالگە بەڕێکەوتین و چوومە ماڵی جەلالی مامە تالە کە خزمی من و عەتا بوو، چەند شەوێك لای ماینەوە بەداخەوە ئەسپەکەی تۆپی بوو کاك جلال زەوقی نەما بوو، ئێمە دڵخۆشیمان دایەوە کە خوا جێگای بۆ پڕ دەکاتەوە. دوای ئەو چەند شەوە بەرەو سیتەك بەڕێکەوتین.

لە بەهاری ١٩٨١ شەوێك لە مزگەوتەكەی قەرەچەتان بووین، شەهید سمایل و دوو پێشمەرگەی تر لە هەرێمی دوو پەڕیبوونەوە بۆبەری قەرەچەتان، لەوكاتەدا بەكرە ریشە حەرەس بوو كولەپالێكی هەورامی لەبەردا بوو، بانگی كردن ئەوان رایانكرد، بە دزییەوە هاتبوون لە گوندەكەیان پرسیبوو ئەوانە كێن؟ پێیانووتبوون: جەماعەتی حیزبی شیوعین، بۆ بەیانی لە پشتی قەرەچەتان یەكترمان ناسییەوە، شەهید ئیسماعیل وتی: ئێمە بە كولەپالەكەی وامانزانی جاشەكانی شارەزوورن هاتوون، دواتر ئێمەیان جێهێشت و ئێمەش سەركەوتین بۆ شاخی پیرەمەگرون. لە پشت گوندی قەرەچەتان نزیك زەردی رەبەنە پیاوێكی گوندەكە تەڵەی نابووەوە ناوی ئەحمەد مام عەبدوڵڵا رسول بوو، گوێم لە بارەی ئەو حەیوانە كێوییە بوو كە تەڵەكە گرتبووی، دوو برادەرم نارد یەكێكیان ناوی جەمال هەڵەبجەیی بوو ئەوی تریان ناوی بەكر بەلەكجاری بوو كە زۆر شارەزابوون، پێمووتن: بە وریایی لە تەڵەكەی بكەنەوە، چونكە رادەكات (حەیوانە كێوی ئەتوانێت بە برینداری لەسەر ٣ قاچ رابكات) چوون هێنایان، برادەرێكی ترم نارد بۆ گوندی قەرەچەتان بە شوێن كاك ئەحمەددا و پێیانووتبوو: تەڵەكەت حەیوانی گرتووە و لای ئێمەیە. كاتێك كاك ئەحمەد هات بۆ لام رێكەوتین لەسەر ئەوەی پارەی حەیوانێكمان باتێ و حەیوانە كێوییەكە بەرێت بۆ خۆی، چونكە یاسای راو بوو هەر كەسێك یەكەم كەس بچێتەسەر تەڵە كە حەیوانی پێوە بێ دەبێت بە هی خۆی!؟ بە پارەكەی كاك ئەحمەد چووین بۆ زێوێ حەیوانێكی باشمان پێكڕی و لە مزگەوتەكە دەستمان كرد بە گۆشت برژاندن و چووین مەنجەڵمان پەیداكرد بۆ لێنانی ئێسكەكانی، پاش تێرخواردنێكی باش بەرەو گوندی قزلەر بەڕێكەوتین. بەداخەوە شەهید ئیسماعیل و برادەرەكانی هاوبەشی خواردنی حەیوانەكە نەبوون.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨١ ماڵم لە گوندی هەڵەدن بوو لە ماڵی حاجی قادری ئامۆزای حەمەی سوارە بووم، کە ژنەکەی ناوی ئامین بوو ئامۆزای خۆم بوو، جارێك لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەك چوومەوە بۆ حەوانەوە، ئێوارە لەسەر سەکۆی ماڵەوە دانیشتبووین، گاگەلی گوندەکە دەهاتەوە، مانگای ماڵەکە هاتەوە بۆ حەوشەکەیان، پێشمەرگەیەکم لەگەڵ بوو ناوی زەکی بوو پێیاندەووت: صەباح، لە پڕ هەستا و خەریك بوو رابکات! منیش دەستمگرت و وتم: چی بووە؟! وتی: ئەو مانگایە کێوییە یان ماڵییە!؟ سەیرم کرد کە مانگا زەردەکەی ماڵی خۆمان بوو وتم: مانگا لە کوردستاندا کێوی نییە هەمووی ماڵییە! بەڵام وتی: من لە فیلمدا دیومە کە مانگای کێویش هەیە، دەستمانگرت بە پێکەنین. کاتێك عەزیز شیوعی بەرێکەوت لە ماڵمان بوو دەگەڕایەوە بۆ گەرمیان، ئەویش کەمێك سوبعەتی لەگەڵدا کرد و وتی: تۆ لە مانگا دەترسی، دەبێت دەبابە ببینی چی بکەیت!؟ زەکی تووڕە بوو وتی: واتە من ترسنۆکم، باوکم و عومەری برام لەوێ بوون، باوکم وتی: نابێت بترسیت کە هات تۆ تفەنگت پێیە تەقەی لێبکە و بیکوژە نابێت رابکەیت! ئیتر ئەو شەوە بەزم بەزمی زەکی و مانگا بوو، زۆری برسی بوو داوای نانی کرد باوکم وتی: نانی مەدەنێ، چونکە لە مانگا ترساوە، ئیتر تووڕە بوو وتی: نان هەر ناخۆم. هەر ئەوشەوە ئارامی کوردۆلۆجی لە سەربانی ماڵەکە خەوتبوو، مارێك بەسەر ورگیدا رۆیشتبوو گاژێکی لەسەر سنگی بە جێهێشتبوو! بۆ بەیانی وتی: مارێك توێکڵەکەی لەسەر سنگم بەجێهێشتووە نەیدەزانی پێیدەووترێت: کاژ.

لەو ساڵەدا مار زۆر بوو، شەوێك قومری خێزانم بە لایت هەمیشە سەیری بن میچی خانووەکەی دەکرد و دەگەڕا بۆ بینینی مار، چونکە

زۆر لە مار دەترسا، لە پڕ وتی: ئەوە مارێکە ! منیش وتم: لایتەکەم بەرێ کە سەیرم کرد مار بوو، چەکەکەم خستەسەر ریز و چەند کوللەیەکم پێوەنا و بەربووەوە بوو بە هەرا و خەڵك کۆبوونەوە وتیان: لە کوێیە؟ خێزانم لایتەکەی لێدا لە شوێنی مارەکە بۆ ئەوەی نیشانیان بدات هاواری کرد وتی: ئەوە مارێکی ترە ! وتم: لایتەکەی لێدە، تەقەم لێکرد و ئەویشم بەردایەوە، دراوسێکان هاتن وتیان: وامانزانی شتی خراپ روویداوە. ئەو شەوە باس باس مار بوو خێزانم وتی: ئەوە مارێکی ترە ئەویشمان کوشت، دەیانووت: ئاشقە و ماشقەن، یەکێکیتر ماوە تا نیوەشەو چاوەڕێ بووین، بەڵام هەر ئەو سێ مارە بوون. دوای ئەوەی ماڵمان چوو بوو بۆ مالوومە شەوێك ئیسماعیل گەورەدێیی سەردانی کردین، مارێك سەری شۆڕ کردبووەوە بۆ سەر سەری من، خێزانم وتی: ئەوە مارە خەریکە بەر دەبێتەوەسەر شانت، منیش بە چەکەکەم فیشەکێکم پێوەنا و کەوتە خوارەوە.

لە هاوینی ١٩٨١ یەکێتی نیشتمانی دەستیانکرد بە چەککردنی لەشکری ئیسلامی کورد، منیش لای خۆمەوە نامەم بۆ هەندێکیان کرد بۆ ئەوەی کاتێك یەکێتی ئازاری دان بێنە لای ئێمە ببن بە پێشمەرگە وەکو: مارف گاپیلۆێنی و حاجی صاڵح بەرگوردی و بەکر زەروونی و محەمەد بەرگوردی و هتد. دوای شەڕی سەرگەڵو و حاجی مامەند، ئەم برادەرانە خۆیان و چەکەکانیان هاتنە لای ئێمە بوون بە پێشمەرگە، رۆژێك لە خوار گەرەدێ صلاح سعید قەزاز کە سەرتیب بوو بینیمان، پاش چۆنی و چاکی، چاوی بە حاجی صاڵح کەوت وتی: کاك صاڵح قەرەچەتانی حاجی صاڵح و شوعییەت کوجا مەرحەبا ! ؟ منیش وتم: لە ترسی ئێوە بووە بە شوعی و منیش بە زمانی حاجی تێمگەیاندووە شوعییەت مانای چییە.

لە بەهاری ١٩٨١ دەچووم بۆ بە پیرەوەهاتنی ئەو هاوڕێیانەی کە لە شەڕی بۆڵقامیش رزگاریان ببوو، بەرەو بۆڵقامیش دەڕۆیشتم لە گوندی سەرگەڵو هاوڕێکانم بینی کە بریتی بوون لە: جوامێر (عەبدوڵڵا رەمەزان) کە دەستی شکابوو لەو شەڕەدا، (زۆر سوپاسی دەکەم لە دابینکردنی وێنەی شەهیدەکانی بۆڵقامیش) و لەگەڵ مام سعید کە یاسین و کوڕێکی تری لەو شەڕەدا شەهید ببوون و کوڕێکی تری مام سعیدیان لەگەڵ بوو. پاشان گەڕاینەوە بۆ بێتووش. باسی شەڕەکەیان کرد کە گوللەی جاش لێی نەدابوون تەنها تەیارە شەهیدی کردبوون کە بریتی بوون لە ٢٢ کەس و بکر تەلانی سەرلقیان بوو بە برینداری بە جاشەکانی وتبوو: وەرن ئەم چەکەش بەرن، کاتێك جاشەکان دەگەڕان بۆ بردنی چەکی شەهیدەکان و نزیك دەبنەوە لێی جێگری سەرۆك جاشێکی کوشتبوو، دوایی خۆی خۆی شەهید کردبوو بە چەکەکەی خۆی بەداخەوە. لەو شەڕە دەستەویەخەیەدا محەمەد خدر کە خەڵکی بۆڵقامیش بوو شەهید ببوو، محەمەد رەشاش بەدیل گیرا بە برینداری دواتر بە لێبووردنی گشتی ئازاد کرا ئێستا لە ژیاندا ماوە، ئەوانەی شەهید ببوون زۆربەیان بە بۆمببارانی کۆپتەر شەهید بوون و لەلایەن رژێمەوە برابوون بۆ قەزای چەمچەماڵ بە کۆپتەر، لەوێ نێژرابوون کە بریتی بوون لە ١٥ کەس، ئەم زانیارییانە لە کاك عەبدوڵڵا رەمەزان وەرگیراوە کە خۆی بەشداری شەڕەکە بووە و رزگاری ببوو. لەهەمانکاتدا لە گەرمیانی ئەوبەر لە گوندی بەکر بایەف کە سەرلقەکەیان کاك حەسیب بوو نزیکەی ١٤ کەس شەهید بوون کە لە ناویاندا سەربازی کوڕی ئەحمەد بانی خێڵانی شەهید بوو، لە شەڕی قزلەر بەشدار بوو، تەنها ناوی ئەو دەزانم. ئەم دوو داستانە گەورەیە دوای داستانی قزلەر

تۆماركرا كە گورزێكی كوشندە بوو بۆ شوعییەكان، چونكە خۆمان بە ژمارە كەم بووین نزیكەی ٣٥ كەسمان لێ شەهید بوون لە ماوەیەكی كەمدا.

لە ساڵی ١٩٨١ لە بێتووش بووین، شێخ ئەحمەد ناوێك خەڵكی گوندی زیەڵێن بوو لە سوورقاوشان، لە مێولاكە شوان بوو لە ماڵی حاجی محەمەدی مێولاكە، لەگەڵمان هات بوو بە پێشمەرگە و چەند مانگێك لەگەڵمان بوو. كاك سابیر پێشمەرگەیەكی ئازابوو، لە كاتی ئێوارەدا لەگەڵ ئەم شێخ ئەحمەدە ببوو بە دەمەبۆڵەیان، بۆ شەو لە كاتی حەرەسیاتدا پێڵاوی هەموو پێشمەرگەكانی شاردبووەوە و ٣٠ فیشەكی بە نووستوویی نابوو بە شەهید سابیرەوە و رایكردبوو، برادەران دوای ئەوەی پێڵاوەكان دەدۆزنەوە دەچنەسەر چەمی هەرزنە و تا ئێوارە لەوێ دەبن، بەڵام نایدۆزنەوە، تەرمی پیرۆزی شەهید سابیر دەهێننەوە بۆ ناوچەی دوكان، چونكە خزمی مەحمودی حاجی نادر بوو. ماوەیەكی زۆر بۆی گەڕاین ببوو بە جاش لای قالە فەرەج، دواتر دیاربوو لەناوچوو بوو، چونكە بە تەواوی دیار نەما، لەگەڵ براكانی شەهید سابیر زۆر بۆی گەڕاین بە داخەوە نەماندۆزییەوە.

لە بەهاری ١٩٨١ دوو برادەرمان لەگەڵ بوو یەكێكیان تایەری حاجی قادر بوو ئەویتریان رەئوفە شەل بوو، نەماندەزانی بەچی شەل بووە، هەردووكیان ناویان یاسین بوو لای ئێمە زۆر هاوڕێی یەك بوون، هەر جارێك یاسین سزابدرایە رەئوفە شەلیش لەگەڵی دەڕۆیشت. جارێك مامۆستا خالید كە رابەر سیاسی بوو لە كاتی دامەزراندن دەیووت: دەبێت ئاقڵێك و بێ ئەقڵێك لەگەڵ یەك دابمەزرێن، بۆ ئەوەی لە كاتی پرسیاری خەڵكیدا ئاقڵەكە وەڵامبداتەوە! بەرێكەوت رەئوفە شەل و

مامۆستا خالید پێكەوە دامەزرابوون، رەئوف وتی: ماقووڵە من ئاقڵەكە بم و مامۆستاش بێ ئەقڵەكە بێت!؟؟ لەسەر ئەو هەڵوێستەی لە گوندی كانی درگە سزامان دا و چەكمان كرد، شەهید یاسینیش چەكەكەی دانا و لەگەڵی رۆیشت تا گوندەكانی دەوری بانە چووبوون، لەوێ لە شەهید یاسین جیابووەوە و رۆیشتبوو، كاتێك چوومەوە دولكان بینیم یاسین لەوێیە، پێموت: یاسینە شەل چی لێهات؟ وتی: چووە بۆ ئێران، دوای ئەوە یاسینە شەلمان نەدییەوە، دیار بوو لە بانەوە چووبوو بۆ سەقز لەوێ ماڵی خزمیان هەبوو. شەهید یاسین دوای ئەوە پێشمەرگەیەكی ئازای لێ پەیدابوو، بە داخەوە لە گوندی سۆیلەمیش شەهید بوو. دوو برای شەهید یاسین بەناوی سەردار و نەبەز لەگەڵمان پێشمەرگە بوون.

لە پاییزی ١٩٨١ لە گوندی هەڵەدن بووم لە دوكانێك دانیشتبووم كە دوكانی سۆرانی سوارە بوو، كاك مستەفا چاو رەش هات چاوی بە من كەوت دڵخۆش بوو، چونكە كاتی خۆی پێكەوە لە یەك حیزب بووین، لەو كاتەدا بلوزێكی سەوزی عەسكەریم بەسەر جلەكانمدا لەبەركردبوو مادالیایەكی لینینم بە بەرۆكمدا كردبوو، كاك مستەفا وتی: بە خوا ئێستاش ئەو وێنەیەم خۆشدەوێت، بەڵام من ساڵی ١٩٦٧ وازم لێیانهێناوە، تۆش چەند ساڵێكی تر وازدەهێنیت! لەبەر ئەوەی سەركردایەتی حیزبی شیوعی لە عێراق كار دەكات و ناتوانێت پێشەوایەتی جەماوەر بكات و تووشی لادان بووە لە بەرنامەی حیزب، من تۆم خۆشدەوێت و كوڕێكی ئازایت و ناتوانیت تا سەر لەگەڵیان بیت، چونكە پیاوی وەك تۆ لەگەڵ ئەوان ناگونجێت. بۆچوونەكەی زۆر راست بوو راستی كرد، دوای دوو ساڵ بەرەی جود دروست بوو كە من و زۆربەی ئەندامانی حیزب لەگەڵ ئەو بەرەیە نەبووین و كەوتمە

ڕەخنەگرتن، تا وای لێهات حیزب مولازم کەرەمی کرد بە جێگری بەتالیوێن، عەرەب بوو دەورەی لە یەمەن بینیبوو، نەدەبوایە ئەوە لەگەڵ من بکەن لەسەر جیاوازی بۆچوونەکانم، چونکە من مەفرەزەی سەرەتایی حیزب بووم و زۆر چالاك بووم، بەڵام ئەو بە دەورە شارەزایی بینیبوو، حیزبیش ئەو کەسانەی دەویست نەك کوڕی ئازا! تا وای لێهات دوای چوار ساڵ دوای ئەو چاوپێکەوتنە وازم لێیانهێنا، چونکە دوای پێکهێنانی بەرەی جود حیزب تووشی هەڵە بوو، شەڕی یەکێتی کرد و ئێمە ئەو شەڕەمان بێ قبوڵ نەبوو، خۆمان تێوە نەگلان و بۆچوونەکەشمان ڕاست دەرچوو، چونکە شەڕی پشت ئاشانی بە دووادا هات.

لە زستانی ١٩٨١ چووینە گوندی ولاغلو، نزیکی مزگەوتەکە بووینەوە گوێمان لە شلێپە شلێپ بوو نەماندەزانی چییە؟! کە چووینە ناو مزگەوتەکە خوالێخۆش بوو فاتیح شوانیم بینی و دوو کەس بە پێڵاو بە یەکیاندا دەکێشا و کاك فاتیحیش دانیشتبوو، وتم: ئەوە چییە؟ وتی: ئەوە خوڕەجاشە واتە شەڕە جاشە! ئەم کارەی لە خوڕەکەوی لادێ وەرگرتبوو کە کاتی بەهار شەڕە کەویان دەکرد، ئەمیش دووبارەی کردبووەوە بە جاشەکان! پێیوتم: خوڕەکەوت نەبینیوە؟ وتم: دیومە، بەڵام بەبێ شلێپە شلێپ! وتی: سەر و تاکە پێڵاوم داوە پێیان تا هیلاك دەبن بە یەکدا بکێشن بۆ ئەوەی پێشمەرگە هیلاك نەبێت با خۆیان لە یەك بدەن!؟ کە تەماشام کرد بە هەموو هێزی خۆیان لە پشتی یەکیان دەدا، بەمشێوەیە بوو کە یەکێکیان تا یەك کاتژمێر لە وی تری دەدا و دواتر پێچەوانە دەبووەوە، هەموو لەشی یەکیان شین کردبووەوە، بە ڕاستی ئەوە یەکەم جار بوو شتی وا ببینم کە هەردووکیان تاوانبار بن و

ئازاری یەکتری بدەن! هەر کەسێك دەهاتە مزگەوت سەری سووڕدەما لەو کارە، ئەگەر یەکێکیان بە هێواشی پیایدا بکێشایە کاك فاتیح دەیووت: ئەوە بەزەیت پیایدا دێتەوە ئینجا ئەو لە ترسی کاك فاتیح هێزی زیاتر بەکارهێنا و شڵپەی زیاتر دەهات! منیش وتم: بە خوا کارێکی باشە کە خۆتان هیلاك ناکەن و خۆیان بە خۆیان ئازار دەدەن، کاك فاتیح جێگری هەرێمی چوار بوو کە کاك شێخ دارای حەفید خوالێیخۆش بێت ئامر هەرێم بوو.

لە هاوینی ١٩٨٢ برادەرێکمان لەگەڵ بوو ناوی ئەبو رەزا بوو کوردی باش نەدەزانی، چونکە لە بغداد گەورە ببوو، بەڵام لە بنەڕەتدا کوردی فەیلی بوو لە بەشی هەندەسەی عەسکەری ئیشی کردبوو، لە تەقینەوەی باش دەزانی. هاوڕێ جلال عەلی کە سەرپەلی شارباژێر بوو لەگەڵی چوو بۆ تەقینەوەی هێڵی پەستان بەرزی کارەبا لە هوانە، لەبەر ئەوەی هاوڕێ جلال شارەزایی باشی نەبوو لەو کارەدا چاوێکی لەدەستدا بەداخەوە. دوای چەند رۆژێك هاوڕێ عومەر حامی و هاوڕێ عەتا بە مەفرەزەیەکی گەورە چوون بۆ سلێمانی لە رێگەی گوندی قرگەوە، چونکە برادەرانی قرگە شارەزابوون، هاوڕێ زاهیر قرگەیی پێش هێزەکە کەوتبوو، بەڵام جاش پێیانزانیبوو لە ناو گوندەکە دابەش ببوون، لەو گردەی بەرامبەر قرگە بەسەر رێگای گوندەکەدا زاڵبوو، هاوڕێ زاهیر بەرەو گردەکە چوو بوو بەداخەوە شەهیدیان کرد، دواتر هێزەکە لە پشت ناودێوە بە ئاربێجی و حەفارۆف هێرشیان بۆ جاشەکان کرد بوو، جاشەکانیان راونابوو. بۆ بەیانی حاجی محەمەدی باوکی شەهید زاهیر و کەسوکاریان هاتن بۆ گوندی عازەبان لەوێ پرسەمان دانا. حاجی محەمەد و تایەری برای زۆریان پێناخۆش بوو کە پێشتر ئاگادار

نەکرابوونەوە لە هاتنیان تابزانن، بۆ ئەوەی ئەو کارەساتـەیـان بـەسـەر نەهاتایە، لەبەرئەوەی گوندەکە دۆست و رێکخستنی حیزبی لێبوو، دوای ئەوە بە چەند رۆژێك لەگەڵ مەفرەزەیەك چووینەسەر کانییەکەی گونـدی وێڵەیەر کە ٣ جوندی ئاویان لێ دەبرد، تەقەمان لێکـردن رایـانـکـرد بـۆ ناوگوندەکە خەڵکی گوندەکەش جوندییەکانیـان شـاردەوە لـێـمـان بـۆ ئەوەی رژێم ئازاریان نەدا، چونکە رەبایەکە زاڵ بوو بەسەر گـونـدەکـەدا کە تەقەیان لە ئێمە دەکرد.

لە زستانی ١٩٨٢ چووینە سیتەك سەردانی حەلاوە خانی خێـزانـی شێخ لەتیفمان کرد خوالێیان خۆش بێت، هەواڵـی شـێـخ کـاوەمـان بـۆ بردبوو، زۆر رێزی لێگـرتـیـن وتـی: ئـێـوە جـیـاوازن بـۆ مـن لـە چـاو پێشمەرگەکانی لایەنەکانی تر، چونکە ئێوە هاورێی منن، نابێت بچـن بـۆ دامەزراندن دەبێت بۆ ئێوارە میوانی من بن، ئێمەشماینەوە کە بـریـتـی بووین لە ٧ کەس بەم ناوانە: من و عەتـا و ئـەحـمـەد رەجـەب و عـەلی بچکۆل و بێکەس و دووانی تر، خواردنێکی باشی بۆ دروستکردیـن وەکـو خوانی سلێمانی وا بوو، حەلاوە خان وتی: ئەمە خواردنی ئـێـوە نـیـیـە، چونکە درەنگ هاتن، ئەم خواردنەم بە دڵ نییە. منیـش وتم: خـوشـکـی بەرێز راست ئەکەیت ئەمە خواردنی ئێمە نیە، خواردنی ئێمە ساوەر یـان تەماتەی سوورەوەکراوە ! ؟ ئیتر بوو بە پێکەنین. ئێستاش ئەو خـواردنـە وێنەی نییە کە بۆ ئێمەی دروست کردبوو.

لە مانگی ٢ ی ١٩٨٢لە گوندی مێولاگە بووین، چوار ماڵی لێبوو بە ناوی حاجی محەمەد و مەحمودی برای، حاجی عەلی ئامۆزای لەگەڵ ماڵی مام سمایل کە مامەڵەی ولاغی دەکرد، ئەوکاتە باران زۆر دەباری مـاوەی نەدەدا کە لە گوندە دەربچین، نزیکەی چـوار رۆژ لـەوێ بـوویـن، دوای

ئەوەی کە باران خۆشی کرد لە کاتی خواحافیزی لە ماڵی مام سمایل بووم لەبری ئەوەی بڵێم خواحافیز وتم: سەلاموعەلەیکوم! چونکە ئەو چوار رۆژە هەر دەمانوت: سەلاموعەلەیکوم، بۆیە لێم تێکچوو، برادەران دەستیان کرد بە پێکەنین.

لە زستانی ١٩٨٢ لەگەڵ هێزێکی جود جەولەمان دەکرد، دابەزین بۆ ناوچەی دۆڵی جافایەتی کە یەکەمجار بوو برادەرانی پارتی لەگەڵمان بێن، چونکە نێوانی یەکێتی و پارتی باش نەبوو، برادەرانی یەکێتی ناوچەکەیان چۆڵ کرد بوو چووبوون بۆ شەڕی کونەمشکان لە ئێران، بەڵام چەند کەرتێکیان لە ناوچەکە بە جێهێشتبوو وەك ئاراسی حمەلاو و مستەفا سەرگەڵوویی. ئێمە وەك بەرەی جود لەگەڵ حسك و پارتی کۆبوونەوەمان بە گوندەکانی ئەو ناوچەیە دەکرد، لە کۆبوونەوەکاندا من لە بری حیزبی شیوعی قسەم دەکرد و قادر لە بری پارتی و عەبدوڵلا هەمزە لە بری حیزبی شۆسیالیست، کاك عەبدوڵلا لە بری نسکۆ ئاشبەتاڵی بەکارهێنا، برادەرانی پارتی نیگەران کرد بوو، هاتن بۆ لام وتیان: بەڵکو کاك عەبدوڵلا رازی بکەیت کە وشەی ئاشبەتاڵ بەکارنەهێنێت، دوای ئەوە کاك عەبدوڵلا لە بری ئاشبەتاڵ وشەی نسکۆی بەکارهێنا. نزیکەی ٢٥٠ پێشمەرگە دەبووین، لە پارتی قادر قادر و نادر هەورامی و فایەقە رەش، لە حسك قادر چاوشین و عەبدوڵلا هەمزە و صاڵحە سوور و عەبدوڵلا گەلاڵی، هەتا چووینە چوبلاغ و قەڵەم پاشا، کە گەڕاینەوە لە سەرگەڵو مستەفا سەرگەڵووییمان بینی هیچ خۆی تێکنەدا و بە منی وت: بۆچی بە برادەران ناڵێی با لای من میوان بن. وتم: بە چەند کەس؟ وتی: نزیکەی ١٠ کەس. لەگەڵ نادر هەورامی و فایەقە رەش و قادر قادر لە ماڵی مستەفا سەرگەڵوویی دەعوەتکراین کە

یه‌كێتیش بوو، ئێمه‌ش رێزێكی زۆرمان لێگرت، چونكه‌ كاك مسته‌فا خۆی پێشنیاری كردبوو كه‌ میوانداریمان بكات، ته‌نها كه‌رته‌كه‌ی مسته‌فا سه‌رگه‌ڵوویمان بینی و كه‌رته‌كه‌ی ئاراسی حمه‌لاو به‌ هیچ جۆرێ خۆیان ده‌رنه‌خست، دواتر هێزێكی زۆری یه‌كێتی دابه‌زییه‌ خواره‌وه‌ به‌ سه‌ركردایه‌تی مسته‌فا چاو ره‌ش و ئاوات عه‌بدولغه‌فور و عه‌لی بچكۆل، وه‌زعه‌كه‌ خراپ شێوا. ئێمه‌ كه‌ چووین براده‌رانی پارتی له‌ یه‌كێتی به‌شك بوون كه‌ به‌ نیازن لێیان بده‌ن، ئێمه‌ش وه‌فدێكمان نارد بۆ لای یه‌كێتی به‌ سه‌ركردایه‌تی مامۆستا سه‌ردار (صالّح حاجی قادر سورداشی) كه‌ مسته‌فا چاو ره‌شیان بینیبوو گه‌ڕانه‌وه‌ وتیان: براده‌رانی یه‌كێتی وتوویانه‌ ئێمه‌ له‌گه‌ڵ براده‌رانی حسك و حیزبی شیوعی هیچمان نییه‌، به‌ڵام پارتی رێگه‌ی له‌ ئێمه‌ گرتووه‌ بچینه‌ بادینان، ئێمه‌ش رێگایان پێناده‌ین له‌م ناوچه‌یه‌ بن و جه‌وله‌ بكه‌ن. له‌سه‌ر چوونی وه‌فده‌كه‌ كۆبوونه‌وه‌مان له‌ گوندی چالاوا كرد، به‌ براده‌رانی پارتیمان وت: براده‌رانی یه‌كێتی واده‌ڵێن ئیوه‌ ده‌ڵێن چی؟ براده‌رانی پارتی وتیان: ئه‌گه‌ر یه‌كێتی شه‌ڕمان له‌گه‌ڵدا بكات له‌سه‌رمان ناكه‌نه‌وه‌، ئێمه‌ و حسك وتمان: هه‌وڵ ده‌ده‌ین ئه‌و شه‌ڕه‌ نه‌بێت، نادر هه‌ورامی زانی كه‌ یه‌كێتی نیازیان خراپه‌ و شه‌ڕ ده‌بێت، گه‌ڕایه‌وه‌ بۆ ناوچه‌ی شاربازێر، به‌ڵام قادر قادر و سواره‌ فتاح و حاجی كه‌ركوكی و ئه‌حمه‌د فتحولآ مانه‌وه‌، وتمان: یه‌كێتی شه‌ڕتان له‌گه‌ڵ ده‌كات و ئێمه‌ش ئه‌و شه‌ڕه‌ ناكه‌یت و ئێوه‌ ده‌ڵێن چی؟ قادر قادر زۆری پێناخۆش بوو كه‌ شه‌ڕیان له‌سه‌ر ناكه‌ین وتیان: ته‌كبیر چییه‌، پێمانووتن: جارێكی تر ده‌چین له‌گه‌ڵ یه‌كێتی كۆده‌بینه‌وه‌، به‌ڵام ورده‌ ورده‌ هێزی یه‌كێتی جولآ بۆ خه‌مزه‌ و چۆخماخ بۆ ئه‌وه‌ی رێگایان لێبگرن. له‌گه‌ڵ یه‌كێتی و حسك له‌ گوندی مالومه‌ له‌

رێكه‌وتی ٦ / ١ / ١٩٨٣ كۆبووینه‌وه‌، له‌ یه‌كێتی عه‌لی بچكۆل و مام رۆسته‌م، له‌ حسك محه‌مه‌دی حاجی مه‌حمود و عه‌بدوڵڵا همزه‌، له‌ ئێمه‌ش من، له‌وێ بڕیارماندا به‌ هێزی هاوبه‌ش پارتی بپه‌ڕێنینه‌وه‌ بۆ ئه‌وبه‌ر، بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كێتی لێیان نه‌دات، پارتیمان په‌ڕانه‌وه‌ بۆ سیته‌ك بێ شه‌ڕ، خۆشبه‌ختانه‌ نه‌مانهێشت له‌ ناوچه‌ی دۆڵێ شه‌ڕ رووبدات، به‌ڵام كه‌ گه‌یشتنه‌ سیته‌ك له‌ گۆڕه‌دێم و چاڵه‌خه‌زێنه‌ ئه‌م شه‌ڕه‌ روویدا، بێ ئاگاداری ئێمه‌ شه‌ڕیان له‌گه‌ڵ یه‌كێتی كرد بوو. دواتر له‌گه‌ڵ یه‌كێتی كۆبووینه‌وه‌ بۆ ئه‌وه‌ی یه‌كێتی ئازاری كه‌سوكاری پارتییه‌كان نه‌دات له‌و ناوچه‌یه‌. عه‌لی بچكۆل وتی: كاك صاڵح ئه‌وانه‌ی تۆ ده‌یڵێیت ئێستا له‌گه‌ڵ ئێمه‌ پێشمه‌رگه‌ن، منیش سه‌رم سوڕما كه‌ چۆن وا زوو خه‌باتیان گواستەوه‌ ! ؟ دوای ئه‌م شه‌ڕه‌ شه‌ڕی پشت ئاشان روویدا.

ئێمه‌ و حیزبی سۆشیالیست له‌ ناوچه‌ی دۆڵێ ماینه‌وه‌، كه‌ پێشتر هه‌ردوولا چالاكی هاوبه‌شمان كردبوو له‌سه‌ر پردی تابین، له‌و چالاكییه‌دا له‌ حسك عه‌بدوڵڵا همزه‌ و صاڵحه‌سوور و قادر چاوشین، له‌ ئێمه‌ش هاورێ عه‌تا و ئه‌بو ره‌زا و شه‌هید یاسین، ئیفایه‌كی عه‌سكه‌ری و جێبێكیان سووتاندبوو ده‌ستیان گرتبوو به‌سه‌ر ته‌قه‌مه‌نییه‌كانیاندا، چه‌ند سه‌ربازێكیان به‌ دیل گرتبوو، تا ئێواره‌ شه‌ڕ بوو هێز له‌ دوكان و سووڕداشه‌وه‌ هاتبوو بۆ سه‌ر پردی تابین، براده‌رانی ئێمه‌ ببون به‌ دوو به‌شه‌وه‌، به‌شێكیان له‌ پرده‌كه‌وه‌ بۆ دولكان پاشه‌كشه‌یان كرد بوو بۆ سه‌ر چه‌می زه‌رزی، به‌شه‌كه‌ی تر بۆ حاجیتان چوون، دواتر له‌ هه‌ردوو به‌شه‌كه‌ شه‌و یه‌كیان گرتبووه‌وه‌، خۆشبه‌ختانه‌ هێزه‌كه‌ی ئێمه‌ و سوشیالیست بێ زیان بوون. دواتر گه‌ڕانه‌وه‌ بۆ قه‌ره‌چه‌تان و زێوێ و له‌وێوه‌ بۆ مێرگه‌پان، له‌وێ سه‌ربازه‌كانیان به‌ره‌ڵا كردبوو، چه‌ك و

تەقەمەنییەكانیان دابەشكرد بوو، بێتەلێكی ١٠٥ یان لە جێبەكە كردبووەوە بۆمان دابەشنەكرا، حمەی حاجی مەحمود وتی: كاك صالّح من بێتەلێكی ١٠٥ ترم لایە ئەتوانم سوودی لێوەربگرم بیدەن بە من، منیش پێمخۆش بوو ویستم بیدەمێ، برادەرانی خۆمان زۆریان پێناخۆش بوو كردیان بە هەرا بە تایبەتی شەهید یاسین وتیان: ئێمە دەستمانخستە خوێنی خۆمان و لە جێبەكەمان گرتۆتەوە تۆ بۆ دەیدەیت بە ئەوان و دەیكەیت بە پیاوەتی! ؟ منیش پەشیمان بوومەوە بێتەلەكەم نەدا بە محەمەدی حاجی مەحمود، بەڵام زۆرم پێناخۆش بوو، ماوەی چەند رۆژێك محەمەدی حاجی مەحمود گەڕایەوە بۆ بەری شاربازێر و ئێمەش لە ناوچەی دۆڵێ ماینەوە، ئەو ساڵە بەفرێكی زۆر باری، دواتر ئێمەش پەڕیینەوە بۆ بەری حاجی مامەند و ماوەیەك لەوناوە جەولەمان كرد، گەڕاینەوە بۆ ناوچەی دۆڵێ و بەشێك لە لقەكەمان گەڕایەوە بۆ دولكان و منیش لە دۆڵێ مامەوە و نەگەڕامەوە، ئەو زستانە ماڵم لە گوندی مالومە بوو تا بەهاری ١٩٨٢.

لە بەهاری ١٩٨٢ لە مالومە بووم، كاتێك هێزەكەی حیزب گەڕایەوە بۆ ناوچەكە بە سەركردایەتی مەلا عەلی و نەسرەدین هەورامی، چووین بۆ سیتەك لەوێوە بۆ ناوچەی قەرەداغ، كە گەیشتینە ئەوێ هێزەكانمان دابەشكرد، من و حەمەڕەشید قەرەداغی بۆ ناوچەی قەرەداغ و قادر فارس و ئەسكەندەر بۆ دەربەندیخان و تۆفیقی حاجی و فتاح گەلاڵی بۆ ناوچەی شارەزوور، هێزەكەی ئێمە چەند چالاكییەكی كرد لە باوەسەید و زی هۆمەر، تۆفیق فتح الله بە سووكی بریندار بوو، ماوەیەكی زۆر جەولەمان كرد، دواتر بووین بە دوو بەشەوە، بەشێكمان گەڕایەوە بۆ سەركردایەتی، بەشەكەی ترمان بە سەركردایەتی حەمەڕەشید قەرەداغی

لە ناوچەی قەرەداغ و گەرمیانماینەوە. من گەڕامەوە بۆ ناوچەی دۆڵێ و مەلا عەلی و نەسرەدین هەورامی گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی، لەو کاتەدا برادەرانی ئێمە و یەکێتی لە ماولیان تووشی کێشە ببوون، برادەرانی ئێمە عەلی کلاشینکۆف لێپرسراویان بوو لە گوندی وەرتێ لە یەکیان دابوو، لەوکاتەدا ئێمە لە ناوچەی گورگەیەر و بزەینان بووین، هەواڵیان بۆ هێنام کە نێوانی ئێمە و یەکێتی باش نییە، وریای خۆتان بن! هەر ئەو ڕۆژە هێزەکەم کۆکردەوە بەرەو مووبرە و مامەخەلان کەوتمەڕێ، بەکری حاجی سەفەر و مام ڕۆستەم بەدووام کەوتبوون، لە لای دوکانێك لە مامەخەلان من و مەحمود دیکتارۆف لەگەڵ ئەوان یەکمان بینی و ساردیمان بۆ کڕین، کاك بەکر وتی: ئێوە نیازی چیتان هەیە؟ ئێمەش زانیمان دەڵێت چی، خۆمان لێکرد بە کەڕەی شەربەت کە گوایە ئاگامان لەو شەڕە نییە، دوای گفتوگۆیەکی زۆر برادەران بەرەو ناو مامەخەلان بەڕێکەوتن و کاك بەکر وتی: با ئاگامان لەیەك بێت و ئێمە دەچین بۆ چنگیان، ئێمەش وتمان: لە دەوری مووبرە و مامەخەلان دەمێنینەوە، بەڵام بۆ شەو ئێمە پەڕیینەوە بۆ کورەداوێ، بۆ بەیانی گەیشتینە بێژوێ، برادەرانی یەکێتی بەیانی گەڕابوونەوە بۆ مامەخەلان و هەواڵ ئێمەیان پرسیبوو، وتبوویان: شەو لێرە بوون بەڵام دیار نەماون! دیار بوو برادەرانی یەکێتی بۆ چەککردنی ئێمە هاتبوون، ئەو پلانە لامان روون بوو، بەڵام ویستمان ناکۆکییەکە زیاتر قووڵ نەبێت، بۆیە زوو ناوچەکەمان جێهێشت بێ کێشە، خۆمان گەیاندە ئێران لە گوندی بێژوێ، دوای ماوەیەك لەو کێشمە و کێشە، لە سەرکردایەتی حیزبی شیوعی و یەکێتی نیشتمانی ڕێککەوتن، حیزب عەلی کلاشینکۆفی لەو ناوچەیە دوورخستەوە و گەڕانیانەوە بۆ ناوچەی شارەزوور و هەڵەبجە.

لە گوندی ولاغلو ماڵی حاجی عەبدوڵلا و كوڕەكانی و ماڵی كاك محەمەدی لێبوو، جارێك خزمێكی كاك مەحمود لای یەكێتی گیرا بوو، هات بۆ لام منیش بردم بۆ سەركردایەتی بۆ لای هاوڕێ عەزیز محەمەد، هاوڕێ عەزیز نامەیەكی بۆ بەڕێز مام جلال نووسی، بەو نامەیە خزمەكەی كاك مەحمودیان ئازاد كرد، دوای ئەوە ئەو ماڵە بوون بە دۆستێكی باشی ئێمە. كاتێك بارەگامان لە گوندی بێتووش بوو، ئەوان ولاغیان هەبوو كاری كاروانچێتییان دەكرد، بە ئازوقە و شتومەك یارمەتی زۆریان دەداین و بۆیاندەهێناین بۆ بێتووش، ئەو پێشمەرگانەی كە ژنەكانیان بهاتایەتەدەرەوە دەچوونە ماڵی ئەوان و لەوێ ئەوان هاوكارییان دەكردن بۆ بەڕێكردنیان بۆ گوندی بێتووش، وەكو خێزانی مەلا عەلی و مامۆستا خالید، خوشكی مامۆستا جەمال. ئەو ماڵە دەیانووت: كە هاتیتە ئەم گوندە سەردانمان نەكەیت لێت زوویر دەبین. زۆر بەوەفابوون، دواتر بۆ خۆشی دەیانووت: تۆ چەند خوشكت هەیە؟ منیش دەمووت: هەرچی ئافرەتی حیزبە هەموویان خوشكی منن. وتیان: هەر كەسێك دێت بۆ ئێرە دەڵێت: من خۆشكی حەمە صالح قەرەچەتانیم، ئێمەش بە رێزەوە رەوانەیان دەكەین. منیش سوپاسم دەكردن.

لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢ پێش شەڕی پشتئاشان بارەگایەكی پارتیزانیمان لە گوندە چۆڵەكەی گەورەدێ دانابوو بۆ حەسانەوەی خۆمان، كە پێخەفمان لە بێتووشەوە بۆ هێنابوو. خواردنمان لە گەڕەدێوە دەهێنا، ئەم بارەگایە بۆ ئەوە بوو كە نەچینە سەرەوە بۆ ئەوەی لەوێ جلوبەرگ بشۆین. لە سلێمانییەوە ساج و تەنوورمان بۆ هاتبوو، نزیكەی ٦ مانگ لەوێ بووین، كە سەرما هات گواستمانەوە بۆ مالومە، كە ماڵی خۆشم لەوێ بوو، لە مالومە چووینە مەكتەبەكە، چونكە

مامۆستا رەمزی کە مامۆستای مەکتەبەکە بوو ژوورێکی مەکتەبەکەی بۆ چۆڵکردبووین و دۆستی شیوعییەکان بوو. بە گشتی دانیشتوانی گوندی مالومە باشبوون. دوای شەڕی پشتئاشان چووینە حاجی مامەند و باراو و کانی دڕکە، لە مالومە جەمالی مام هەمزە بەدیار شتەکانەوە بوو، برادەرانی یەکێتی هاتبوون کەلوپەلەکانیان بردبوو، جەمالیشیان گرتبوو بە دیل بردبوویان بۆ سەرگەڵو، باش چەند رۆژێك مامۆستا ئەنوەر نامیق هەوڵی بۆ دابوو لای عەلی بچکۆل ئازادیان کردبوو، هاتەوە بۆ حاجی مامەند بۆ لامان.

لە هاوینی ١٩٨٢ لای شاخی پیر بابیز بووین، شەهید حەمە سیروانمان لەگەڵ بوو کە بە حمەخدر ناسراو بوو، لەناو هاوڕێکانی زۆر خوشەویست بوو، جێگری هاوڕێ عەتا بوو، کاتێك حەیوانمان سەربڕییایە ئەو ناوسك و لەبەکەی بۆ دەکردین بە کەباب، لەبەر ئەوەی پێشمەرگە لە کەباب خواردن دوور بوو، هەر پێشمەرگەیەك چوار کەبابی بەردەکەوت، لەگەڵ هاوڕێ عەتا هەر بۆڵەبۆڵی بوو کە بۆچی ناچن رەبایە بگرن! هاوڕێ عەتا پێیدەووت: ئێمە ژمارەمان کەمە ناتوانین رەبایە بگرین. هاوڕێ عەتاش هەوڵی دەدا لە سنووری دۆڵێ چالاکی باش بکات، تا جارێك پاش چاودێرییەکی زۆر ویستیان بچن ئەو جوندییانە بگرن کە دەچوون بۆ ئاو هێنان لە کانییەکەی پیر بابیز یان بیانکوژن، بەڵام بەداخەوە پێشئەوەی بچن سوپای رژێم پێی زانیبوون، شەو چووبوونە ئەوێ، بۆ بەیانی لەگەڵ دنیا رووناك ببووەوە هێزێکی زۆری رژێم هاتبوونە سەر پەلەکەی هاوڕێ عەتا و کەوتنە شەڕەوە، شەڕێکی گەورە و سێ شەهیدمان لە دەستچوو، بە ناوی شەهید حەمە سیروان و شە هید سەلام کە خەڵکی بغداد بوو لەگەڵ شەهید مەولودی عەبە هەورامی

ناسرابوو بە هیوا هەورامی، ئەم سێ هاوڕێیە نموونەی ئەدەب بوون لە ناو هاوڕێکانیاندا، لەوکاتەدا من و مامۆستا خالید و مامۆستا جەمال لە گوندی قزلەر بووین کە هەواڵیان بۆ هێناین گوایە حیزبی شیوعی هەموویان شەهید بوون، زۆرم پێناخۆش بوو، بە پەلە گەڕاینەوە ئەوان هاتبوونە قووڵەچاغ، لەوێ یەکمان بینی و دواتر چووینە گوندی گەڕەدێ، بەڵام بەداخەوە تەرمی پیرۆزیان بەردەستی رژێم کەوت و بردبوویان بۆ چوارتا.

لە ساڵی ١٩٨٢ مەفرەزەیەك بووین ١٠ کەس دەبووین، چووین بۆ بەری قازان، لای خڕی زێوێ لە لێواری جادەکە بووین، لەوکاتەدا بوو کە جێبێك و ئیفایەك دەگەڕایەوە بۆ سەربازگەی سووسێ، لە پڕ سەیارەیەك هات لایدا و چاوی بە ئێمە کەوت، خەریك بوو بڕوات ئێمەش لەبەر ئەوەی نەڕوات و بچێت هەواڵمان لێبدات، بە هیوام وت: بچۆ دایگرە، چوو بە قسەی هیوا دانەبەزی بوو، وتم: مامۆستا جەمال تۆ بچۆ بیهێنە. ئەویش هات وتی: دانابەزێت! ناچار خۆم چووم وتم: بۆ دانابەزی؟! وتی: ئێوە چیتان لە من دەوێت؟ قۆناخیکی چەکەکەم دا بە پەنچەرەی سەیارەکەدا و شکاندم، کە دابەزی قۆناخێکی ترم کێشا بە سەریدا و سەریم شکاند. کابرا وتی: مەکە بە قوربانت بم بۆ کوێ دەڵێیت دێم. هیوا وتی: ئاوها دەبێت پێووتن! من بنێشتم وا لە دەمایە چۆن بە قسەی من دائەبەزی! ؟ دوایی ئەوە زانیمان پیاوخراپ نییە جێمانهێشت و بەرەو گوندی چەرمەگا چووین، بۆ ئێوارە نانمان لە دوو ماڵ خوارد، هەردوو ماڵەکە خزمی خۆم بوون، دوایی حاجی ئەحمەد سەیارەی هەبوو ئێمەی برد بۆ بەری قازان و وتی: بەیانی دەچم هەواڵ دەبەم بۆ ئەمن لەبەر ئەوەی ناودێ پیاوی سەر بە ئەمنی تێدایە، وتمان: برۆ هەواڵ بەرە، بەڵام ناوی

کەس مەهێنە. وتی: باشە، بەیانی کە چووبوو ئەمن زانیاری تەواوی لابوو. ئەو دوو ماڵەی کە نانمان لێخواردبوو لە ئەمن بانگکرابوون و ئازاری زۆریان دابوون، بەڵام ئەوان ناوی کەسیان نەهێنابوو هەر وتبوویان: هاتوون نانیانخواردووە و ڕۆیشتوون و نازانین بۆ کوێ ڕۆیشتوون. ئێمە چووینە گولیجە لەوێ خزمی خۆم هات بۆ ئێوارە چووینە ماڵی کەریم زینەت کە براهیمی کوڕی هاتبوو بە شوێنماندا، شەو لەوێ ماینەوە بۆ بەیانی چووین بۆ شیلەخان و ئێوارە چووین بۆ سووسە کۆن کە ئامۆزاکانی خۆم لەوێ بوون، شەو ئەوان پاسەوانیان بۆ دەکردین. لە ئامۆزاکانم کە ماڵیان لەوێ بوو: ماڵی حسەین سۆیلە و عەلی سۆیلە و مام حەمەڕەشید. ئەو شەوە باوکم لەوێ بوو تا نیوەشەو لەوێ بووین، دواتر چووین بەرەو یاران بەگی کە لە نزیك قەڵای سووسێ بوو. باوکم لە دائیرەی ئەمن کە بانگ دەکرا زۆر دەترسا دەیووت: من ژنی ترم هێناوە و وازم لەوان هێناوە ! نەك باوکم، بەڵکو زۆربەی خزمەکانم لەبەر بوونی من بە پێشمەرگە نەیاندەوێرا خۆیان لە ناوی من نزیك بکەنەوە، تەنانەت سەردانی منداڵەکانیشم نەدەکرا، چونکە ڕژێم زۆر دڕندە بوو بۆ کەسوکاری پێشمەرگە. هەر خزمێك زۆر لێبووردە نەبووایە هاموشۆی منداڵەکانمی نەدەکرد.

لە یاران بەگی سەیارەیەکمان گرت و پەڕینەوە بۆ گوندی قەرەچەتان، شەو لە ماڵی کاك باڵوڵی ئامۆزام نانمانخوارد و چووین بۆ شاخی پیرەمەگرون، لەو جەولەیەدا برادەران زۆر ئاسوودە بوون جگە لە بێکەس، کە هەر بۆڵەبۆڵی بوو، چونکە بەو گوندانەدا جەولەمان دەکرد کە نزیکی سەربازگە و ڕەبایەکانی ڕژێم بوون، ئەم جەولانەی کە دەمانکرد پارتیزانانە بوو کە مەفرەزەیەکی ١٠-١٢ کەسی بەو جۆرە جەولە بکات.

لە ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ مامۆستا جەمال چووینە ماڵێك بۆ نانخواردن، زۆر دانیشتین کەس نەهات بە لامانەوە، خەریك بوو بڕۆین خاوەن ماڵەکە هات، بەڵام دیار بوو پێشتر لەگەڵ خێزانەکەی بە شەڕ هاتبوو زۆر تووڕە بوو، کە چاوی بە ئێمە کەوت هیچ بە خێرهاتنی نەکردین، پیاوەکە بە تووڕەییەوە بە ژنەکەی وت: ژنەکە دوو بڕ دار بێنە بیخەرە زۆپاکەوە. ژنەکەش بە تووڕەییەوە وتی: خۆت داوەشاوی بۆچی ناچی بیهێنیت!؟ منیش زانیم کە شەڕیان بووە بە ژنەکەم وت: لێیببوورە ئەگینا بە لەقەوە دەچمە سەر ورگی! پیاوەکە دەستی بە پێکەنین کرد و ژنەکەش واقی وڕما و تووڕەییەکەی نەما. پاش ئامادەکردنی نان، نانمانخوارد، بە ژنەکەم وتەوە: ئێستا لێیدەبوری یان نا؟ ئەگەر لێی نابووری بە لەقەوە جارێکی تر دەچمەوە سەر ورگی! ژنەکە وتی: بە خوا پیاوێکی قسەخۆشی، وەڵا نیازم نەبوو نانتان بۆ ئامادە بکەم، بەڵام لەبەر خاتری جەنابتان لێیخۆش دەبم و قسە ناکەم، پاشان بە ڕێزەوە خواحافیزییان لێکردین.

لە ساڵی ١٩٨٢ لە گوندی گورگەیەر لەگەڵ مامۆستا جەمال دامەزراین بۆ نانخواردن، کەس نەهات بەلامانەوە، دوای دانیشتنێکی زۆر وتم: با بڕۆین، دوای یەك کاتژمێر ئافرەتێك هات نە قسەی کرد و نە بەخێرهاتنی کردین، قاپێ شلەی ساردی بۆ دانایین لەگەڵ یەك نان بۆ هەردووکمان، زۆر تووڕەبووم لەوەی کە ئێمە خەبات دەکەین لە پێناوی رزگاری ئەوان لە چەوسانەوە، بەڵام ئەوان بەوجۆرە لەگەڵمان هەڵسوکەوت دەکەن! ئەوەندە تووڕەبووم لە تووڕەییدا جامانەکەم لەبیرچوو، لە مزگەوتی گوندەکە مامۆستا وتی: دەچم جامانەکەت بۆ دەهێنمەوە. وتم: بە خوا ناچیت، چووم بۆ دوکانێك لە گوندەکە جامانەیەکی ترم کڕی و ڕۆیشتین.

لە هاوینی ١٩٨٢ لەگەڵ جووتیاری ئامۆزام چووینە ماڵی عەبدوڵڵا وەسمان لە گوندی مالومە، دایکی کاك عەبدوڵڵا خزمی خۆمان بوو، ناوی پورە ئامینە بوو، پێمانوت: پورێ تۆ مەلاییت یان جەلالی؟ ئەویش دەیوت: نە جەلالیم نە مەلاییم ئەڵقەڕێزی دوو لاییم! یان دەیووت: من محەمەد مستەفاییم! ئەو ماڵە خزمەتێکی زۆر باشیان کردووم، ساڵێك بە ماڵەوە لەوێ بووم، هەر ئەو ساڵە حەمە سعید حەسەن فێرار بوو لەوێ بوو، من و کاك حەمە سعید یارمەتی زۆری کاك عەبدوڵلامان دەدا لە کاری جووتیاری و گێرەکردن. بەو جۆرە پوورە ئامین قسەی خۆشی بۆ دەکردین، بە داخەوە قاچێکی شەل بوو لەگەڵ براکەی لە شەڕی عەشایەری قاچی شەل ببوو. کاتێك خوێندنگە کرایەوە پاییز بوو منداڵەکانم دەناردەوە بۆ سلێمانی مەکینەم بۆ ئامادەکردبوون، صالحی کوڕم زۆر هۆگرم ببوو ئارەزووی دەکرد لەگەڵ من بمێنێتەوە، کاتێك سواری مەکینەکەم کردن لە پڕ لە مەکینەکە دابەزی و دەستی بە گریان کرد، بەڵام چۆن گریانێك! هەموو گوندەکە لە ماڵی خۆیانەوە هاتن بزانن ئەو گریانە چییە و چی بووە!؟ بە من و ئەو پێشمەرگانەی لەگەڵم بوون و بە دایکی و خەڵکی گوندەکە تا ژیرمان کردەوە نزیکەی کاتژمێرێکی پێچوو. دواتر ئەوانم بەڕێکرد بۆ سلێمانی و ئێمەش بەڕێکەوتین بۆ گوندی چۆخماغ. تا یەك هەفتە ماتی ئەو گریانەی صالح بەری نەدەدام، برادەران دەیانوت: بۆچی پەستی؟ منیش دەمووت: کوا پەست نیم! برا بۆچی پەستم!!.. دەمویست بیشارمەوە!؟!

لە پاییزی ساڵی ١٩٨٢ مەفرەزەیەکی ٧ کەسی بووین چووین بۆ مێرگەپان، لە ماڵی کاك عوسمان مەولود ماینەوە کە هەر خۆیی و ژن و منداڵەکانی لەوێ بوون بە تاك ماڵە، ئەو ماڵە لە مێرگەپان و

سوورقاوشان بە نانبدەیی بە ناوبانگ بوون، لەبەر ئەوەی هەر ماڵی ئەوان لەوێ بوو، هەر ٧ نەفەرەکە لەوێ نانمانخوارد، زستانی ئەو ساڵە بەفرێکی زۆر باریبوو هیچ پەیوەنییەکیان بە شەدەڵە و قزلەرەوە نەمابوو، خەڵکی قزلەر چووبوون بە هانایانەوە و منداڵەکانیان هێنابووەوە قزلەر. دواتر بۆ شەو چووین بۆ شەدەڵە کە سەربازگەی رژێمی لێبوو، لەوێ چووینە ماڵی پووره زبێ و لەوێ نانمانخوارد، لە نیوەی شەو بەڕێکەوتین بەرەو حاجیتان، لەوێ عەبدولڕەحمان حاجی عەزیزم بینی کە برادەری خۆم بوو، باوکی دکتۆر شەهاب بوو زۆر لێم نزیك دەبووەوە، نەمزانی بۆچی!؟ کە رۆی دەستم کرد بە گیرفانی قەمصەڵەکەمدا دوو ٢٥ دیناری تێدا بوو!؟ دەیزانی من پارە وەرناگرم بەوشێوەیە پارەی دابوو پێم! دواتر لە حاجیتانەوە چووین بۆ سابووراوا، ئەو ناوچەیە هەمووی رەبایە و سەربازگە بوو، لە سابووراواش پیکابێکمان دەرکرد بردمان بۆ سووسێی ئاڵەمەرە، کە گەیشتین بەیانی زوو بوو، چووینە ماڵی مەلا عەبدوڵڵا کە برادەری خۆم بوو پێیوتم: حەمەکەریم بەم بەیانییە زووە چی هێناوتی بۆ ئێرە!؟ چونکە سووسێ بە سەربازگە بەناوبانگ بوو، بارەگای لیوای لێبوو. بە پەلەپەل نانی بەیانیمان خوارد و بەرەو بیران بەڕێکەوتین، لەوێ دوو رۆژ پشوومان دا، چونکە جێگایەکی لەبار و سەخت بوو، ماڵەکانیش هەموویان ناسیاو بوون، زۆر خزمەتیان کردین بە تایبەتی ماڵی رەئوف حاجی رەشید نادر کە برادەرم بوو، ماڵی باوکی و براکانی لە سلێمانی دراوسێمان بوون، دواتر بەرەو قەرەچەتان بەڕێکەوتین، ئەو مەفرەزەیە بە راستی پارتیزانی بوو، چونکە بە ژمارە کەم بووین.

لە زستانی ١٩٨٢ چووینە چەمی رەزان، چواری ماڵی لێبوو بە كوڕانی مەولە بە ناوبانگ بوون لە خێڵی جافە رەشكە بوون، ئێمە نزیكەی ٦٠ پێشمەرگە دەبووین لەو چوار ماڵە دامەزراین و خزمەتێكی باشیان كردین، ئەم بنەماڵانە بە گوندەكانی حاجیتان و سووسێ و كەلەباش بڵاوەیان كردبوو، زۆر خزمەتی پێشمەرگەیان دەكرد و شۆڕشگێر بوون، جێگای سوپاسە، لەم بنەماڵەیە ئەولا جاف هەبوو لە شۆڕشی ئەیلولدا ناوبانگی ئازایەتی هەبووە و برازاكەی ناوی حەیدەر بوو كە بەڕێوەبەری ئاسایشی رانیە بوو، پێشمەرگەیەكی ئازا بوو، ئەو بنەماڵە تێكۆشەرە هەموویان بەر شاڵاوی ئەنفال كەوتن، تەنها كوڕی صادق ماوە لە مێرگەپان كاری خۆی دەكات، بەداخەوە نایناسم، ئەم بنەماڵەیە خزمەتی گشت لایەنە سیاسییەكانیان كردووە بێ جیاوازی.

لە زستانی ساڵی ١٩٨٢ لە بناری شارەزوور بووین لە گوندی كۆرەی سەروو، كاتی ئێوارە بوو مەلا عەلی وتی: با بچین بۆ ماڵی جەزای حەمە تالیب خوالێیخۆش بێت سەرۆكی عەشیرەتی میكایلی بوو لە گوندی نەمەڵ، لەبەرئەوەی خزمی نزیكی نەسرەدین و مەلا عەلی بوو، شەو چووینە ماڵی، لەلایەن خۆی و عەلی و حاجی لەتیفی برای پێشوازییەكی گەرم كراین و تا بەیانی لەوێ بووین، كە تەنها من و مەلا عەلی و نسردین بووین، بەیانی بە تراكتۆر بەڕێیكردینەوە بۆ كۆرە.

لە كۆتایی ساڵی ١٩٨٢ تەشكیلاتی تازە كرا، سەركردایەتی سلێمانی و كەركوك كرا بە سێ بەتالیۆن و فراوانكرا و سێ ئەندامی تریان بۆ زیاد كرد بۆ سەركردایەتی سلێمانی و كەركوك، كە بریتی بوون لە: بەهادین و نوری و مەلا عەلی و ئەبو تارا و ئەبو سیروان و سەید تۆفیق و چەند مولازمێكی سەربازی كە خولی سەربازییان لە وڵاتی یەمەن تەواو

كرد بوو، پاش گەڕانەوەیان بەسەر بەتالیۆنەكاندا دابەشكران. مولازم كەرەم كرا بە جێگری نسرەدین هەورامی، دەبوایە من بكرامایە بە جێگری لەبەر ئەوەی سەرلقی مەیدانی بووم. مەلا عەلی هاتە خوارەوە لەگەڵ زیاتر لە ١٠٠ كەس چەند هێسترێكیان پێبوو دەچوون بۆ قەرەداغ، ئاگادار كرام لە گوندی گاپیلۆێن چاوەڕێیان بكەم، دوای چاوپێكەوتن هاتینە گوندی چۆخماخ، لەوێوە بەرەو سیتەك بەڕێكەوتین چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە، دواتر پەڕینەوە بۆ قەرەداغ، لەوێ هەموو هێزەكەی لێبوو بە سەركردایەتی ئەبو سلام. بەتالیۆنەكانیش بەمشێوەیە بوون:

بەتالیۆنی سلێمانی نەسرەدین هەورامی لێپرسراوی بوو، مولازم كەرەم جێگری بوو، لقی سلێمانی عومەر حامید لێپرسراوی بوو، لقی چەمی رەزان جوامێر لێپرسراوی بوو، لقی بناری كۆسرەت عەلی حاجی نادر لێپرسراوی بوو. كارگێری بەتالیۆن مامۆستا سەردار بوو، مامۆستا خالید لێپرسراوی سیاسی بوو.

بەتالیۆنی قەرەداغ كە حەمەڕەشید قەرەداغی لێپرسراوی بوو، مولازم سامی جێگری بوو، لقی بناری شارەزوور مەجید دوكانی لێپرسراوی بوو، لقی قەرەداغ ئەسكەندەر لێپرسراوی بوو، لقی دەربەندیخان قادر فارس لێپرسراوی بوو.

بەتالیۆنی هەورامان و هەڵەبجە عەلی كلاشینكۆف لێپرسراوی بوو، جێگرەكەی تۆفیقی حاجی بوو، لقی هەڵەبجە عەبدوڵڵای مامە لێپرسراوی بوو، لقی شارەزوور فەتاح گەلاڵی لێپرسراوی بوو، لقی هەورامان ئەحمەد فەقێ لێپرسراوی بوو، كەریمی حاجی لێپرسراوی كارگێڕی بەتالیۆن بوو، مامۆستا شاهۆ كە ئێستا دكتۆر قادری كۆلێجی كشتوكاڵە لێپرسراوی سیاسی بوو.

هێز دابەشکرا بەشێك بۆ قەرەداغ بەشێکی تر بۆ جادەی خوار دەربەندیخان، چەند رۆژێك لە ماڵی مامەدینە لە بەلەکجار کۆبوونەوە لە نێوان لێپرسراوە سەربازییەکان کرا، بەڵام دیار بوو نەگەیشتبوونە ئەنجام و بڕیاری کۆتایی. لەوکاتەدا لەگەڵ حمە رەشید قەرەداغی چووینەسەر رەبایەکانی لای ئیمام قادر، کە جێبێك و ئیفایەك ئازوقەیان دەبرد بۆ رەبایەکان، لەسەر پردەکەی لای ئیمام سعید لێیاندا و تۆفیق فتح الله بە سووکی بریندار بوو، چالاکییەکە سەرکەوتوو نەبوو، گەڕاینەوە بۆ ئەستێڵ چەند رۆژێك لەوێ بووین و دواتر گەڕاینەوە بۆ بەلەکجاڕ.

لە زستانی ١٩٨٣ لە گوندی مالوومە بووین، برادەران کۆمەڵێك هێلکەیان کڕیبوو، چووبوونە بەردەم زۆپاکە، لەبەر زۆپاکە ئاگردانی هەبوو پڕ ببوو لە ژیلەمۆ و پشکۆ، لەناو ژیلەمۆکە چاڵیان کردبوو پڕیان کردبوو لە هێلکە، هێلکەکان کە گەرم ببوون هەموویان پێکەوە تەقیبوون و پشکۆکان بە ناو مزگەوتەکەدا بڵاوبووبووەوە، ئێمە لە دەرەوە کە گوێمان لە دەنگەکەی بوو زانیمان هێلکەکانە، بەڵام خەڵکی گوندەکە بە پێ خاوسی رایانکرد بوو بۆ دەرەوەی مزگەوتەکە، بە خەڵکی دەرەوەی مزگەوتەکەیان دەووت: ئەم شیوعیانە مزگەوتەکەیان تەقانەوە بە تی ئێن تی! بۆیە رامانکرد!؟ دواتر دەستمانکرد بە پێکەنین کاتێك خەڵکی گوندەکەش تێگەیشتن کە تی ئێن تی نییە و هێلکەیە دەستیانکرد بە پێکەنین.

لە بەهاری ١٩٨٣ پێش چەند رۆژێك لە شەڕی پشتئاشان نامەیەکمان بە هاوڕێ عەتادا نارد بۆ ئەبو سەلام لە سەرکردایەتی لە پشتئاشان، لە حاجی مامەندە بووین، چونکە زۆر پێویستیمان بە پارە هەبوو، هاوڕێ عەتا کەوتەڕێ تا نۆکان، شەو لای لقی هاوڕێ سلیمەسوور

مابووەوە لە بناری قەندیل، دواتر چووبوو بۆ سەركردایەتی لە پشتئاشان، لەوێ پارە و نامەی هێنابووەوە و گەڕایەوە، دواتر شەڕی پشتئاشان دروست بوو، لە حاجی مامەند ئەبو سەلام و مەلا عەلی كەوتنە گفتوگۆ لەگەڵ مەڵبەندی یەكێتی كە مەلا بەختیار لێپرسراوی بوو، هەردوولا گەیشتنە بڕیارێك كە ئێمە خۆمان و كۆڵەپشتەكانمان بەرەو قەرەداغ بڕۆین، ئێمەش هێزەكانمان كۆكردەوە كە ٢٠٠ پێشمەرگە دەبووین، من و مەحمود دیكتارۆف كراین بە سەرپەرشتیاری ئەو هێزە و بەرەو قەرەداغ كەوتینەڕێ، و چەكە قورسەكانمان تەسلیمی مەڵبەندی یەكێتی كرد. كە چووینە قەرەداغ مەفرەزەیەكی ئێمە لەگەڵ تیپێكی یەكێتی لە گوندی دێوانە لە یەكیان دابوو، لەو شەڕەدا نەجمی كوڕی مەلا ئەسعەدی برای مەلا ئەحمەد بانی خێلآنی شەهید ببوو، حمە سعیدی برای حەمەڕەشید قەرەداغی و كامەرانی كوڕی عەلە رەش بریندار ببوون، هەروەها رەئوفی حاجی محەمەد بە سووكی باڵی بریندار ببوو، ئێمە چەند رۆژێك لە قەرەداغ ماینەوە، دواتر لە گوندی دێوانە كۆبوونەوەمان لەگەڵ مەڵبەندی یەكێتی كرد، بڕیاردرا كە یەكێتی ناوچەی شارەزوور چۆڵ بكات و ئێمە بچینە ئەوێ، ئێمەش ناوچەی قەرەداغ چۆڵ بكەین بۆ ئەوان. ئەم بڕیارە زۆر گرنگ و لەباربوو بۆ ئەو سەردەمە كە خوێنی زۆر لە نێوان هەردوو لادا نەڕژێت. كەریم ئەحمەد لە شەڕی پشت ئاشان گیرا و بە گیراوی نامەی بۆ مام جەلال نووسی بوو كە شەڕ رابگیرێت.

بە داخەوە سەركردایەتی حیزب ئەو رێكەوتنەی نێوان ئێمە و یەكێتی بە رێكەوتنی كامدێفت لە قەڵەم دا و ئێمەی بە خیانەتكار ناساند، بەڵام لای ئێمە رێكەوتنێكی شۆڕشگێڕانە بوو كە نەمانهێشت

کورد بە کورد بە کوشت بچێت. داهاتوو سەلماندی کە ئێمە راستین نەك سەرکردایەتی حیزب، کە دوای سێ ساڵ رێکەوتنی نێوان یەکێتی و شیوعی دروست بوو، بە دوایدا بەرەی کوردستانی دروست بوو، کە حیزب توانی مەفرەزەیەك بگێڕێتەوە بۆ ناوچەی دوکان، بەڵام یەکێتی کەوتە بیانووگرتن پێیان و بە مامۆستا سەرداریان وتبوو: ئەمە نامەی کەسی مەلا ئەحمەد بانی خێڵانییە، ئێوە دەبێت نامەی حیزب بێنن بە رەسمی! گەڕابوونەوە بۆ سەرکردایەتی و نامەی رەسمییان هێنا بۆ سەرکردایەتی یەکێتی لە سەرگەڵو ئینجا رێگەیان دا لەو ناوچەیە بن.

لە بەهاری ١٩٨٣ لە قەرەداغ بووین، چووینە گوندی کۆشك، کە دامەزراین پێشمەرگەیەکمان ناوی زەکی بوو خەڵکی کەرکوك بوو، لەماڵێك دامەزرا بوو هەواڵی رێگای چەمچەماڵی پرسیبوو، خاوەن ماڵەکە هات وتی: ئەو پێشمەرگەیە دەیەوێت تەسلیم بێتەوە وریابن زیانتان پێنەگەیەنێت! منیش سوپاسم کرد و عەتا و عومەر حامیم نارد پێموتن: بچن بە دارا هەڵیواسن و چەکی بکەن، ئینجا رێگای چەمچەماڵی نیشان بدەن! تا چووم عەتا و عومەر بێهۆشیان کردبوو ئەوەندەیان لێدابوو! پێموتن: ئەوە خزمی منە بۆ واتان لێکردووە!؟ زەکی دەگریا پێموت: بچۆ خزمەتی ئاڵا بکە بۆ رژێم! زەکی بەبێ چەك رۆی تەسلیم بووەوە و چوو بوو بۆ ماڵی ئێمە هەواڵی ماڵی عەتای پرسیبوو، خێزانەکەشم پەشیمانی کردبووەوە و پێیوتبوو: لە بەغدادیش بیت دەتدۆزنەوە و دەتکوژن ئینجا وازی هێنابوو.

لە بەهاری ١٩٨٣ دوای شەڕی پشت ئاشان هێزەکانمان هەمووی لە قەرەداغ کۆبووەوە لە باوەخۆشێن و شاخی سۆڵە و ئیمام قادر. لە رێکخستنەکانمانەوەلە شاری دەربەندیخانەوە خواردن و کەلوپەلمان بۆ

دەهات بۆ باوەخۆشێن لە ڕێگەی خەڵکی باوەخۆشێن و کانی سارد، چونکە سەرکردایەتی حیزب لە پشت ئاشان گیرا بوو هیچ ڕێگایەك نەبوو بۆ هێنانی پێداویستی بە تایبەتی پارە، دوای ڕێکەوتنی دێوانە هێزەکانمان پەڕییەوە بۆ ناوچەی شارەزوور لە زەلە ڕەشەوە، کە چووینە شارەزوور بەڕێز محەمەدی حاجی مەحمود هات بە پیرمانەوە، میوانداری بەشێکمانی کرد لە گوندی قەڵبەزە لەماڵی قازی، هێزە مەیدانییەکانمان هێشتەوە و پیر و بەساڵاچووەکانمان ڕەوانەی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوك کرد. لەوکاتەدا مەحمود دیکتارۆف لەگەڵ پیر و پەککەوتووەکان گەڕایەوە بۆ سەرکردایەتی لە کەڕەجاڵ، منیش وەکو سەرکردەی مەیدانی فەرمانکرا بکرێم بە جێگری حەمەڕەشید قەرەداغی لە بەتالیۆنی قەرەداغ وەك جێگری لێپرسراوی بەتالیۆن و مولازم سامی وەك لێپرسراوی سەربازی مایەوە، کە حەمەڕەشید قەرەداغی لێپرسراوی بەتالیۆن بوو.

دوای چەند ڕۆژێك کە ماوەیەکی زۆر بوو ماڵ و منداڵم نەدیبوو، حەلاوی خوشکم تازە مردبوو و قومری خێزانم نەشتەرگەری کرابوو، دوای چاکبوونەوەی لەگەڵ ئەحمەدی برام، چەند خزمێك سەردانیان کردم لە گوندی قەڵبەزە لە ماڵی مام حسەینی دوکاندار یەکترمان بینی، ئامینەی خوشکی عەتا و فەوزی خوشکەزای لەگەڵیان هاتبوون، ئەو سەردان و چاوپێکەوتنەم زۆر پێویستی بوو، چونکە بەهۆی ئاڵۆزی شەڕی ناوخۆوە ئاگاداری بارودۆخی خزمان نەبووم، دواتر لە گوندی کانی بەردینە لە هاوینی ئەو ساڵە بۆ مانگی شەش لەگەڵ بێکەس و سامی وەستا سابیر خانوویەکمان پەیداکرد و ناردم بە شوێن ماڵ و منداڵدا و هاتن بۆ لام، شەوێك لە سەربانی سەکۆیەك خەوتبووین قومری خێزانم هاواریکرد سەگ

کچەکەی بردم، کە کەژانی کچم بوو! بە پەلە چووم لە سەگەکانم سەندەوە و باش بوو ئازاریان نەدابوو! ؟

ئەحمەد بانی خێلانی و دکتۆر دلشاد هاتنەخوارەوە بۆ گوندی کانی بەردینە و لەگەڵ ئەبو سەلام و حەمەڕەشید قەرەداغی پێشوازیمان لێکردن، دواتر ئەبو سەلام و ئەبو سەرباز دەستیان بە کۆبوونەوە کرد لەو گوندە، دوای هەر کۆبوونەوەیەك برادەران بەزۆری میوانداری منیان دەکرد. هاوڕێ حەمەڕەشید هاتەلام وتی: ئازوقە و کەلوپەلت تەواو نەبووە؟ منیش وتم: مەحمودی سایەقم ناردووە بۆ ئازوقە هێنان، فەردەیەك برنج و تەنەکەیەك ڕۆن و دوو کارتۆن مریشکی بۆ هێناوم. دیار بوو کۆبوونەوەکان هیچ ئەنجامێکی نەبوو، بۆیە درێژە بە کۆبوونەوەکان دەدرا، بڕیاری حیزب ئەوە بوو کە ئەبو سەرباز کرابوو بە لێپرسراوی مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوك و ئەبو سەلامیش ئەو بڕیارەی جێبەجێ نەدەکرد، ئێمەش لێپرسراوانی سەربازی حیزب هەموومان لەگەڵ بڕیاری ئەبو سەلام بووین، دواتر ئەبو سەلام و ئەبو سەرباز گەڕانەوە بۆ سەرکردایەتی لە کەڕەجاڵ، بەڵام ئێمە هەر لەوناوە بووین، هەردوو بەتالیۆنی سلێمانی و قەرەداغ لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی حسك لە جەولە بووین لە شاخی ئەحمەد بڕنە و پشتی قلیجە، ڕژێم چەند جارێك هەڵمەتی دەکردە سەرمان بە هاوکاری سوپا و جاش و تانك و فڕۆکە، بەڵام لەبەر ئەوەی ناوچەکە سەخت بوو نەیدەتوانی زیانمان پێبگەیەنێت. خەڵکی گوندی ئەحمەد بڕنە و وازۆڵ زۆر هاوکارمان بوون لە گەیاندنی کەلوپەل و ئازوقە، مزگەوتەکەی ئەحمەد بڕنەمان کردبوو بە بارەگایەکی بچووك بۆ بەتالیۆنی قەرەداغ، بەڵام بەتالیۆنی سلێمانی لە دەوری تەپەکەل و سۆیلەمیش جەولەی دەکرد بە بێ بارەگا، ڕۆژێك

نەسرەدین هەورامی هات بۆ لام وتی: ئەگەر منداڵەکانت رۆیشتنەوە خێزانەکەم و خوشکەکەم دێن چەند رۆژێك لە ماڵەکەی تۆ دەبن، منیش جێگام بۆ ئامادەکردن و منداڵەکانم ناردەوە، بەڵام ئەو لە تەپەکەل جێگای پەیداکردبوو.

کاتێك لە بەتالیۆنی قەرەداغ و گەرمیان بووم کوڕی زۆر ئازا و جەربەزەی تێدابوو کە ناکرێت ناویان نەهێنم وەکو: عەزیزی سەلە قووت و عەبدوڵی برای و حەمە سۆران و ئەحمەد بانی خێلانی و جەلال کەلاری و کوڕەکانی مام عەلی خەلیفە بە تایبەتی ئەبو ڤیانی کوڕی و هێرشی مام جەوهەر و هاوڕێ حەمە سەعید و جەباری برای حەمەڕەشید قەرەداغی و سەرکەوت شێخ قادر و شێخ ئەحمەد چەتە و حامیدە سوور و بورهانی حەمە جەمیل و هادی دەربەندیخانی و تۆفیق فەتحولا کە زۆر جار بریندار بووە لە شەڕی پارتیزانی و شەهید بابا عەلی لەسەر شاخی نەوەر شەهید بوو، ئەمانە ئەوەندە ئازابوون لە کاتی شەڕدا نەیاندەهێشت پێشیان بکەوم، داوای لێبووردن دەکەم لەو ناوانەی بیرم چوون.

لە هاوینی ١٩٨٣ لە شارەزوور بووین کێشەی زەوی کشتوکاڵی هەبوو لەسەر ئەو زەوییانەی کە لە وەزارەتی کشتوکاڵەوە گواسترابووەوە بۆ زانکۆی سلێمانی بەشی کشتوکاڵ. ئێمە هەڵساین بە دابەشکردنەوەی زەوییەکان بەسەر جووتیاراندا کە زۆر هیلاك بووین پێوەی، لیژنەیەکم دروستکرد بە سەرپەرشتی مەناف هەورامی کە هەر ماڵە و چوار دۆنمان بۆ دانا، بە گوریس دابەشمانکرد کە کەس پۆڵەپۆڵی نەکرد، تا سەر ئاوەکەی سیروان دابەشمانکرد، حاجی مەحمود خوالێیخۆش بێت خەڵکی گوندی ئالان بوو، هات بۆ لام لەبەر ئەوەی بەشەکەی خۆی بە کەم دەزانی، چونکە بەرەی ٣ ژنی هەبوو، منیش

بەشەكەی ئەوم كرد بە دوو بەش كە مافی خۆی بوو. دوای ئێمە یەكێتی هات ئەو بڕیارەی پاراست كە تا ئێستا ئەو دابەشكردنە وەكو خۆیەتی هەڵنەوەشاوەتەوە.

له هاوینی ١٩٨٣ لە گوندی كانی ملواری بووم، برادەرێك لە قەڵبەزەوە هات وتی: منیان بۆ لای تۆ ناردووە، چەند كەسێك لە سلێمانییەوە بۆلای تۆ هاتوون، لەگەڵ مەفرەزەیەك چووم بۆ لایان بینیم مامۆستا صالح و سەلام خونچە لەگەڵ ماڵ و منداڵەكەمدا هاتبوون بۆ لام، ئەو دوو برادەرەم زۆر لەلا خۆشەویست بوو. مامۆستا ئەنوەر نامیقیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو، چونكە تووشی كێشەی كۆمەڵایەتی ببوو، یەكێتی بە دوایدا دەگەڕا، بۆیە ناچاربوو بێت بۆ لای من بۆ پارێزگاری ژیانی خۆی، كوێستانی كچمیان هێنابوو منداڵێكی خنجیلە و زیرەك بوو حەزی دەكرد بچمەوە لایان بۆ سلێمانی، ئەو ساڵە یەكێتی نیشتمانی كوردستان خەریكی دانوسان بوو لەگەڵ ڕژێم، پێیدەوتم: بۆ نایەیتەوە باوكی هەموو منداڵەكان پێشمەرگەن و دێنەوە تۆ بۆ نایەیتەوە، دیاربوو باوكی ئەو منداڵانە پێشمەرگەی یەكێتی بوون، منیش پێموت: ناتوانم بێمەوە حكومەت ئیعدامم دەكات. ئەویش وتی: تۆ لێرە پیاز پاك دەكەیت یان كەوەر پاك دەكەیت!؟ نەمدەزانی چۆن رازی بكەم. دوای ئاگاداركردنەوەی هاوڕێ حەمەڕەشید قەرەداغی، مامۆستا ئەنوەر لەلامان مایەوە، جارێك لە قەراغ ئاوی سیروان بووین پێیاندەووت: قەراغ بەحرەكە، دایكی مامۆستا ئەنوەر هات بۆ لامان بۆ ئەوەی بزانێت كوڕەكەی بە سەلامەتی هاتووە بۆ لامان، لەگەڵ خۆیدا دیاری و خواردنێكی باشی هێنابوو، دەستێك جلوبەرگی بە دیاری بۆ من هێنابوو، زۆر خۆشحاڵ بوو كە مامۆستا ئەنوەر بە سەلامەتی لای ئێمەیە.

لە پاییزێکی درەنگدا پێش ئەوەی قوتابخانە بکرێتەوە منداڵەکانم هاتن بۆ لام لە گوندی ئالان لە ماڵی مام مەحمود بووین، کە باوکی هاوڕێ حسەین بوو پێشمەرگە بوو لام، هەر ئەو رۆژە کە دکتۆر دڵشادم لەگەڵ بوو، حمەی فەرەج ئاغا پیاوێکی ناردبوو بۆ لام وتبوی: با خۆیی و دکتۆرەکە تا ماڵی ئێمە بێن، کە چووینە ماڵیان منداڵی مەلیحەی کچی بریندار ببوو، کە ژنی مستەشارێك بوو، دکتۆر دڵشاد منداڵەکەی تەداوی کرد. چەند رۆژێك منداڵەکان لە ماڵی مام مەحمود مانەوە دواتر منداڵەکانم ناردەوە بۆ سلێمانی و لەوکاتەدا کاتی گوڵەبەڕۆژە بوو، دوو سێ تەنەکە گوڵەبەڕۆژەم بۆ کڕین، دەنك درێژ و رەش و بە تام بوو، منداڵەکان بە فرۆشتنی زۆر خۆشحاڵ بوون دەیانوت: کەس گوڵە بە ڕۆژەی وای نەبووە هەر زوو هەموویان بە برژاوی فرۆشتبوو، بەداخەوە تا مانگی یەکی ١٩٨٤ چاوم بە منداڵەکان نەکەوتەوە.

لە هاوینی ١٩٨٣ لەگەڵ بێکەس چووینە ماڵێك لە گوندی کانی مرواری، لەوکاتەدا ماڵەکە خەریکی کاکێشان بوون بە تەراکتۆر، کاتێك سەرکەوتین بۆ ماڵەکە مەنجەڵێك سەری داپۆشرابوو، کە سەریم هەڵدایەوە سەیرمان کرد پڕیەتی لە گۆشت، چووینە ژووری و دانیشتین کابرای خاوەن ماڵ بە ژنەکەی وت: ژنەکە ئەوانە پێشمەرگەن وەکو عەسکەر وان خێرا نان و تەماتەیەکیان بەرێ نەك چاوەڕێ نەکەن و بڕۆن! منیش بە کابرام وت: بە خوا مەنجەڵە گۆشتەکەم بینیوە کۆڵووش بکەیت بە زگماندا ناڕۆین تا ئەو گۆشتەت لەگەڵدا نەخۆین! ئیتر پیاوەکە نەیدەزانی چی بڵێت ژنەکەی هات وتی: بە خوا حەقی خۆتانە ئیتر لە هەموو لایەکەوە بوو بە پێکەنین. هەر ئەو هاوینە لە گوندی قەڵبەزە بووین لەگەڵ بێکەس چووینە ماڵێك ئێوارە بوو، کاتێك مەڕ هاتەوە لە پڕ

مەڕێك لە حەوشەی ماڵەکە کەوت بە زەویدا، خاوەن ماڵەکە بە ژنەکەی وت: خێرا چەقۆ بێنە، دوای سەربڕینی مەڕەکە پیاوەکە هات وتی: نانتان خواردووە؟ وتمان نەخێر. وتی: نیو کاتژمێر چاوەڕێ بکەن ئێستا جگەرتان بۆ ئامادە دەکەم ئەمە رزقی خۆتانە، دوای نانخواردن وتی: سبەینێ وەرنەوە بۆ ئێرە لە بەشی خۆتان بخۆن، خوا لە خێری دەرنەکات بۆ نیوەڕۆی سبەینێ رۆیشتینەوە بۆ هەمان ماڵ بۆ نانخواردن.

لە هاوینی ١٩٨٣ لە گوندی قەڵبەزە بووم هەواڵ هات وتیان: ماڵەوەتان هاتووە بۆ لات منیش چووم بۆ لایان ئەحمەدی برام منداڵێکی چوارساڵیان لەگەڵ بوو وتم: ئەو منداڵە کێیە!؟ چونکە پێشتر نەمدیبوو، وتیان: ئەوە کوڕی ئەحمەدی براتە، خەریك بوو لە خۆشیدا وەزعم تێکبچێت لەبەر ئەوەی ئەحمەدی برام ٧ کوڕی لەسەر بێشکە مردبوو! وتم: ناوی چییە؟ وتیان: ناوی شوانەیە، گرتمە باوەشم زۆر سەبووریم هات ئەوانەی هاتبوون دەستیانکرد بە گریان، شوانە ئێستا پێشمەرگەیە و جێگای منی گرتۆتەوە، هەر ئەو رۆژە خێزانەکەم کچێکی چاو رەشی پێبوو وتم: ئەی ئەو کچە کێیە!؟ وتیان: ئەویش کچەکەی خۆتە کە ناومان ناوە کەژان، ئەویشم لە باوەش گرت یەکەم جار بوو بییانبینم.

لە هاوینی ١٩٨٣ لە گوندی کانی ملواری بووم، رۆژێك کاتی ئێوارە بوو هەواڵیان بۆ هێنام وتیان: میوانت هاتووە لەسەر کانییەکەی پشتی قەڵبەزەن. کە چووم قادری فارس و عەتام لەگەڵ خۆم برد، کە گەیشتینە ئەوێ ئەحمەدی برام و حەمە سۆیلەی ئامۆزام و دارا عەلی سویلەی ئامۆزام بە سەیارە هێنابوونی کە گۆشت و تفاقێکی زۆریان

لەگەڵ خۆیان هێنابوو، دەستمانکرد بە ئاگرکردنەوە و گۆشت برژاندن، کاك قادر وتی: ئەوە چۆن زانیت من زۆر حەز لە گۆشت دەکەم وا منت بۆ ئێرە هێناوە ! ؟ منیش وتم: بە رەنگدا دیاربوو کە حەزت لە گۆشتە. ئەو شەوە زۆر خۆشمان گوزەران، عوسمان کەریم چاوشینی رەحمەتی تازە لە سجن بەرببوو، حەمە سۆیلە نامەیەکی ئەوی هێنابوو کە پەیوەندی بکاتەوە بە حیزبەوە، منیش نامەکەم بە ئامانەتەوە بۆ گەیاندە حیزب.
لە هاوینی ١٩٨٣ لە گوندی کانی بەردینە بووم دوو برادەری ڕێکخستنی حیزب ئیشی باشیان لە ناوشار کردبوو هاتبوون بۆ لام داوای دەمانچەی بێ دەنگیان لێکردم. ئێمەش بۆمان پەیداکردن، یەکێك لەو دوو برادەرە قاچێکی دەستکردی هەبوو، ئەوی تریان گەنج بوو، گەنجەکەمان فێرکرد کە چۆن دەمانچەکە بە پارچەپارچەکراوی دەبەستێتەوە، دواتر دەمانچەکەمان بە پارچەپارچەکراوی خستە ناو قاچە دەستکردەکەی و ڕەوانەی شارمان کردنەوە، دەمانچە بێ دەنگەکە گەیشتبووە شوێنی خۆی و نەگیران، بەڵام ئەمنی سلێمانی پێیانزانیبوو بە دوای ئەو کوڕە گەنجەدا دەگەڕان کە دەمانچەکەی لابوو، دایکی ئەو برادەرە شەلەمان سەر بە ئەمن بوو، هەواڵی لە کوڕەکەی نەدابوو بەڵام وتبوی: لە گوندی کانی بەردینە دەمانچەی بێ دەنگ هاتووە بۆ سلێمانی بۆ کاری ئیختیالات ! کە زانیمان دایکی سەر بە ئەمنە پەیوەندیمان لەگەڵی بچڕاند، بەڵام ئەو هەر دەهات بۆ لامان پێماندەوت: تۆ دایکت سەر بە ئەمنە. وتی: باشە دەیکوژم، ئیتر ڕۆی نەهاتەوە بۆ لامان ! لەوکاتەدا دکتۆر عادل بە مەلا ئەحمەدی بانی خێڵانی وتبوو: کە ڕێکخستنێکی زۆر لە سلێمانی هەیە و دێنە لای حەمە صالح قەرەچەتانی و دەڵێن با پێشمەرگە نەمانبینێت، لێپرسراوێکمان بۆ بنێرن بۆ سلێمانی، ئەویش

هاوڕێ کەمالی بۆ ناردن، ئەو هێڵی ڕێکخستنە تا دوای ڕاپەڕین پارێزراو بوو لە سلێمانی کە کاری زۆر باشیان دەکرد.

لە هاوینی ١٩٨٣ لە قلیچە بووین لە بناری شارەزوور، حەمەڕەشید قەرەداغی پێیوتم: حەزمان لە گۆشتە چی بکەین؟! پێمووت: دەچم بۆ لای ئەو خێڵە مەڕدارانەی ناوچەی شارەزوور لەوێ دەیهێنم و خۆم دەکەم بە خزمی ئەوان، لەگەڵ مەفرەزەیەك تەراکتۆرێکم برد چووم بۆ ماڵی سەرۆك خێڵەکە ناوی عومەر سمایل عوزێری بوو، کە چووم پێمووت: منیش خزمی خۆتانم کۆمەڵێك پێشمەرگەین حەزمان لە گۆشتە دەمێکە گۆشتمان نەخواردووە. تا لە ماڵی کاك عومەر نانێکم خوارد هەواڵی ناردبوو بۆ هەموو ماڵەکان لە هەر ماڵێك حەیوانێکی بۆمان پەیداکرد بوو، بە تەراکتۆرەکە دوای سوپاسکردنی کاك عومەر حەیوانەکانمان هێنایەوە بۆ قلیچە دەستمان کرد بە خواردنیان تا تەواو بوون کە ٧ گیسك بوون.

لە هاوینی ١٩٨٣ چووم بۆ ڕەزاییە لە ئێران، لەوێ مەولود تەلانیم بینی، لەبەر ئەوەی پێشتر یەکترمان دەناسی زۆر نێوانمان خۆش بوو، ڕۆژانە پێکەوە دەگەڕاین و بە ناو شاری ڕەزاییەدا پیاسەمان دەکرد، ڕۆژێك ڕێگامان کەوتە کتێبخانەیەك، کاك مەولود دەیویست کتێبێك بکڕێت، بەڵام لەبەر گرانی کتێبەکە رووی کردە من و پێیووتم: پارەت پێیە؟ منیش پێمووت: نەوەڵا، بەس بەشی ئەوەم پێیە بچم بۆ تاران. وتی: زۆر حەز بە کڕینی ئەو کتێبە دەکەم، چونکە باسی مێژووی کوردی ئێران دەکات، کتێبەکەش ناونیشانەکەی بە فارسی لەسەری نووسرابوو (کوردها دەر سەدەی ١٩ و٢٠ دەر ئیران). وتم: هەر چۆنێك بێت بۆت جۆر دەکەم، چاودێری کابرای کتێبخانەم کرد تا پشتی لە ئێمە کرد،

خێرا کتێبەکەم خستە باخەڵم و وتم: با بڕۆین و خێرا رۆیشتین! لە دەرەوە کتێبەکەم پێشکەش کرد و وتم: هانێ بۆم کڕیوی!؟ دوای هاتنەوەی بۆ سنوور کاك مەولود نامەیەکی بۆ حیزب نووسیبوو تێیدا نووسرا بوو کاك کەریم قەرەچەتانی فێری کاسپییەکی کردووم ئیتر من هەرگیز پەکم لە پارە ناکەوێت! ئەوانیش پێیانوتم: فێری دزیت نەکردبێت باشە! دوای ئەوە لێك دابڕاین و من چووم بۆ تاران.

لە هاوینی ١٩٨٣ گەڕامەوە لە تاران و گەیشتمە کەڕەجاڵ پێیانوتم: دەبێت بچیتەوە بۆ پشت قەڵای شەمێران پارە و نامە هەیە بیبەی، منیش چووم بۆ ماڵی نەسرەدین هەورامی لە دزلی، کاك نەسرەدین لە ماڵ نەبوو براکەی هات لەگەڵم بۆ مەریوان بۆ لای نەمایندەی پارتی کە ناوی مەلا عومەر کانی کوردەیی بوو، کە دیمان وتی: برادەر بەم هەموو پارەیەوە دەچیت بۆ جوانڕۆ لەوێ رووتت دەکەنەوە!؟ راوەستە تا بەیانی هەڤالانی مەکتەب سیاسی دێن لەگەڵیان برۆ. بۆ بەیانی هەڤالانی پارتی هاتن بریتیبوون لە رۆژ نوری شاوەیس و فرەنسۆ حەریری و حەمیدە فەنی و حاجی مەحمود گەورەدێی و عوسمانی قادر منەوەر، منیش لە جێبەکەی کاك رۆژ سوار بووم و ئەوان نەیانزانی کە من شیوعیم، مەلا عومەر بە رۆژی وت: ئەو برادەرە شیوعییە و دەچێت بۆ ناوچەی خانەقین. کاتێك بەڕێکەوتین لە رێگا خزمێکی دکتۆر رۆژ پارەی لێدز رابوو، منیش پێموت: برادەرێکمان هەیە ناوی ئەسکەندەرە پارەکەت بۆ دەدۆزێتەوە، بەڵام قسە مەکە تا ئەوێ، دکتۆر رۆژ وتی: شیوعی و حساب گرتنەوە کوجا مەرحەبا! منیش وتم: چەند جارێك شتی وا روویداوە ئەو دۆزیویەتەوە. کە گەیشتینە ئەوێ بارەگای لێنەمابوو، منیش نەمدۆزییەوە و نەمدەزانی

چوون بۆ کوێ، چونکە پێشتر بارەگاکە تۆپباران کرابوو دوو برادەری ئێمە و دوو برادەری پارتی شەهید ببوون. حەمیدە فەنی هاتە پێشەوە لێم و تووڕە بوو وتی: تۆ چۆن پێشمەرگەیەکی تا بارەگاکەی خۆت نازانی چووە بۆ کوێ! ؟ وایدەزانی من پارتیم بۆ ئەوان بووم بە دەلیل. دکتۆر ڕۆژ چوو پێیوت: بچۆ ئیعتزاری بۆ بێنەرەوە ئەو برادەرە لە هەڤالانی حیزبی شیوعییە. حەمیدە فەنی هاتەلام داوای لێبووردنی لێکردم، دواتر برادەرانمان دۆزییەوە و هاوڕێ ئەسکەندەر بە حسابەکەی خۆی پارەکەی بۆ خزمەکەی دکتۆر ڕۆژ دۆزییەوە، میواندارییمان کردن کاتێك چووین دوو حەیوانمان ڕاوکرد، ئەوانیش دەستیانکرد بە گۆشت برژاندن و خزمەکەی دکتۆر ڕۆژ هەر دەهاتە لامەوە و سوپاسی دەکردم دەیووت: ئەگەر تۆ نەبوویتایە سەفەری خاریجم پەکی دەکەوت، دیار بوو ئەو پارەیەی لایبوو بۆ سەفەری خاریجی بوو، پارەکەشی ٢٠٠٠ دیناری سویسری و ١٠٠٠ دۆلار بوو.

لە پاییزی ١٩٨٣ لە گوندی پەروینە بووین، کاتێك بارەگای بەتالیۆن قەرەداغ و گەرمیان لە شەمێران بوو، وەزعمان زۆر خراپ بوو لە بێخەفتدا، حەمەڕەشید قەرەداغی پێیوتم: بەشکو بچیت بۆ گوندەکانی نزیکی دەربەندیخان بۆ پەیداکردنی ڕاخەر و بێخەڤ وا زستان نزیك بۆتەوە، منیش چەند پێشمەرگەیەکی ئازام برد بۆ سەر ئاوی سیروان، دوو بەلەمم گرت چووین بۆ گوندی بیرکێ و سیسیارە. لە ناو ئاوەکە پێیانووتم: کە بەلەمێك خاوەنەکەی دەڵێت نایەم، منیش بە خاوەنی ئەو بەلەمەم وت: کە منی تێدابووم وتم: نزیکی بەلەمەکەی تر بەرەوە، کە نزیك بووەوە ویستم کابرا ڕاکێشم بۆ ناو بەلەمەکەی خۆمان، بەڵام ئەو شارەزابوو بەلەمەکەی لار کردەوە منی خستە ئاوەکەوە، دوایی سەر

بەلەمەکە کەوتمەوە و چووینە ئەوبەر، لەوبەر دوو پێشمەرگەم بەدیار بەلەمەکانەوە دانا بۆ ئەوەی جێمانەنەهێڵن، چووینە بیرکێ و سیبارە لەوێ هەر ماڵە و بەتانی یان راخەرمان لێکۆکردەوە و هاتینەوە بۆ لای بەلەمەکان و پەڕینەوە بۆ ئەوبەر، کە نزیکەی دوو کاتژمێر رێگای ئاوی دەبوو، کە هاتینەوە ویستم خاوەن بەلەمەکە ئازار بدەم، بەڵام خاوەنی بەلەمەی تر بۆی پاڕایەوە و منیش لێیبووام و هاتینەوە بۆ بارەگا.

لە پاییزی ١٩٨٣ حیزبی شیوعی دوو تەکەتوولی لێ دروست ببوو، باڵی ئەبو سەلام و مەلا عەلی لە لایەك و باڵی ئەبو سەرباز و ئەبو تارا لە لایەکی تر، زۆر ناکۆك بوون لەگەڵ یەکتر. فەتاح گەلاڵی و تۆفیقی حاجی لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە لەوانە: رەسووڵ و رۆبیتەن دەیانوویست پەلە بکەن لە جیابوونەوە و بچنەناو یەکێتی، لەوکاتەدا ئەوان لە تەپەکەل بوون و ئێمەش لە ئالان و حاصڵ بووین، لە رێکەوتی ٢٥ / ٩ / ١٩٨٣ بەتالیۆنی سلێمانی لە سۆیلەمیش بوون، عومەر حامید و مامۆستا سەردار سەرپەرشتیان دەکرد، لە شەڕێکی دەستەویەخەدا کە چەند تەیارە وهەلیکۆپتەر هاتبوونەسەر گوندی سۆیلەمیش، ئەم گوندە تەنها گردێکی لێبوو کە لێوەی بەرگری بکەن. ناکرێت ئازایەتی جەلال هۆرێنەیی و تایەری حاجی قادر (یاسین) لەو شەڕەدا لەبەرچاو نەگیرێت، کە ئازایانە بەرگرییان دەکرد، لە نزیکی نیوەڕۆ شەڕ دەستی پێکرد بوو، بەداخەوە نەسرەدین و ئەبو تارا و مەلا عەلی لە تەپەکەل بوون کە زۆر نزیکیان بوون، نەچووبوون بە هانایانەوە ! ! ئێمە کە چووین ئێوارە بوو شەڕ تەواو ببوو، لەو شەڕەدا برادەرانی پارتی کە مەفرەزەیەکیان لەو شەڕەدا بەشدار بوو شەهیدێکیان هەبوو، برادەرانی حسکیش کە مەفرەزەیەکیان بەشدار بوو شەهیدێکیان هەبوو، بەڵام حیزبی شیوعی

زیانی زۆریان لێکەوتبوو لە بەتالیۆنی سلێمانی دوو شەهیدمان هەبوو بە ناوی جەلال و یاسین، هەروەها دوو برادەرمان بە دیل گیرابوون و دواتر هەواڵ هات وتیان: لەسەر جادە رمی کراون، یەکێکیان ناوی یوسف عەرەب و ئەویتریان ناوی شەماڵ بوو، بەداخەوە شەهیدیان کردبوون، کە چووینە ئەوێ برازایەکی سەید تۆفیق بەناوی عەبدولکەریم بە سەختی بریندار ببوو هەردوو قاچی شکابوو، تەراکتۆرێکمان بۆ گرت لەناو تابوتێکدا لە ئاوی سیروان پەڕانمانەوە بۆ بارەگای ناوچەی پارتی، لەوێوە برادەرانی پارتی رەوانەی ئێرانیان کردبوو، ئێستا عەبدولکەریم لە دەرەوەی وڵاتە. دوای ئەو شەڕە فەتاح گەلاڵی و تۆفیقی حاجی چووبوون بۆ لای مام جەلال، مام جەلال دەمانچەیەکی چواردەخۆری پێشکەش بە تۆفیقی حاجی کردبوو، نەسرەدین و مەلا عەلی لەگەڵ ئەو هەڵویستەی ئەو دوو برادەرە نەبوون، مەلا عەلی و نەسرەدین و ئەبو تارا چوون بۆ کەڕەجاڵ بۆ سەرکردایەتی، لەوکاتەدا کۆنگرەی حیزب بە دەستەوە بوو، ئەبو سەلام وتی: تا دوای کۆنگرە با جیانەبینەوە، بەلام مەلا عەلی و نەسرەدین لەگەڵ ئەو بۆچوونە نەبوون، تا کۆنگرە نەسرەدین و مەلا عەلی لە کەڕەجاڵ مانەوە بێ ئەوەی هیچ کارێك وەرگرن.

لە پاییزی ١٩٨٣ رژێم پەیامی بەسەر ناوچەی شارەزووردا بڵاوکردەوە بۆ بەزۆر چۆڵکردنی هێزەکانی بەرەی جود، لادێکان لە ترسی رژێم کە ئازاریان نەدا دەستیان کرد بە چۆڵکردنی ماڵەکانیان، ئێمەش بارەگامان گواستەوە بۆ ئەوبەر ئاوی سیروان لە پشت قەلای شەمێران. هێزی دوژمن لە دوو قۆڵەوە هێرشی بەربلاوی کردەسەر ناوچەکە، لە لایەك لە یەخشی و داری قەلانەوە هات تا سەر ئاوەکە،

لەلایەکی ترەوە لە هەڵەبجە و باوەکۆچەکەوە هات تا سەر ئاوەکە، لە کاتی ئەو هێرشەدا رژێم تووشی پێشمەرگە نەبوون تا شەڕ رووبدات. بۆ ئێوارە هێزەکەی رژێم گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە و سەید سادق. دووبارە خەڵکی ناوچەکە گەڕانەوە لادێکانی خۆیان، ئێمەش بە هەمانشێوە گەڕاینەوە بۆ ناوچەکە، لەوکاتەدا ناوچەی خانەقینی پارتی کە فەرەیدون جوانڕۆیی لێپرسراوی بوو زۆر هاوکارییان کردین.

لە مانگی ١٢ی١٩٨٣ لە پشت قەڵای شەمێران بووین، سوپای عێراق بە هاوکاری جاشی ئێران هێرشیانکرد بۆ سەر شاخی نەوەر، من لەگەڵ هێزێکی هەڵبژێراو چووین بۆ بەرەنگاری ئەو هێزە، شەڕێکی سەختمان کرد لەگەڵیان تا ئێوارە شەڕ بەردەوام بوو، ئێوارە هێرشمانکردە سەریان و هێزەکەی دوژمنمان شکاند بە هاوکاری ناوچەی خانەقینی پارتی کە بە هاوانی ١٢٠ ملم مۆڵگەکانی دوژمنیان بۆردوومان دەکرد. لەو شەڕەدا ئەحمد بانی خێڵانی بە سووکی بریندار بوو. دوای شەڕەکە هاوڕێ حەمەڕەشید کە ئامر بەتالیۆن بوو لقی گەرمیانی نارد بۆ شاخی نەوەر بە سەرپەرشتی شەهید بابا عەلی بۆ گۆڕینی شوێنەکان، ئێمەش هاتینەخوارەوە لە دامێنی شاخەدا تووشیان بووم، بە شەهید بابا عەلیم وت: تەمەڵی مەکە زوو بڕۆن سەرکەون بۆ سەر شاخەکە، بەڵام بەداخەوە لە ئەشکەوتێك کە نزیکی سەر شاخەکە بوو لایان دابوو بۆ حەوانەوە و خەویان لێکەوتبوو، بۆ شەو جاشەکان هاتبوونەوەسەر شاخەکەیان لێکردبوون! بۆ بەیانی کە لە خەو هەڵسابوون سەرکەوتبوون بۆ سەر شاخەکە، ئەوانیش لێیاندابوون و بابا عەلیان شەهیدکرد و ئەوانیتریش بە پەلەبڕووزە گەڕانەوە بۆ بارەگا! پێمانووتن: بابا عەلی کوا!؟ وتیان: نازانین چی لێهاتووە، کە ئێمە چووینەوە نەمانتوانی

تەرمەکەی بابا عەلی بێنینەوە، جاشەکان تەرمەکەی بابا عەلیان ڕاکێشابوو بۆ لای خۆیان.

لە دوای شەڕی نەوەر کۆمەڵێك لەسەر ئاوی سیروان بوون، بە ڕێکخراوی حیزبی ئیسلامی ناویان دەهات، بارەگاکانیان چۆڵ کردبوو کەلوپەل و خوادنێکی زۆریان لە پاش خۆیان بەجێهێشتبوو، من و شێخ ئەحمەد ناسراو بە چەتە و مامۆستا ئەنوەر چووین هەموو کەلوپەل و خواردنەکانیانمان گواستەوە بۆ ئەشکەوتێك لە قەراغ ئاوی سیروان. هاوڕێ حەمەڕەشید وەڵامی نارد کە بۆچی نایەنە سەرەوە، منیش وەڵامم ناردەوە بۆی کە ئێمە جارێ لە خوارەوە دەبین، چونکە ئازوقەی باشمان پەیداکردووە تا تەواوی نەکەین نایەینە سەرەوە. وتی: ئازوقەی چی؟ منیش وتم: برادەرانی حیزبی ئیسلامی خواردنی باشیان جێهێشتووە و ئێمەش گواستوومانەتەوە بۆ ئەشکەوتێك و دەستمان کردووە بە خواردنی، دواتر هاوڕێ حەمەڕەشید هاتەخوارەوە و تا ئازوقە مابوو لەو ناوچەیە بووین، دواتر چووینە پشت قەڵای شەمێران لە ناوچەی سەرشاتە.

لە مانگی ١١ی ١٩٨٣ هاوڕێ حەمەڕەشید بڕیاری دەرکرد کە چەند برادەرێك بنێرێت بۆ گرتنی ڕەبایەی چنارە، پێویستە تاوانی دوو کەس دەستنیشان بکەم کە چووبوون لە دەربەندیخان تەسلیمی ڕژێم ببوونەوە کە گوایە پەیوەندییان هەیە لەگەڵ هەڤاڵێکی سەرکردە، لەسەر ئەو سیقەیە هاوڕێ حەمەڕەشید ئەو مەفرەزەیەی نارد کە ببوە هۆی شەهیدبوونی چوار پێشمەرگە، شەهید عەمار عەرەب کە معاون سەرلق بوو و هاوڕێی شەهید حمیدە سوور، دوو برادەری پارتیش لەگەڵیان شەهید بوو. لەو شەڕەدا خالیدی کوێخا قادر کە پەیوەندی هەبوو بە

برادەرانی بەتالیۆنەوە لەگەڵ مامۆستا ئەنوەر چەند گولله هـاوانـێـکـیـان نابوو بە رەبایەکەوە کە بووبووە هۆی دەربازبوونی برادەران. نـابـێـت دەوری برادەرانی ئەحمەدبرنە لە مێژووی شۆڕشدا لـە بـیر بـکـرێـت بـە تایبەتی ماڵی شێخ ئەحمەد چەتە و کوێخـا قـادر و هـەڤـاڵ خـالـیـد و حەمەڕەشید صاروخ و مام نەسرەدین و مەحمودی سایەق، لەگەڵ داوای لێبووردن کە ناوی چەند ماڵێکم بیر چووبێت، بە گشتی هـەمـوو گـونـدی ئەحمەدبرنە لەگەڵ حیزبی شیوعی زۆر هیلاك بوون، هـەر دەتـوانم هـەر ئەوەندە بڵێم کە هەموو کاتێك هاوکاری شـۆڕش بـوون. ئـەوکـاتـە مـن معاونی ئامر بەتالیۆنی قەرەداغ و گەرمیان بووم و هاوڕێ حـەمـەڕەشـیـد ئامر بەتالیۆن بوو.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣دا هەواڵمان بۆ هات کە کۆمەڵێـك هـاوڵاتـی بوون بە پێشمەرگە لای پارتی دیموکرات، زانیمـان ئـەو کـەسـانـەن کـە هەوڵی کوشتنی مامۆستا ئەنوەر دەدەن، برادەرانی پـارتـی داوایـان لـە نەسرەدین هەورامی و حەمەڕەشید قەرەداغی کردبوو چاویان بە مامۆستا ئەنوەر بکەوێت، بەڵام ئێمە زانیمان مەبەستیان چییـە، بـە مـامـۆسـتـا ئەنوەرم وت: دەست بکەرەوە و ئامادە مەبە بتنێرن بۆ کەڕەجاڵ، ئەوانە نیازیان خراپە، دواتر لەگـەڵ حـەمـەڕەشـیـد قـەرەداغـی رێـکـکـەوتـین بینێرینەوە بۆ ناوچەی سلێمانی، بە بەلەم ناردمان بۆ ئەوبەر ئـاوەکـە و رێنماییمان کرد لەوێوە بچێت ناوچەی بازیان لە بـنـاری شـارەزوورەوە، لەوێشەوە بۆ چەمی رەزان، بەوشێوەیە مامۆستا ئەنوەر لە ئێمە دابـڕا و پەیوەندیکرد بە یەکێتی نیشتمانییەوە، چونکە نەیارەکانـی بـبـوون بـە پارتی. مامۆستا ئەنوەر تووشی ئەم کێشەیە ببوو، چـونـکـە بـەنـاحـەق ئاگریان نابوو بە خانووەکەیانەوە لە ساڵی ١٩٦٣، لـەبـەر ئـەوەی مـام

نامیقی باوکی هاوڕێیەکی حیزبی شیوعی بوو، لەو خانووەدا برایەکی مامۆستا ئەنوەر سووتابوو بوو بەهۆی مردنی، ویستبووی تۆڵەی ئەوە بکاتەوە تووشی ئەو کێشەیە ببوو.

لە زستانی ساڵی ١٩٨٣ هاوڕێ حەمەڕەشید وتی: بچن بۆ پشتی نێرگزەجاڕ بزانن ئاژەڵێك ڕاو ناکەن، چونکە ماوەیەکی زۆر بوو برادەران گۆشتیان نەخوارد بوو، من و ئەسکەندەر و قادری فارس چووین بۆ شاخی نەوەر لە پشتی نێرگزەجار، من پاشەڕۆی بەرازێکم بینی چووم بە شوێنیدا، بەرازەکە ڕێگای نەبوو بڕوات گەڕایەوە و رووی کردە من و شالاّوی بۆ هێنام! منیش دەستم لەسەر پەلەپیتکەی چەکەکەم بوو دەستڕێژم لێکرد دووجار لەسەر سنگم ساردبووەوە و کەوتم بە پشتدا دەست و باڵم بریندار بوو و چەکەکەم لە دەست پەڕی، قادری فارس و ئەسکەندەر هاتن بۆ لام وتیان: ئەو تەقانە چی بوو؟ منیش وتم: ئەو یەکانەیەم کووشتووە، زۆر دڵخۆش بوون کە سەلامەت بووم و هیچم لێنەهاتبوو.

لە ساڵی ١٩٨٣ لە کەڕەجاڵ بووم هەواڵیان هێنا کە تۆفیقی حاجی لە باخی بەختیاری بە دەستی پیاوەکانی ڕژێم شەهید بووە، زۆر دڵگران بووم کە ئەم هەواڵەم بیست، چونکە ئەوەم بیرهاتەوە ئەو ڕۆژەی لە گوندی تەپەکەل بووین لەگەڵ فتاح گەلاڵی زۆر هەوڵیاندا کە منیش بچم لەگەڵیان بۆ ئەوەی بچینەناو یەکێتی، منیش وتم: جارێ پەلە مەکەن با وەکو حیزب بچین بۆ ناو یەکێتی جێمانمەهێڵن، بەلاّم ئەوان قەناعەتیان نەکرد، مەلا عەلیش زۆر هەوڵیدا، بەلاّم سوودی نەبوو. پێمووت: بە تەنیا بڕۆن تیادەچن! من و مەلا عەلی و نەسرەدین لەگەڵتان بێین باشترە پەلە مەکەن، وتیان: بە تەنها بچین هەر دەچین. هەڤاڵ تۆفیقی حاجی

سەرکردەیەکی سەربازی حیزب بوو، نازانم بۆچی وایکرد لە خۆی بەداخەوە. دەڵێم بریا وەکو نەسرەدین بەسەر ئەڵغامدا بکەوتایە و شەهید بووایە یان وەکو عەلی کلاشینکۆف ئەشکەوت بەسەریا بڕوخایە یان وەکو سەید تۆفیق بە دەنگی تۆپ دڵی بوەستایە. من ئەم هاوڕێیانەم هەرگیز لە بیرناچێت کاتێك لە خانووە بچووکەکانی کەڕەجاڵ گفتوگۆی شەڕی پارتیزانیمان دەکرد، حیزب زۆرجار ئەو وشەیەی بەکاردەهێنا کە دەیانووت: ئەم خەباتی پێشمەرگایەتییە باشە بۆ پاراستنی ژیانی کادرەکانی حیزب لە شارەکان، کە دڵی پێشمەرگەکانی پێ سارد دەبووەوە، زۆر ناخۆش بوو کە ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بەوشێوەیە بدوێ و بڵێت: خەباتی پێشمەرگایەتی بۆ پاراستنی ژیانی کادرەکانی حیزب باشە و لە گرنگی شەڕی پێشمەرگایەتی کەم دەکردەوە ! کە شۆڕشیان دژی رژێمێکی ستەمکاری وەکو بەعس دەکرد ! ؟ ئەم وتانەیان دەبووەهۆی ساردبوونەوەی هزری شۆڕش لە خەبات و چالاکیدا.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٣ لە بێتووش و دولکانەوە هاتینە خوارەوە، لقی گەرمیان و بتوێن لە مەڵبەندی سلێمانی و کەرکوك جیابوونەوە و بوون بە مەڵبەندی هەولێر، بارەگای مەڵبەندی سلێمانی بۆ زستان گوازرایەوە بۆ حاجی مامەند، وەزع لەوێ زۆر خراپ بوو، ئەبو سەلام لەگەڵ حیزب ناکۆك بوو، عەلی کلاشینکۆف و تۆفیقی حاجی کە لقی شارەزوور بوون لە رەزڵەوە چوون بۆ سوورێن، بارەگای بەتالیۆن لە باراو بوو، لقی سلێمانی لەگەڵ بارەگای مەڵبەندی سلیمانی و کەرکوك بوو لە حاجی مامەند، پێش شەڕی پشت ئاشان ئەبو سەلام کۆمەڵێك برادەری عەرەبی ناردەوە بۆ سەرکردایەتی، بەڵام نەگەیشتنە ئەوێ شەڕی پشت ئاشان دروست بوو، یەکێتی لە نۆکان هەموویانی چەککرد.

لە بەهاری ١٩٨٤ ڕژێم دەستیکرد بە تۆپبارانکردنی بارەگاکانمان لە کەڕەجاڵ، لەبەر ئەوەی ئەو ناوە بەردەڵان بوو کە تۆپ دەیدا لە هەر بەردێك ١٠٠ پارچەی لێدەبووەوە، لەوکاتەدا کاروانچی باریان هێنابوو بۆ بارەگا، یەکێکیان پارچەیەك بەردی بەرکەوتبوو کە هیچ نەبوو دەستی کردبوو بە تاتەڕۆ تاتەڕۆ! ئێمە وامانزانی برینەکەی ترسناکە، نەسردین هەورامی چوو بۆ لای کە زانی برینەکەی سووکە لێیتووڕە بوو وتی: هەستە سەرپێ ئەو تاتەڕۆ تاتەڕۆیەت لە چییە! کە وەك من هەورامیت مەگەر سەرهەڵنەبڕم لەناو برادەران بڵێن هەورامی وا بێ غیرەتە، ئیتر کابرا دەنگی نەما.

لە ساڵی ١٩٨٤ لە ئەشکەوتی کەڕەجاڵ ئەبو سەلام و شێخ ڕەسووڵ لە ئەشکەوتێك بوون، حەمەی برازای ئەبو سەلام کە منداڵ بوو لای مامی بوو، ئێمە کە حەزمان لە چابووایە ئەچووین بۆ لای ئەبو سەلام کە چرایەکی ئێرانی لابوو بلوورەکەی بەرز بوو، بزمارێکی بە ئەشکەوتەکەدا داکووتابوو، پەتێکی بە بزمارەکەوە بەستبوو، بزمارێکی لە دامێنی پەتەکە بەستبوو، قۆرییەکی بچووکی هەبوو چەند کەس بووایە ئەوەندە کووپ ئاوی تێدەکرد، قۆریەکەی لەسەر چراکە دادەنا بە چەند خولەکێك چا ئامادە دەبوو. ئەمکارە بەس لای ئەبو سەلام هەبوو کە بە چرا چا ئامادە دەبوو، چاکەش زۆر بە تام بوو، چونکە لەسەرخۆ دەکوڵا، ئەمکارە بۆ ئەوەبوو کە ئاگر لە ئەشکەوتەکەدا نەکرێتەوە لەبەر ئەوەی دووکەڵەکەی کاریگەری لەسەر تەندروستی دروست دەکات، بەڵام ئەشکەوت زۆرجاریش دەبوو بە دوژمن، چونکە جارێك ئەشکەوت بەسەر عەلی کلاشینکۆڤ و چەند برادەرێکدا رووخا، بوون بە قوربانی ئەشکەوت بەداخەوە بۆیان.

لەساڵی ١٩٨٤ لە باغەکانی ئەحمەدئاوا بووین، کە ماڵەوەمان دەهات خواردنی باشی دەهێنا، پێشمەرگە بە ئاسانی دەستی نەدەکەوت، ئێمەش ئەو برادەرانەمان بانگهێشت دەکرد کە خۆشمان دەویستن، بۆ ئەوەی کەمێك ئاسوودەبن، منیش لای خۆمەوە عومەر حامید و عەتا خڕەم بانگهێشت دەکرد، هاوڕێ عەتا خزمێکی نزیکی خۆم بوو، لە دروستکردنی خواردندا دەستێکی باڵای هەبوو، لەگەڵ منداڵەکان خەریکی خواردن ئامادەکردن بوو. ئەحمەدئاوا ناوچەیەکی خۆش و فێنك بوو بۆ حەوانەوەی پێشمەرگە، سەختی شوێنەکە لەبار بوو کە دوژمن بە ئاسانی نەیدەتوانی دەستی پێ بگات، بەڵام لە تۆپبارانکردن درێغی نەدەکرد کە هیچ کاریگەری نەبوو. بۆ دەستکەوتنی کەلوپەل و پێداویستی ئەگەر بەردەست نەبووایە دەچووین بۆ ناو دێی ئەحمەدئاوا لەوێ دەستدەکەوت.

لە هاوینی ١٩٨٤ کاتێك خوێندنگە تەواو بوو منداڵەکانم هاتن بۆ لام لە سەرچاوەکەی زەڵم، لە دەروبەری سەرچاوەکە کۆمەڵێك ماڵی لێبوو هەموویان شیوعی بوون، وەکو گوندێکی بچکۆلە وابوو هەموومان سەردانی ماڵی یەکترمان دەکرد، لە هەر ماڵێك خواردنی خۆیان دروستدەکرد، ماڵەکان وەکو ماڵی مەلا عەلی، شێخ ئەحمەد چەتە، نەسرەدین هەورامی، سامی وەستا سابیر، مامۆستا عەلا، جەمال مام هەمزە، ئەبو تارا، مامۆستا صەلاح، سەید باقی، ئیبراهیم حاجی مەحمود، مام بارام، حمەی نانەوا، ئیسماعیل دیکتارۆڤ، کەریمی حاجی و هتد. هەر چییەکمان پێویست بووایە دەچووین بۆ گوندی ئەحمەدئاوا، خۆشی شوێنەکە زیاتر بوو لەوەی کە گوێز و میوەی دارەکان بەلاش بوو، چونکە خەڵکی گوندی زەڵم چۆڵیان کردبوو بە سەردان نەبووایە

نەیاندەتوانی سەردانی باغەکانیان بکەن، هەموو باخەکانیان بۆ پێشمەرگە باش بوو بۆ خواردن و حەوانەوە، دواتر ماڵی جلال عەلی هات کە تازە لە خاریج هاتبووەوە بۆ چارەسەرکردنی چاوی رەوانەی دەرەوەیان کردبوو. ئەو هاوینە هەم بۆ من هەم بۆ منداڵەکان زۆر خۆش بوو، کە پاییز هات منداڵەکانم ناردەوە، لە خورماڵ بازگەیەکی زۆر بێناموسی لێبوو زۆر ئازاری کەسوکاری پێشمەرگەی دەدا، ئەوجارە خێزانەکەم کە نامەی هاوڕێ عەتای پێبوو، بەڵام زۆر باش شاردبوویانەوە، لەم بازگەیە زۆر ئازاریان دابوون، مناڵەکانم خۆیان بە قاچی دایکیاندا هەڵواسیبوو بۆ ئەوەی نەگیرێت، هەرچەند بە شەق لە منداڵەکانیان دابوو، بەڵام لە دایکیان نەبوونەوە، لەوکاتەدا ئەفسەرەکە هاتبوو بە جەلادەکەی وتبوو: وازیان لێبێنە با بڕۆن، ژیانی خێزانەکانیشمان وەکو خۆمان هەر ئازار بوو، ئەگەر بهاتنایە بۆ لامان بەوجۆرە رزگاریان دەبوو، برادەری وا هەیە دەڵێت: خۆزگەم بەو رۆژانە ! ؟

دوای ناردنەوەی منداڵەکان دەستمان کرد بە دروستکردنی خانوو لە کەڕەجاڵ کە خانوو دروستکردن زۆر زەحمەت بوو . ئەحمەد لالۆ وەستا بوو بۆ دروستکردنی دیوار، کە بەردەکەمان هەڵدەکەند و بە پیك دەمان شکاند، لەو شوێنە خۆڵ کەم بوو خۆڵی جێگای بەردەکەمان بەکاردەهێنا بۆ گڵیبان.

ئەبو تارا هات بۆ لام وتی: حمە کەریم بۆ چالاکی نەکەین وتم: باشە. وتی: تۆ ئەو ساڵە لای میراوا بوویت شارەزا بوویت لە تۆپی ١٢٠ ملم کە گوللەی صارۆخی پێ دەتەقی لە کاتی رزگاری شۆڕشی ئێران. گوللەتۆپی باش هەبوو من و هاوڕێ عەتا و پۆڵا کەرکوکی چووین

جێگامان ئامادەكرد و دەستمان كرد بە تۆپبارانكردنی سەربازگەكانی خورماڵ و زەڵم، لەسەر شاخ نیشانگر (رصد)مان دانابوو، هەر كاتێك لە نیشانەكەمان بدایە دەیووت: دەستخۆش.

لە ساڵی ١٩٨٤ بارەگای بەتالیۆنی سلێمانی لە بانیشار بو، ئاوی نەبوو دەبووایە بە گوێدرێژ ئاو بهاتایە، پێشمەرگەیەكیان لابوو ناوی زەكی بوو چەند جارێك تەسلیم ببوەوە. جارێك نۆرەی ئەو بوو بۆ ئاوهێنان كە چوو بۆ ئاو نەگەڕابووەوە بە گوێدرێژەكەی وتبوو: كە چوویتەوە بە هاوڕێ عەتا بڵێ زەكی چوو تەسلیم بێتەوە ! ؟ برادەران زۆر چاوەڕێی ئاویان كردبوو بینیبوویان كە گوێدرێژەكە لەو ناوە دەسووڕێتەوە و زەكیش دیار نییە.

هەر لە بانیشار ڕۆژێك برادەرێك كە ناوی عەباس بوو قایشی مەخزەنەكانی راكێشابوو لە ئەڵقەی رومانەكە گیرببوو، رومانەكە تەقی بوو، بووبەهۆی گیان لە دەستدانی خۆیی و برادەرێكی تر كە ناوی نازانم بە داخەوە ! برادەرێكی تر ناوی هێرش بوو بریندار بوو بە سەختی، لەبەر ئەوەی منداڵ بوو تەمەنی ٢٠ ساڵ دەبوو، هاواری زۆری دەكرد دوایی چاك بووەوە. ڕۆژێك لە بازیان بینیم كە ئیشی بۆیاخی دەكرد وتی: نامناسی من هێرشم كە لە بانیشار بریندار بوون.

لە پاییزی ١٩٨٤ باوكم و ڕەحیمی كوڕم و عەبدوڵڵای ئامۆزام هاتن بۆ لام لەگەڵ ڕەمەزان مەحمود كە بەختیاری كوڕی لە لام بوو، خواردنێكی زۆریان هێنابوو. وتیان: ئێمە نایەینە سەرەوە بۆ كەڕەجاڵ لەم باخە تا ئێوارە لەگەڵت دەبین و ئێمە دەڕۆینەوە و تۆش بچۆرەوە بۆ بارەگا. منیش لەوێ مەلا عەلی و نسرەدین و شوانی ئامۆزای سامیم بینی، بانگمكردن هاتن دەستمانكرد بە گۆشت برژاندن، عەبدوڵڵای

ئامۆزام وتی: موالیدی ١٩٤٩ تەسریحە، بۆچی نایەیتەوە بۆ ناوچەی خۆمان لای قەرەچەتان و زێویێ باشترە و ئاگامان لە یەك دەبێت؟ ئەو قسەیە چووە مێشكم، چونكە حیزب زۆر ئیهانەی باڵی ئەبو سەلامی دەكرد، ئێمەشیان بە باڵی ئەو دەزانی هەرچەندە لەگەڵی ناكۆك بووین.

لە زستانی ١٩٨٤ وردە وردە چالاكی كەم بووەوە، هێزەكان هەموویان هاتنەسەر سنوور. بەتالیۆنی سلێمانی چوو بۆ بانیشار و بەتالیۆنی شارەزوور چوو بۆ كەرەجاڵ لە ناو یەك ئەشكەوت جێگای نەبووەوە. هاورێ عەتا چوو بۆ بەتالیۆنی شارەزوور كە پێشتر لە بتالیۆنی سلێمانی بوو، بەتالیۆنی قەرەداغ و گەرمیان لە پشت قەلاى شەمێرانەوە هاتنە خۆرنەوازان لە نزیكی بانیشار. لەوكاتەدا من چووم عەبدوڵڵای كوێخا همزەی ئاوكورتێیم بینی، لەسەر گومرگ بوو لە جۆمەرەسی، برادەرانی حیزب لە ئەشكەوتی هەزار ستوون بوون. رۆژێك ئەحمەد رەجەبم بینی لای بانیشار وتی: وەرە بۆ لای ئێمە واین لە ئەشكەوتی بانیشار، كە چووم مامۆستا سەردارم بینی لەوێ بوو، شەو لای ئەوان مامەوە بۆ بەیانی گەڕامەوە بۆ كەرەجاڵ.

لە كۆتایی ١٩٨٤ برادەرانی یەكێتی شەڕیان لەگەڵ ڕژێم دەستپێكردەوە، نەسرەدین هەورامی ئێزگەی یەكێتی كردبووەوە ئەیووت: بەفر گڕی گرت! نەسرەدینیش هاواری دەكرد بەفر گڕی گرت. ئەبو سەرباز توورە دەبوو وتی: ئەو شیڕەشیڕەی لە چییە!؟ ئێمەش ئەو برادەرانەی كە ناكۆك بووین لەگەڵ ئەبو سەرباز زۆرمان پێخۆش بوو كە یەكێتی لەگەڵ رژێم كەوتۆتە شەڕەوە، سەید باقیش وەكو چاودێر چاودێری ژوورەكەی ئێمەی دەكرد و بە دزی ئێمەوە نقوڵی دەخوارد و بەتانی دەدا بەسەر خۆیدا بۆ ئەوەی بەشی ئێمە نەدات، چونكە زۆر نزیك

بوو لێمانەوە! بێکەس هاواری دەکرد دەیووت: ئەرەوەڵا دەنکێکی خستە دەمی و دەمیشی ناجولێت بۆ ئەوەی ئێمە هەستی پێنەکەین خێرا قوتی دەدا؟! ئەویش ئەیووت: کوا دەمم هیچی تێدا نییە. ئێمەش پێماندەووت: ئەی گیرفانت!؟؟ ڕۆژێك لەگەڵ مەلا عەلی چووین بۆ ڕاوەکەو لە بناری شاخی کەڕەجاڵ، دوو کەومان کوشت هەر بەشی خۆمانی کرد بۆ برادەرانمان نەهێنایەوە، سەید باقی وتی: من دەنکێ مینۆ دەخۆم بێکەس دەیکات بە هەرا، بەڵام مەلا عەلی کەو دەخوات قسە ناکات!؟

لە کۆتایی ١٩٨٤ ئەبو سەلام چوو بۆ ڕاژان بۆ گفتوگۆکردن دەربارەی کۆنگرە، لەوێ پیانوتبوو: بڕۆ لەوانەیە بەندت بکەن! ئەبو سەلام گەڕایەوە و نەهاتەوە بارەگای حیزب، چوو بۆ بارەگای حسك! لەوێ ئەوان ڕەوانەی ناوچەی قەرەداغیان کردبوو، ئیتر ئێمە کۆمەڵێك برادەر بووین وەکو مەلا عەلی و مەحمود دیکتارۆف و نەسرەدین و بێکەس و ئەبو ڕەزا و جەمال حەمەئەمین، لەوێ هیچ کارمان نەبوو، هەر نانماندەخوارد و دەخەوتین. لەوکاتەدا ڕژێم تۆپبارانی دەکردین سەید تۆفیق کە نەخۆشی دڵی هەبوو هاتە دەرەوە وتی: هاوڕێ ئەوە چیبوو!؟ یەکسەر کەوت بە زەویدا و دڵی لە لێدان کەوت خوالێیخۆش بێت، برادەرێکی ئەڵمانیمان لا بەندبوو پارچە تۆپ لێیدا و کوشتی بەداخەوە.

مامۆستا عەلا پەڕییەوە بۆ تەکیە و چوو بۆ لای ئەبو سەلام، ئەحمەد عەرەب چوو بۆ لای ئەبو سەلام و گەڕایەوە باسی وەزعی ئەوێی بۆ دەکردین دەیووت: کە کۆمەڵێك کورد و عەرەب لە دەوری ئەبو سەلام کۆبوونەتەوە، لەگەڵ برادەرانی یەکێتی نێوانیان باشە، ئەبو سەلام بیری لە دروستکردنی حیزبی شیوعی عێراق دەکردەوە، بەڵام ئێمە کە چەند

برادەرێك بووین بیرمان لە دروستکردنی حیزبی شیوعی کوردستانی دەکردەوە، ئەبو سەلام سەرکەوتوو نەبوو لەو بۆچوونە عێراقییەی، چونکە نەیدەتوانی برادەرانی کورد رازی بکات، بەڵام هەموومان پێکەوە لەگەڵ حیزب ناکۆك بووین.

لە کۆتایی ١٩٨٤ ئەبو سەرباز و ئەبو تارا و ئەبو سیروان دژایەتی ئەو هاورێیانەیان دەکرد کە مابوونەوە لە کەرەجاڵ، گوایە لەگەڵ ئەبو سەلام جیادەبنەوە و حیزبی نوێ دروستدەکەن، بەڵام ئێمە دەمانویست حیزب لەسەر پێی خۆی راوەستێت، هەر چەندە سوودی نەبوو کە کۆمەڵێك هاورێی باش بووین، بووین بە قوربانی کێشمەکێشی هەردوولا. لەسەر ئەو دووبەرەکییە لە کیس حیزب چووین و هەریەکەمان چووین بۆ لایەك! پاش دانیشتنێکی زۆر وازم لەو حیزبە هێنا و چوومەوە بۆ ناوچەی قەرەچەتان، لە گوندی زێوێ هەردوو باڵەکە سەردانیان دەکردم و منیش رێزێکی زۆرم لێدەگرتن بێ جیاوازی، وەکو هاورێیەتی کە سەردەمانێك پێکەوە خەریکی حیزبایەتی بووین.

لە کۆتایی ١٩٨٤ هاتمەوە سلێمانی و لە رێگەی خوالێخۆش بوو ئەحمەد کوردەوە پەیوەندیم بە یەکێتی نیشتمانی کوردستانەوە کرد، ئەو رۆژەی کە چووم بۆ لای خوالێخۆش بوو حەسەن سلێمانی هەمەوەند لەوێ بوو، کاك بارزانی کوڕی چای هێنا بۆمان، لەگەڵ کاك ئەحمەد قسەیەکی زۆرمان کرد. دواتر ویستم بچم بۆ لای ئەبو سەلام، بەڵام ئەو رۆژە فڕۆکە جەنگییەکانی رژێم بۆردومانی گوندی تەکیەی بەلەکجاڕی دەکرد، نەچووم و گەڕامەوە بۆ سلێمانی و لە ماڵی خزمان خۆم حەشاردا، دواتر چووم بۆ گوندی سووسێ کۆن بۆ ماڵی ئامۆزاکانم، بەڵام ئەوێ زۆر باش نەبوو، چونکە رژێم بە ئاسانی دەیتوانی بێتە سووسێ کۆن.

لەکاتی خەباتی پێشمەرگایەتیدا چەند ماڵێك لە گوندەکان یارمەتیان داوم، جێگای سوپاس و پێزانینە لە گوندەکەی خۆمەوە دەستپێدەکەم، ماڵی کەریمی مام عومەری ئامۆزام و ماڵی شەهید حەمەسور و کوڕەکانی، لە زێویێ ماڵی محەمەد حەمەئەمین و لە قزلەر ماڵی کەریمی مام سلێمان و شێخ عوسمانی شێخ عارف، لە چۆخماخ ماڵی قادری کوێخا تۆفیق و محەمەد مستەفا و مام رەشید، لە مالومە ماڵی عەبدوڵلا وەسمان کە ساڵێك ماڵم لەوێ بوو، لەگەڵ ماڵی ئەحمەد گوڵە، لە هەڵەدن ماڵی حەمەی سوارە و براکانی و ماڵی فقێ مەحمود و حاجی قادر، لە سەرمۆرد ماڵی مام سمایل، لە گەڕەدێ ماڵی خدر سعید و حەمەی سمایل، لە وڵاغلو ماڵی حاجی عەبدوڵلا و عومەری کوڕی، لە گاپیلۆێن ماڵی مارف رەشید و عەلی مام برایم و مەلا عومەر، لە باڵخ ماڵی ئەحمد حەمەلاو و فقێ رەسووڵ، لە بزەینان ماڵی رەشید قوربانی و نوری کوڕی و ماڵی کەریمی حاجی قادر، لە کانی دڕکە ماڵی حاجی نوری و رەفیق و عەبدوڵلای کوڕی، لە هۆنەرێنە ماڵی شەهید حەمە فەرەج و مەلا حسێنی برای و ماڵی شەهید جەلال و خەلیلی برای و ماڵی سەردار، لە هەولۆ ماڵی حاجی عەبدوڵلا، لە نۆدێ ماڵی شێخ عبدول و خەلیفە، لە عازەبان ماڵی حەمەی خەلیفە، لە مێولاکە ماڵی حاجی محەمەد و مەحمود و عەلی و مام سمایل، لە یاخسەمەر ماڵی کوێخا ئەحمەد و حاجی مستەفا و خەلیفە خدر، لە چەرمەگا ماڵی محەمەد قادر و عەلی سوور، لە یەلانقۆز ماڵی حاجی هیدایەت، لە چالگە ماڵی جەلالی مامە تایەر، لە هەناران ماڵی عەلی قادر، لە بیران ماڵی رەئوف مام رەشید، لە قەیوان ماڵی شێخ حسەین، لە کۆکە ماڵی کەریم زینەت، لە حاجی تان ماڵی دکتۆر تەها و لە سووسە کۆن ماڵی حسەین سۆیلە و عەلی سۆیلە،

زۆربەی گوندەکانی تر کە ناوەکانم بیرنەماوە دوای لێبووردن دەکەم، بە تایبەتی گوندەکانی ناوچەی قەرەداغ و شارەزوور و هەورامان و گەرمیان و پشدەر و بتوێن و مەرگە و ناوچەی ئالانی ئێران، ئەگەر پیاوەتی و نان بدەیی ئەم گوندانە نەبووایە پێشمەرگە کاری گرانتر دەبوو، بە تایبەتی گوندەکانی دۆڵی جافایەتی کە لە سەرەتای شۆڕشەوە تا ئەنفالەکان خزمەتێکی باشی پێشمەرگەی لایەنەکانیان کردووە، لەبەر ئەو هۆیە مام جەلال و کاك نەوشیروان بڕیاریان دابوو بارەگای سەرکردایەتی خۆیان بهێننە ئەو ناوچەیە و تا ئەنفالەکان بارەگایان لە گوندەکانی یاخسەمەر و سەرگەڵو بوو، لەگەڵ بارەگای مەڵبەندی دوو لە بەرگەڵو.

لە کاتی پێشمەرگایەتیمدا لەناو حیزبی شیوعیدا کۆمەڵێك پێشمەرگەم لەگەڵ بوو هەندێك ماوەی پێشمەرگایەتیان کەم بوو لەگەڵم، بە داخەوە هەندێکیان هەواڵیان نازانم ماون یان نا، لەوانە نەجاتی رەحمە خۆیی و دوو برای، حەمەی مەلا حەسەن ناسراو بوو بە حەمەی نۆکاو لە راپەڕینەکەدا شەهید بوو، ئەحمەد پێیاندەووت ١٠ی بێ غەش، چونکە مانگانە حیزب هەر پێشمەرگەی ١٠ دیناری یارمەتی دەدا ئەویش وتبوی: ئەم ١٠ دینارە بێ غەشە!، ئاکۆ، مامۆستا قادر شەهید بوو، ئەبو عەلی، جەمالی مام هەمزە، سەرداری حاجی قادر و رێبازی برای، مامۆستا حەسەن شەهید بوو، کوڕێکی وەلی عەبەی سەیدزادە، ئەبو رەزا کە عەرەب بوو، ئەبو هەنا، مولازم ماجید، وەستا جەمال عەبابەیلێیی، بەکر شێخ ئەحمەد بەلەکجاڕی، لەتیف رەشید نۆدێیی، محەمەد و بکر کە خەڵکی زەروون بوون، حاجی صالح بەرگووردی، هاوڕێ هیوا کۆچی دوایی کرد، یاسینە شەل، جووتیار و براکەی کە کوڕی حەمەی عەلی دەوڵەت بوو لەگەڵ شێرزادی مامیان، صدیق صەلاحەدین کە دەنگی

خۆش بوو، کاتی نیوەڕوان لە گوندەکان بانگمان پێدەدا، لەبەر دەنگخۆشییەکەی خەڵکی گوندەکان پێیانخۆش بوو، بەڵام خۆی کاکەیی بوو لە ناوچەی هاوار! ؟ هێرش کوڕی قادر شوان، تەها حەمەئەمین خاڵە ئەحمەد کە خەڵکی گوندی هەڵەدن بوو، ئارام قەرەداغی ئێستا دکتۆرە لە بەشی کوردۆلۆژی، زاهیر برای شەهید ئەکرەم، بابیز کوڕی سەید باقی، شەهید عومەر کوڕی جەلال عەلی، جەلال شەریف مارف خەڵکی گوندی هۆنەرێنە، نوری محەمەد عەلی خەڵکی کەرکوك، جەواد کوڕی مەجیدەفەنی، هونەر کوڕی حەسەن دڕەیی، شەهید رەحمان ژنبرای عەلی کلاشینکۆف، هەژار کوڕی ئەحمەد هەلاج، دوو کوڕی عەزیزی ئوتووچی، جەزای ئەستێڵ، کوڕێکی حاجی کەریم بێکراس، برازای حەسەن قرگەیی، بە داخەوە کە ناوی زۆربەیانم بیر نەماوە داوای لێبووردن دەکەم.

زۆربەی ئەو پێشمەرگە ئازایانەی لە هەموو لایەنەکان کە پەیوەندی باشیان لەگەڵم هەبووە، هەر چەندە لەگەڵم پێشمەرگە نەبوون، بەڵام هاوکاری باشم بوون لە زۆربەی کاری سیاسی و سەربازیدا کە مێژوو شایەتی ئازایەتییان دەدات، ئەمەش ناوی بەشێك لەو تێکۆشەرانەیە کە هاوکارم بوون: ئەحمەد کاکە برا و عەبدوڵڵای برای، نەجمەدین شکور ناسراو بە مامەڕیشە، شەوقی کوێخا سمایل، عومەر چاوشین کەڵەکنی، خاڵە بەکر کەڵەکنی، عەبدولڕەحمان حاجی عەزیز حاجیتانی و یاسینی کوڕی، عومەری حەمەکاکی، کمال محەمەد حاجی ئەمین گەبەیی، ئەبو ڤیان و براکانی، هاوڕێ حەمیدە سور، عەمار عەرەب، ئەسعەد گامێش تەپەیی، تەهای مامە رەزای کەلکە سماق و حمیدی برای، مامۆستا جەمال پێنجوێنی، علی رەش کوێرەکی، حاجی

محەمەدی قرگە، تەها ئەحمەد سەعید، عومەر سێکانیانی و خزمەکـانـی، کمالی کوێخا عەبدوڵڵا و ناسیحی برای، رەسووڵی حەمە زێڕی جـاسـەنـە، یاسین غەریب بیرانی، عومەر قەڵادزێیی، قادر دەرگـەیـی و عـەبـدوڵـڵای برای، ئەکرەمی ئاسنگەر، مامۆستا قادر، پەروێز عـەلی گـردەپـۆر، مـەلا خالید موخاخی و برا و ئامۆزاکانی، رۆبیتەنی حاجی برایم چەرمـەگـایـی، هاوڕێ یاسین سێوکانی، مام عوسمانی کۆیە، غـەنـی حـاجـی ئـەحمـەد نەمەڵی، هاوڕێ حەسیب و هاوڕێکانی، سەرباز ئـەحمـەد بـانـیـخـێـلانـی، کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە و کوڕەکانی، سمـایـل عـەرەب کـافـرۆشـی، کەریمی حاجی هیدایەت بازیانی، برایم عەبدوڵڵا کانی شەیتانی، غـەریـب عەسکەری، مەلا زەوقی و هاورێکانی، سەلامـی حـاجـی کـەریـم، غـازی هەرکی، هاوڕێ هەلوێست کلکە سماقی، مولازم سـامـی و هـاورێـکـانـی، مەجید حاجی عەلی شانەخسێیی، محەمەد حاجی سابـیر قـایـنـەجـەیـی، عوسمان صالح سووسە کۆنی و براکانی، حەمەئەمین مستـەفـا سـووسـە کۆنی و یوسفی برای، ئیسـمـاعـیـل گـەورەدێـیـی، عـەلی حـاجـی نـادر چوارقوڕنەیی، ئازاد حەمەسور، رزگار ئاری، پرسیار حـاتـەم و رزگـاری برای، رەزاق جەعفەر حسەین، حەمە رەئوف نـاصـر، ئـەیـووب حـەمـە صالح، سۆران نوری وەسمان، بەختیار ستار کەریم، بەکر کەریـم حـەمـە علی، رەسوڵ ئەحمەد، عەلی شەریف سۆیـلـە، مـولازم کـەریـم سـەلام، رەحمان ئەحمەد جوبرائیل، سەلامە سور کانی میرانی، شـێـخ ئـەحمـەد چەتە ئەحمەد برنەیی، قەیس عەرەب، مەمەند صدیق، عـەلی خـەلـیـفـە دوزی، عەلی عەبدوڵڵا کۆکەیی،حەمەئەمین ئەحمەد گەبەیی، شێخ مـارف عەوەڵانی، کـوڕی سـەلمـان فـەتـاح، حـەلاوە و عـایشـە لـە گـونـدی قەرەچەتان، حەمەسور حاجی ئەمین، سابیر عەبدوڵڵا، سەعید ئەحمـەد،

حامید حەمەئەمین یاخسەمەری، حەمەڕەشید گەورەدێی، مەحمود محەمەد ئەمین یاخسەمەری، خالید محەمەد حاجی، رەشید محەمەد عەزیز، بارام عەبدوڵڵا سابیر و کاوەی برای، ئەزوەر ئەحمەد یاخسەمەری، حەمەتاڵ سەعید، رەشید عوسمان محەمەد، ئەکرەم رەشید غەفوور، مامە عەزیز فەرەج مالومەیی، جەلیل ئەحمەد ئیسماعیل هەڵەدنی، عومەر محەمەد صالح و صەلاحی برای، خەلیل عەبدوڵڵا ئەمین گوێزیلەیی، عوسمان قادر محەمەد، مەجید عەبدوڵڵا یاسین، هاوڕێ ئەنوەر و هاوڕێکانی، ئەحمەد مەحمود سوار قەرەچەتانی، کوڕی قادر کەریم، سەرکار گولیجەیی، کوڕی شێخ محەمەد شیلەخانی، جەبار ئەحمەد کاکەمەند چالاخی، خالە سەربەست سووسێیی، برزوو حاجی چراخ چەرمەگایی، شێخ عەزیز شێخ فەتاح عەوەلانی، شێخ عوسمان شێخ فەتاح عەوەلانی، کوێخا حەمە سەعید قەڵەم پاشا، ئاسۆی مامۆستا عەلا تەکێیی، شێخ ئەحمەد کاکە رەزا سەرگەڵوویی، عوسمان مەولود چەمی رەزانی، ئاسۆ نایب، رزگار حسەین شەریف، تەها ئەحمەد سەعید، نەبەز ئەحمەد کوردە، حاجی محەمەد قڕگەیی و تایەری برای، سەید تۆفیق عەبابەیلێیی،نەسرەدین عابد هەورامی، تۆفیق حاجی هەڵەبجەیی، عەلی کلاشینکۆف، مەحمود حەسەن بانی خێلانی، سمایل نەسروڵا دیکتارۆڤ، مولازم سامی، بایز سەید باقی و هاورێکانی، بەکر تەلانی، ئیسماعیل گەورەدێی، ئەنوەر عەبدوڵڵا مەلا صالح، شێرکۆ شێخ عەلی سەرگەڵوویی و براکەی، جەمال عەلی باپیر، سەلامی مامۆستا خالید، دکتۆر ئاسۆ رەزا، محەمەد حاجی برایم و براکانی لە سووسە کۆن، عوسمان صالح جاف، حەمەئەمین حەمە مستەفا، عەتای خوشکەزای ئەحمەد سمێڵ، بەکر دارتوویی، عومەری زەراعە، حەسەن

حاجی مەحمود گەلاڵەیی، ئەحمەد مەولود و حسێنی برای، حەمە سەعید قەرەداغی، مەجید دوکانی، رەئوف حاجی محەمەد کانی ساردی، نەجم مەلا ئەسعەد، هاوڕێ عەمار عەرەب، یاسینی حاجی قادر، جەلال شەریف هۆنەرێنەیی، یوسف عەرەب، عەلی حاجی نادر، غەریب قادر هەڵەدنی، قادر چاوشین، شێخ دارای حەفید، شێخ کاوەی حەفید، ئەحمەد مارف نانەوا، دکتۆر فارس، حاجی سەراوی. داوای لێبووردن دەکەم ئەگەر ناوی ئەو هەڤاڵانەم بیر نەمابێت کە شەهید یان ئەنفال بوون.

دوای ئەوە کە وازم لە حیزبی شیوعی هێنا، هاتمەوە بۆ ناوچەکەی خۆم چوومە گوندی سووسە کۆن، لەبەر ئەوەی ماڵی چەند ئامۆزایەکی خۆمی لێبوو وەکو: ماڵی حسەین سۆیلە و عەلی سۆیلە و مام حەمەڕەشید و کوڕەکانیان، هەموو رۆژێك بەیانیان زوو دەچووینە چەمی مەلا سەوغە و قادر پەری و ئێواران دەگەڕاینەوە بۆ سووسە کۆن، لەبەر ئەوەی گوندێکی نزیکی جادە و قەڵای سووسێ بوو، رژێم بەئاسایی دەیتوانی بێتەناو گوندەکە، منیش لەگەڵ حەسەنی مام حەمەڕەشیدی ئامۆزام و چەند کەسێکی گوندەکە کە لە رژێم قاچاغ بوون وەکو: شەهید محەمەدی حاجی براهیم کە کاتی راپەڕین بە دەستی موجاهیدنی خەڵك شەهید بوو و سابیر و عومەری برای و حاجی مامیان و عەزیزی صاڵح جاف و عەباسی برای بە داخەوە ئەنفالکران، ئێمە ئەم حەوت کەسە لە رژێم قاچاغ بووین، ئەو ئێوارانەی وەزع باش نەبووایە ئەوا شەو دەگەڕاینەوە بۆ چەمەکە.

دەمەوێت باسی مامە حسەین خوالێیخۆش بێت بکەم، کە زۆر یارمەتی منی داوە، وەك کوڕی گەورەی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ کردووم، کاتێك کە چوومەتە ماڵیان هەرگیز هەستم نەکردووە کە میوانم،

خۆشی هەمیشە حەزی كردووە میوانی زۆر بێت، من تازە وازم لە حیزب هێنابوو، شەو دەچوومە چەمی سووسە كۆن دەخەوتم و بۆ بەیانی ئەوان دەهاتن بۆ كانی قوشان بۆ شریت لێدانی تووتن، دەچوومە لای ئەوان، ڕۆژێك ئەوەندە ناساغ بووم بە بینینی مندالْ ئیزعاج دەبووم، ئەو ڕۆژە كە هاتن ئامۆژنە خانمیان لەگەڵ نەبوو، وتم: بۆچی نەهاتووە؟ وتیان: چووە بۆ سلێمانی. وتم: شیكەی (ژیان خانی كچی) بردووە لەگەڵ خۆی؟ وتیان: بەڵێ. وتم: ئێستا زۆر حەسامەوە كە ئەوتان لەگەڵ نییە! چونكە بە دەنگەدەنگ زۆر تێكدەچووم، ڕێبواری كوڕی وتی: ئێمەش زۆرمان پێخۆشە كە ئەوی بردووە لەگەڵ خۆی، چونكە ئەوانیش بەو دەنگەدەنگە تێكدەچوون، دەمەوێت ئەوەش نیشان بدەم كە دوای ڕاپەڕینیش مامە حسەین هانی هەموو كوڕەكانی دەدا كە لەگەڵم بن و لێم جیانەبنەوە هەڵسووكەوتیان لەگەڵم زۆر باش بوو، هەمیشە پێنج كوڕی لەگەڵم پێشمەرگە بوون، كاتێك مامە حسەین لەوێ نەدەبوو بە ئامۆژنە خانمی دەوت: ئاگاتان لە حەمەكەریم بێت بێ خزمەت نەبێت، ئامۆژنە خانم ئامۆزای خۆمان بوو، ئەویش درێغی نەكردووە لە خزمەتكردنم كە پێشینان دەڵێن: لە پشت هەموو پیاوێكی چاك ژنێكی چاك بوونی هەیە. هەروەها مامە عەلی سۆیلەش پشت و پەنامان بووە هەرچەندە بیروباوەڕی جیاواز بوو، هەمیشە ئامۆژگاری منداڵەكانی كردووە كە پشتم بگرن و لێم جیانەبنەوە، دوو كوڕی ئەویش لەگەڵم پێشمەرگە بوون، كوڕەكانیان بریتی بوون لە دارا و سەركەوت و ئازاد كە كوڕی مامە عەلی بوون و صەلاح و فەلاح و شەریف و ئەمیر و ڕێبوار كە كوڕی مامە حسەین بوون، دارا لە هەموویان گەورەتر بوو كاتی ڕاپەڕین هەمیشە بە چەكەوە لەگەڵم بوو.

لە هاوینی ١٩٨٥ رژێم بە یارمەتی جاشەکانی تاسلووجە لە ناودێی سووسە کۆن بۆمان دامەزرابوون، پاش ئەوەی هەواڵیان بۆ هێنایـن گەڕاینەوە بۆ چەمەکە، هەستیان بە ئێمە کرد دەستیان بە تەقە کرد، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ چەمەکە لە ئەنجامی تەقەی جاشەکان محەمەد مستەفا شەهید بوو، کە مجێوری مزگەوتەکە بوو، بەڵام لەبەر چڕی چەمەکە جاشەکان نەیانتوانی بێنە سەرمان و گەڕانەوە شوێنی خۆیان. دوای ئەوە من بەو برادەرانەم وت: با بچینە بەری قەرەچەتان کە زۆر شوێنێکی قایمە و رژێم بە ئاسانی دەستی پێناگات، برادەرانی جاف پێیان باش نەبوو. جاشەکانی تاسلووجە کە دەهاتن بۆ سەر گوندەکە مەبەستیان من بوو، چونکە لە شەڕی قزلەر زیانیان پێگەیشتبوو، زیاتر هاتنەکەیان بۆ تۆڵە بوو لە من، چونکە دوای من یەکجاری تر هاتن، کە بیستبوویان من لەوێ نیم جارێکیتر نەهاتنەوە بۆ گوندەکە.

زانیم کە ئاوی ئەم گوندە پیسە و بە کەڵکی خواردنەوە نایەت، ناردم بۆ لای مستەفای ئامۆزام کە لە دائیرەی ئاو بوو کاك مستەفا کلۆری بۆ ناردم، هەر بیری ماڵێك کەوچکێك کلۆرم تێدەکرد، چونکە بیرەکان کرمی وردی سووری تێدابوو کە هەموویانی تووشی سکچوون کردبوو، بەمکارە هەموو گوندەکە لە سکچوون رزگاریان بوو، بەڵام خۆم تووشی ئازاری گورجیلە بووم بە نهێنی هاتمەوە بۆ سلێمانی چوومە ماڵی حەمە سەعیدی پوورزام کە بە ماڵێکی زۆر باشم دەزانین، چونکە جگە لە حمە سەعید کە پوورزام بوو ئایشەی خێزانی زۆر ژنێکی بە خزمەت بوو لەگەڵمدا، هەروەها منداڵەکانی ئەوەندە خۆشیاندەویستم بە مامە بانگیان دەکردم، هەتا ئێستا مەمنوونی ئەو ماڵەم. لەوێ ئاکۆی کوڕی بە بەرگی سەربازییەوە بردمی بۆ لای دکتۆر ئازاد ئیسماعیل حەقی، دکتۆر

وتی: گورجیلەی وەستاوە ! ؟ وتمان چارە چییە؟ وتی: یان عەمەلیات یان چارەسەری بۆ دەنووسم نابێت شەو بخەوێت هەر بە قادرمەدا سەرە و خوار بکات و ئاو زۆر بخواتەوە تا گورجیلەی لە ژێر پاڵەپەستۆی ئاوەکە بکەوێتەوە کار، تا دەتوانیٚ یەك تەنەکە ئاو بخواتەوە. ئەگەر نەکەوتەوە کار دەبێت بچێت بۆ بەغداد بۆ چارەسەر، چونکە ئەو ئامێرە لە سلێمانی نییە، ئەگەر بەم ئامێرەش نەکەوتەوە ئیش دەبێت گورجیلەی دەربهێنن. منیش لە ترسی ئەوەی بچم بۆ بەغداد ئەوشەوە تا بەیانی یەك تەنەکە یان زیاتر ئاوم خواردەوە بیٚ ئەوەی بخەوم هەر سەروخوارم دەکرد بەسەر قادرمەکەدا، کاتی بەیانی خەوم لێکەوت هەستم کرد کە کەوتۆتەوە ئیش، لەبەر ئەوەی هەموو گیانم کەوتەسەر ئارەقکردن. بۆ ئێوارە چووینەوە بۆ لای دکتۆر وتی: ئەوەی وتم کردت؟ وتم: بەڵیٚ. دوو تیشکی ملەوەنی پێکردم کە هێنامەوە بۆ لای وتی: ئافەرم گورجیلەت لە جاران باشتر ئیش دەکات کە تا ئێستا لە ئیش نەوەستاوە سوپاس بۆ خوا. کاتێك لە ماڵی کاك حەمە سعید بووم هێزێکی زۆری جەیشی شەعبی هاتن ویستیان لەسەربانی ئەوان پاسەوانی بکەن، چونکە بە شەو پێشمەرگە بۆ ناو گەڕەکەکان دەهاتن، ئاکۆ و ئاسۆ نەیانهێشت بچن بۆ سەربانی ئەوان، چونکە وایاندەزانی هاتوون بۆ گرتنی من، بەڵام لەبەر ئەوەی هەردووکیان سەرباز بوون هەویەکانیان لێسەندن و بردیان وتیان: بەیانی وەرن بۆ ئیدارە، بەیانی چووبوون هەویەکانیان هێنابووەوە. بەو نەخۆشییە ئاگام لە خۆم نەمابوو، رۆژێك سەبری خوشکی خێزانم ویستبووی بمبینێت، چونکە دەمێك بوو نەیدی بووم، قومری خێزانم هێنابووی بۆ لام وامزانی باوەژنەکەمە رووم تێکرد وتم: باجی فەیم بەخێر بێیت، دەستی بە گریان کرد و وتی: خۆ نامناسێت!

دوای چاك بوونەوەم هاتمەوە بۆ ماڵی خۆمان کەس نەیزانی جگە لە منداڵەکانم، وەزعم باش بوو پاش پێنج رۆژ ویستم بڕۆمە دەرەوە کەس نەیزانێت، بە منداڵەکانم وت: گلۆپی حەوشە بکوژێننەوە تا دەڕۆم کە رۆیشتم بەڕێکەوت دڵسۆزی برازام بینیمی کردی بە هەرا و وتی: ئەرەوەڵا مامە حەمەکەریمە، دوایی قومری خێزانم لێی هەڵە کرد وتی: چاوت رێشکە و پێشکە دەکات. دوایی مەلیحی براژنم لێیتووڕە بوو وتی: ئەو هاوار هاوارەت لە چییە؟! ئەویش دەیوویست کەس نەیزانێت، بەڵام دوایی کەسوکار هەموویان زانییان کەوتنە گلەییکردن کە بۆچی نەیانزانیوە لە ماڵە. ئەوشەوە چوومە ماڵی مستەفای ئامۆزام و چەند شەوێك لەوێ بووم، دوایی چوومەوە بۆ ماڵی حەمە سەعیدی پورزام و حسێنی ئامۆزام چوو حاجی صاڵحی کەریمی هێنا کە پیاوێکی ئەمین بوو، پیکابێکی تویوتای پێبوو بە رێگای قاچاغ بردمییەوە بۆ سووسە کۆن.

تا پاییزێکی درەنگ لە سووسێ بووم، شەوانە کە دەچووینە چەمەکە مێشوولە هەراسانی کردبووین لە لایەك و هاتنی رژێم لە لایەکی تر، بۆیە لەگەڵ حەسەنی ئامۆزام بڕیارماندا کە ئەوناوە چۆڵ بکەین و بچین بۆ بەری قەرەچەتان، ئەوەی پێمان بوو باری کەرێك بوو، شەو چووین بۆ گوندی گرژە لە ماڵی صاڵح رەشید ماینەوە پێیووتین: ئەوە ماڵەکەتانە بۆ خۆشی. بۆ بەیانی ئێوارە لەبەر ئەوەی چەکمان پێ بوو لە بن پردی کونە رێویان پەڕینەوە. لە رێگا خوالێخۆش بوو عومەری حەمە عەلیمان بینی خۆمان لێ لادا بۆ ئەوەی باش نەماننناسێت کە ئێمە چەکمان پێیە ئەوانیش لە رژێمەوە نزیك بوون. هاتین بۆ گوندی قەرەچەتان چووینە ماڵی کەریمی مام عومەری ئامۆزام، چەند رۆژێك

لەوێ ماینەوە و دوای پشوودان بەڕێکەوتین بەرەو گوندی زێوێ، پێش ئەوە هەواڵمان بۆ خێزانەکانمان ناردبوو کە کەلوپەلمان بۆ بنێرن، کە چووینە زێوێ خێزانەکانمان لەوێ بوون، هەموو شتێکیان هێنا بوو بۆمان، بە تەراکتۆرەکەی ماڵی حاجی هیدایەت لە یەڵانقۆز کە عەوێزی کوڕی کچێکی ئەحمەدی برامی خواستبوو بە ناوی دڵسۆز، لە گوندی یەڵانقۆز نانێکی زۆریان بۆمان کردبوو بە تەراکتۆرەکەیان کە عەوێزی زاوامان شۆفێری بوو هێنابوویان بۆمان، لە گوندی زێوێ خانووی ماڵی کاک محەمەدی حەمەئەمینی گەورەم دابین کرد کە دۆستایەتی کۆنی لەگەڵ خۆم و باوکم هەبوو، وەکو ماڵ لە گوندی زێوێ نیشتەجێبووم کە جێگایەکی زۆر سەخت و قایم بوو، رژێم بە ئاسانی نەیدەتوانی دەستی پێ بگات.

لە گوندی زێوێ ماڵی خوالێخۆش بوو ئەحمەد کوردەی لێ بوو، کە پێشتر دۆستایەتیم لەگەڵی هەبوو، هەر لە ڕێگای ئەوەوە پەیوەندیم بە یەکێتی نیشتمانییەوە کرد بوو، پیاوێکی ئازا و چاونەترس بوو فەرماندەیەکی باڵی مەکتەبی سیاسی بوو، کوڕەکانیشی لەسەر رێگای باوکیان بوون بە تایبەتی کاک هەڵۆی کوڕی کە سەرتیپی تیپی ٢٣ ی سورداش بوو، لەوکاتەدا نێوانی لەگەڵ من باش بوو، پاش رۆشتنەوەی خێزانەکانمان بۆ سلێمانی دەستمان کرد بە سەردانی خزمان لە گوندەکانی قەرەچەتان و یەڵانقۆز و قزلەر، جارێك چووین بۆ سەردانی جووتیاری ئامۆزام لە قزلەر کە حەسەن و یوسفی ئامۆزام لەگەڵ بوو، پێمانوت: بۆ نایەیت بۆ گوندی زێوی کە ئێمەی لێین، دوای ماوەیەك بڕیاری دا بێت بۆ لای ئێمە لە زێوێ و چەند جارێك دەمایەوە.

ئەو زستانە لەگەڵ کاك حەسەن گوزەرانمان بۆ بەهار بە مەبەستی کشتوکاڵکردن رۆشتەوە بۆ بەری سووسە کۆن، منیش بە تەنیا مامەوە بە کشتوکاڵەوە خەریك بووم، بۆ هاوین منداڵەکانم هاتن بۆ لام و گوزەرانمان باش بوو، جەمالی مەلا محەمەدی ئامۆزام ماڵی لەوێ بوو هاموشۆمان خۆش بوو، دواتر سامی وەستا سابیر کە ئەویش وازی لە شیوعی هێنابوو وەکو من، سەردانی کردم پێی باش بوو ماڵی بێنێت بۆ زێوێ، منیش جێگام لای خۆم بۆ پەیداکرد، وردە وردە ژیانم باشتر دەبوو، چونکە خەریکی کاسپیکردن بووم و مۆڵەتم لە تیپی ٢٣ وەرگرت، لەوکاتەدا شۆڕش ئێمەی پێ بەخێو نەدەکرا، منیش بۆ خەرجی منداڵەکان دەستم کرد بوو بە کاسپیکردن.

لە ساڵی ١٩٨٥ بە دواوە ئەو کەسانەی لەناو یەکێتیدا لێپرسراو بوون، هەندێکیان زۆر پشتگیری منیان کردووە لە رووی مەعنەوی و رێزەوە وەکو: مولازم عومەر عەبدوڵلا و فەرەیدون عەبدولقادر و عومەری سەید عەلی و هەلۆ ئەحمەد کوردە و خوالێخۆش بوو کاك نەوشیروان مستەفا و مامۆستا عەبدوڵلا، ئەم بەڕێزانە زۆر رێزیان لێدەگرتم، بۆ نموونە رۆژێك لە بارەگای گوێزێ بووین لە قەندیل، من و کاك هەلۆ و کاك نەوشیروان دانیشتبووین باسی شکاندنی ئێران و کیمیاییبارانی بۆ دەکردین، کاك نەوشیروان هاتەسەر ئەوەی کە چۆن گورباشۆڤ بە پیرۆسترۆیکا و گلاسنۆس یەکێتی سۆڤێتی هەڵوەشاند، فەرمووی کاك کەریم پێش ئەوان درکی پێکردووە و وازی لە حیزبی شیوعی هێناوە! منیش وامزانی گاڵتەم پێدەکات وتم: کاك نەوشیروان گاڵتەمان پێدەکەیت!؟ وتی: نەبەخوا خۆشمدەوێی حەز دەکەم موجامەلەت بکەم.

لە هاوینی ١٩٨٦ خەریکی سەربڕینی ئاژەڵ بووم بۆ فرۆشتنی گۆشت، لەگەڵ کاك جەلال کە ئەویش لە سلێمانی کاری گۆشتفرۆشتنی دەکرد، لەبەر ئەوەی ئەم گوندە سەخت بوو ماڵی پێشمەرگە و سەربازی هەڵاتووی زۆر بوو، ئەمکارە بۆ ئێمە باش بوو بۆ بژێویمان، لە لایەك کشتوکاڵم بەشی خۆم دەکرد و لە لایەکی تر کاری گۆشتفرۆشتنم دەکرد. کاتی ترش شکاندنەوە خەریکی رەز بووم، چونکە ملکی خۆمان بوو هی ماڵی صۆفی شەریفی ئامۆزام بوو، ترشەکانی ماڵی جەعفەری مام حسەین و ئامۆزاکانی بە دەست منەوە بوو. رەزی ترێی ماڵی نەوزادی شەهید حمەسوورم بە دەستەوە بوو کە بەشی هەموو دێیەکەی دەکرد.

دواتر بڕیاری ئەوەمان دا کە دەست بکەین بە مریشکفرۆشتن لە سلێمانییەوە بۆمان دەهات تا گوندی یەڵانقۆز لەوێشەوە بە تەراکتۆر بۆیان رەوانە دەکردین و لە گوندەکە دەمانفرۆشت کە باری گوزەرانی باش کردبووین، رژێم لەبەر ئەوەی دەستی بە ئاسانی نەدەگەیشتە زێویێ دەستی دەکرد بە تۆپبارانی گوندەکە، لەبەر ئەوەی تۆپەکان لە قەڵای سووسێوە دەهاوێژران، گوندەکە وا هەڵکەوتبوو کە تۆپەکان زیانی بۆ گوندەکە نەبوو تەنها خوار دێ و ئەوبەر گوندەکەی دەگرت، بەڵام خەڵکی گوندەکە چۆڵیان کردبوو بۆ شاخی سمایل چەوێل کە دوورە دەست بوو، گوندەکە بۆ پێشمەرگە و سەربازی هەڵاتوو مابۆوە. منیش لە کانی خەلیل خەریکی کشتوکاڵ بووم، بە نەشارەزایی شووتیم تۆو کردبوو شوتی گرتبوو وەکو شەمامە. رۆژێك حاجی قادر خوالێیخۆش بێت کە بە تەنیا بە دیار ئاژەڵەوە مابووەوە و منداڵەکانی ناردبووەوە بۆ سلێمانی، سەردانی کردم و پێیوتم: شووتییەکان ببەستەرەوە با خل نەبنەوە بۆ خوارەوە ! منیش وتم: باش دەیانبەستمەوە. هات بۆ لام

پێیوتم: لە زێویێ شوتی پەیدا نابێت، چونکە ئەو دەیزانی کە زێویێ شوتی لیێ پەیدا نابێت، بەڵام من نەمدەزانی.

لە هاوینی ١٩٨٦ باوکم زانی کاتی ترش شکاندنە هات سەردانی کردم بە خۆیی و منداڵەکانییەوە، بۆ ئەوەی یارمەتیم بدات، ڕۆژێك دوای شکاندنی ترشەکە هەموو منداڵێك کۆڵێك ترشم دابوو بە کۆڵیدا، بە منداڵەکانی خۆم و منداڵەکانی باوکم، لە کانی خەلیلەوە بیبەنەوە بۆ زێویێ بۆ ماڵی خۆمان، لە ماڵەوە باوکم چاوی پێیانکەوت کە هەموویان ملیان درێژ ببوو لە بن کۆڵە ترشەکەیاندا، باوکم وتی: بە خوا حەمەکەریم بێویژدانە ئەو منداڵانەت بۆ وا لێکردووە ! ؟ منیش وتم: خۆ بە جێیناهێڵم سەیارە نییە باری بکەم، بوو بە پێکەنین! ؟

ڕژێم زانی کە تۆپباران سوودی نییە بۆ چۆڵکردنی گوندەکە، هێزی تۆپبارانی گواستەوە بۆ سەربازگەی کەڵەوانان کە تیمێکی جیاواز بوون، تەنها کاریان تۆپباران بوو، بە شێوەی کاتی دەهاتن، لە مانگی ٦ ی ١٩٨٦ دەستیکرد بە تۆپبارانکردنی زێویێ و خەڵکی گوندەکە بە تەواوی چۆڵیان کرد چوون بۆ سمایل چەوێڵ، بەڵام پێشمەرگە چۆڵی نەکرد، دەستمان کردەوە بە ژیانی ئاسایی خۆمان.

لە زێویێ برادەرێکی فەقیرحاڵی لێبوو ناوی کاکەسوور بوو، فیرارەکان گاڵتەیان پێدەکرد ئەویش قسەی ناشیرینی پێدەووتن دوایی دەیووت حاشا حازری! ؟ ڕۆژێك ٣ ژنی فیرار نانیان دەکرد لەسەر تەنوور، ئەویش تۆزێك ژنانی بوو چوو بوو بۆ لایان، من چووم بۆ لای بێستوون سابووراوایی لەویێ ژنەکان گاڵتەیان لەگەڵ دەکرد پێیاندەووت: شووت پێدەکەین ئەگەر بێیت دوو نان پێوە بەیت، ئەویش دەیووت: من لە تەنووری بەرز نان پێوە دەدەم. ئەوانیش پێیاندەووت: دەبێت ماکسی

لەبەر بکەیت ئەوسا شووت پێدەکەین! ئەویش دەیووت: من پیاوم نابێت ماکسی لەبەر بکەم. منیش بە ژنەکانم وت: وازی لێبێنن.

لە مانگی ٧ی ١٩٨٦ شەوێك کۆمەڵێك پێشمەرگەی حیزبی شیوعی هاتن کە پێشتر هاوڕێی خۆم بوون، خەبەریان کردمەوە عومەر حامید بوو وتیان: زۆرمان برسییە چیمان لێدەکەیت؟ منیش وتم: بەم سەعات ٢ی شەوە چیتان لێبکەم!؟ دەشتی نان و سندوقێك هەرمێی رەشبووەوەی لێبوو، وتم: بە کەڵك نایەت؟ وتیان: بماندەرێ. منیش دامنێ. بۆ بەیانی هاتن بۆ لام دوای نان و چاخواردن وتم: هەرمێکان چییان لێهات؟ وتیان: تۆ چی دەڵێیت قنچکەکانیشمان خوارد ئەوەندەمان برسیبوو!

رژێم لە رێگای بەکرێگیراوەکانی خۆیەوە ئەڵغامی لەسەر رێگای نێوان گوندی زێویێ و یەڵانقۆز دادەنا، چەند جارێك بە چەند تەراکتۆرێکدا تەقییەوە، جارێك بە تەراکتۆری مام رۆستەمی یەڵانقۆزدا تەقییەوە کە خۆی شەهید بوو و چەند پێشمەرگەیەك بریندار بوون، هێنایانن بۆ زێویێ بۆ چارەسەرکردن، چونکە نەخۆشخانەی لێبوو، لەلایەن شەهید دکتۆر ئاسۆوە بەرێوە دەبرا.

جارێکی بە تەراکتۆری ماڵی حاجی هیدایەتدا تەقییەوە، عەوێزی کوڕی بە سووکی بریندار بوو، چەند رۆژێك لای من بوو تا چاك بووەوە، جارێکیتر بە تەراکتۆری کامیلی برای کەمالی حەمە تایەری قەرەچەتاندا تەقییەوە کە چەند کەسێکی تێدا بریندار بوو بە خەستی.

کە پاییز هات منداڵەکانم ناردەوە بۆ سلێمانی، منیش لەگەڵ سامی ئەو زستانەمان بەسەربرد بە خۆشی. جارجار سەردانی قەرەچەتانم دەکرد و لە قەرەچەتانیشەوە میوانم دەهات. رۆژێك سامی حەرەکات لەگەڵ کۆمەڵێك برادەری هاتبوون بۆ لام، ئەوان لەگەڵ حیزبی

شیوعیدا ناکۆك بوون و لەگەڵ بهادین نوریش نەبوون، ناوی خۆیان نابوو حیزبی شیوعی سەوری، لە بەری قەرەداخەوە هاتبوون دەچوون بۆ لای مام جەلال.

لە بەهاری ١٩٨٧ جارێکی تر دەستمکردەوە بە کێڵانی زەوییەکان بۆ چاندنی پیاز و تەماتە و بامیە و کولەکە و باینجان، بەس بەشی خۆمی دەکرد، بەڵام پیاز و تۆو رەشەکە بەشی فرۆشتنی دەکرد.

لە بەهاری ١٩٨٧ سەوزەی کچی کەریمی مام عومەرمان خواست بۆ جووتیار کە هەردوولایان ئامۆزام بوون، سەوزەمان گواستەوە بۆ زێوێ و ماڵی کاك ئەحمەدی باوکی جووتیار هاتبوون شەو لای من مانەوە و رۆیشتنەوە بۆ سلێمانی. دواتر ماڵێکم بۆ دابینکرد لە زێوێ، بووین بە سێ ماڵی ئامۆزای یەك، کە بریتی بووین لە من و جووتیار و جەمال.

لە مانگی ٦ی ١٩٨٧ رژێم ویستی گوندی بیران راگوازێت، کۆمەڵێك گەنجی قەرەچەتان چوون بۆ شەڕی بیران، لەوکاتەدا سەردانی قەرەچەتانم کردبوو بۆ ئەوەی بێن بۆ هەرەوەزی شکاندنی ترش، لە بن بەردەسپی بووم لە پشتی قەرەچەتان لەگەڵ ماڵی کەریمی مام عومەر، بە گڕی تۆپەکە کە تەقی بوو پووش و پاوانی بیران ئاگری گرت و بووەهۆی سووتانی ئەو برادەرانە، گوێم لە هاواری ئەو برادەرانە بوو کە چوون بە هانای بیرانەوە، منیش چووم بە هانای ئەوانەوە، بینیم رەفیقی مام رەئوف سووتاوە، دام بە شانمدا و بردم بۆ بن دار و شەخسەکەی پشتی ناودێ، زۆری پێنەچوو دکتۆرەکانی زێوێ هاتن بریتی بوون لە دکتۆر ئاسۆ و دکتۆر راپەڕ، دەستیانکرد بە تەداوی سووتاوەکان لە بریتی بوون لە رەفیقی مام رەئوف و ئازادی حمەسوور و هێرش کە پێشمەرگەی تیپی ٢٣ی سورداش بوو. ئەوانەی تر نەسووتابوون، چونکە

چووبوونەسەر بەردە گەورەکان. بە گڕی ئاگرەکە هەموو زیندەوەران لە پێش ئاگرەکەوە وەکو تەیارە گرمەیان دەهات بۆ ئەوەی نەسووتێن! ئاگر لە ئێمە نزیك بووەوە و بە ئەوانەی لەگەڵم بوون وت: بچن بۆ ناو شەخسەکەی تاویان، چونکە ئەویٚ ئاگر نەیدەگرت، ئاگرە بە لاماندا رۆی و بناری پیرەمەگرونی هەمووی سووتاند، مام جەلالی مامی رەفیق پێیووتم: کەریمی حاجی عەلی کامێرات پێیە وێنەی رەفیق بگرم بزانم چۆن شەڕی بیران دەکات؟! وەها تووڕە ببوو! دوای ئەوە بریندارەکانمان گواستەوە بۆ زێویٚ بۆ چارەسەرکردنیان. رەفیق وای لێهاتبوو ئاگای لە خۆی نەمابوو هاواری دەکرد وریابن ئەو ئاگرە دەتانسووتێنێت!

رۆژێك تەیارە بۆردوومانی گوندەکەی کرد بە بۆمبی هێشوویی و ناپاڵم و تەنها دوو کەسی بریندارکرد، رۆژێکی تر لەگەڵ رەحیمی کوڕم خەریکی کشتوکاڵ ئاودان بووین رژێم تۆپبارانی گوندەکەی کرد وایانزانی بەرکەوتووین، ماڵەوە هاواریان کردبوو، بەڵام کانی خەلیل شوێنی باشی لێبوو بۆ خۆحەشاردان کە چووینەوە بۆ ماڵەوە وەزعیان باش بووەوە کە ئێمە ماوین.

لە هاوینی ١٩٨٧ میوانێکی زۆری قەرەچەتانم لابوو رژێم دەستیکرد بە تۆپبارانی گوندەکە بە کیمیایی، پێشتر لە نزیك مزگەوتەکە ژێر بەردێکم چاك کردبوو بۆ منداڵەکان، کە دەستیکرد بە تۆپباران زانیم کیمیاییە منداڵەکانم نارد بۆ ئەویٚ و میوانەکان ئەوەی لای رەفیق بوون چووبوونە کۆڕیچەی مزگەوتەکەوە، منیش چووم بۆ لای منداڵەکان، نزیکەی کاتژمێرێك بە خەستی تۆپبارانی کرد، خەڵك وایاندەزانی هەموومان بە کیمیاییەکە تیاچووین، بەڵام من بەتانیم بە ئەشکەوتەکەدا

گرتبوو زوو زوو تـەڕم دەکـرد و دەمـوچـاوی مـنـداڵـەکـانم دەشـۆری، خۆشبەختانە ئەو رۆژە رەشەبا بوو کاریگەری کیمیاییەکەی لـەسـەرمـان کەمکردبووەوە.

ئەو ئاوەی بەتانییەکەمان پێ تەڕ دەکرد نەما، ویستـم بچـم ئـاو بێنم پەریخانی کچم گرتمی نەیهێشت بچم، خۆی لە پڕ دەرچوو بۆ هێنانی ئاو کە نزیکی ١٠٠مەتر لێمان دوور بوو، کە هاتەوە گوللەتۆپێك لە شوێنی ئاوەکەی دا و وەکو کالیار بوو بە دوو کەرتەوە! ؟ کیمـیـایـی بـەونـاوەدا بڵاوبووەوە، خۆشبەختانە بێ زیان بوو، ئـەمـەش ئـازایـەتـی کچـەکـەم دەردەخات و نەیهێشت بچم، ویستی خۆی بکات بە قوربانی لە پـێـنـاوی مانەوەی مندا! ؟ کەم منداڵ هەیە ئەوەندە باوکی خۆشبوێت خۆی بکـات بە قوربانی بۆی. ئازا بەتانییـەکـەمـان تـەڕ کـردوو دامـان بـە دەرکـی ئەشکەوتەکەوە، ئەو رەشەبا بەهێزە نەبووایە هەموومـان دەخـنـکـایـن، لەژێر ئەم ئەشکەوتەدا ماڵی جووتیارمان لەگەڵ بوو، پـاش تـەواوبـوونـی تۆپبارانەکە منداڵەکانم برد بـۆ مـاڵـی فـایـەق بـیرانـی، کـە ئـاوی لـە سەرچاوەی پیرەمەگرون راکێشابوو، ئـاوەکـەی پـاك بـوو دەمـوچـاوی خۆمان لێ شۆری و منداڵەکانم بەجێهێشت و چوومەوە بۆ مزگەوتەکە بـۆ لای بریندارەکان، بە پەلە بە قەرەوێڵەوە رەفیقم هەڵگرت بردم بۆ پشـت ناودێ و میوانەکانم نارد بۆ لای منداڵەکـان بـۆ مـاڵـی فـایـەق بـیرانـی. گوللەیەکی کیمیایی دابووی بە ماڵی ئەحمەد کوردەدا، بە کاك ئەحمـەدم وت: نان مەخۆن ماڵەکەتان ژەهراوی بووە بڕۆن بۆ ماڵی فایەق بـیرانـی، بەڵام ئەو لە مردن نەدەترسا گاڵتەی پێ دەهات، بەڵام دوایی هەمـوویـان ژەهراوی بوون و کوێری کردبوون! دواتر لە قەرەچەتانەوە باوکی رەفیق کە مام رەئوف بوو لەگەڵ کۆمەڵێك قەرەچەتانیدا هـاتـن بـۆ زێـوێ بـە هانای بریندارەکانەوە، داوای لێبووردنی لێکردم کـە بـەهـۆی رەفـیـقـی

كوڕییەوە مندالّەكانم بەر كیمیایی كەوتبوون، بەلاّم پێموت: خەمی مندالّی منت نەبێت هیچیان نییە. دواتر بارێك گەلاّمان لەسەر پشتی كەرێك دانا و رەفیقمان بە قەڕەوێڵەوە خستەسەر و رەوانەی قەرەچەتانمان كردەوە و دواتر چوومەوە بۆ لای مندالّەكان پێموتن: خۆتان ئامادە بكەن دەتابەمەوە بۆ یەلاّنقۆز و بڕۆنەوە بۆ سلێمانی، هەموویان رەش داگیرسابوون بە كیمیاییەكە! سەوزە و مندالّەكانم تا دەربەندی زێویێ برد و تەیارە بەسەر دەربەندەكەدا دەسووڕایەوە، لە دەربەنەكە بەجێمهێشتن و دەمەو ئێوارە چووبوون بۆ مالّی حاجی هیدایەت لە یەلاّنقۆز و گەڕابوونەوە بۆ سلێمانی. لە سلێمانییەوە دەرزی و دەرمانمان بۆ هات، چووینە ئەشكەوتی جۆلاّ و دەستمانكرد بە چارەسەركردنی برینادارەكان، پاش مانگێك مندالّەكان هاتنەوە بۆ زێویێ و مالّمان بردە كانی خەلیل، چونكە زێویێ بە هۆی كیمیاییەوە ژەهراوی ببوو.

رۆژێك زورار هات وتی: دەمەوێت بچم بۆ لای مالّی كاك ئەحمەد. منیش وتم: ئاژەلّێك بێنە بابچین، ئەوان لە بن كێلی وەیسی مالّیان دانابوو، چووین بۆ لایان ئەو نیوەڕۆیە یاپراخیان هەبوو نانمان لەوێ خوارد، كە هاتینەوە ئاژەلّەكە دوای ئێمە ملی رێگای گرتبوو چووبۆەوە گوندی قەرەچەتان، مالّی كاك ئەحمەد بۆی دەگەڕان بینیمن وتم: چییە؟ وتیان: ئاژەلّەكە دیار نەماوە. كاك ئەحمەد وتبووی: حەمەكەریم شەو هاتووە بردوویەتەوە! چۆن ئاژەلّ بۆ من دێنێت بە ئاسانی؟ منیش هەوالّم نارد بۆ قەرەچەتان وتم: ئەو ئاژەلّە بێننەوە وتیان: وا دەیهێنینەوە، كە بردمانەوە بۆ مالّی كاك ئەحمەد وتمان: سەری بڕن با ئەمجارەش نەڕوات.

کانی خەلیل دەکەوتەخوار گوندی زێوێوە کەپرمان کرد لەگەڵ جووتیاری ئامۆزام، هەرەوەزی قەرەچەتان هاتن دەستمانکرد بە شکاندنەوەی ترشەکان، ناودێی زێویٚ چۆڵکرا بوو بە زۆری چووبوونە نزیك نزرگەی پیرەمەگرون. سامی پێی باش نەبوو لەگەڵم بێت بۆ کانی خەلیل ئەویش چوو بۆ سەیرانگای پیرەمەگرون.

لە بەهاری ١٩٨٧ لە کانی خەلیل بووین لەپڕ کاك ستارمان بینی لە سمایل چەوێڵەوە بارە ماستی دەبرد بۆ یەلانقۆز و لەوێوە بۆ سلێمانی بۆ فرۆشتن، بەبەردەمی ئێمەدا تێدەپەڕی، ئێمەش زۆرمان حەز لە ماست بوو بە کاك ستارمان وت: جامیٚ ماستمان بۆ دابگرە. دەیووت: دەرگەی جەواڵەکەم دووریوە بۆم دەرنایات! ئەمجارە کە هاتمەوە بە تایبەتی بۆتان هەوێن دەکەم، نایخەمە جەواڵەکەوە لەسەر بارەکە دایدەنێم. کە دەهاتەوە دەیووت: بیرمچووە بۆ جارێکی تر! ؟ بەوجۆرە تا پاییز جامە ماستمان نەدی کاك ستار بۆمان بێنێت بە فرۆشتنیش! ؟ ئەم کاك ستارە کۆمەڵێك کەموکوڕی تری هەبوو، لە گوندەکە خەریکی پینەکردنی کەموکوڕییەکانی بوو کە وەك بەسەرهاتی خۆش دەیگێڕینەوە، مامۆستا محەمەد کوڕی مامۆستا مستەفا زۆر لە رووداوەکانی ئەم کاك ستارەی بۆم باسکردووە.

لە هاوینی١٩٨٧ لەگەڵ تیپی ٢٧ی تۆکمە پەڕیمەوە بۆ بەری قازان، چوومەوە گوندی قازان، شەو مامەوە لە ماڵی محەمەد عەلی ناسراو بوو بە حەمە بازیانی، ئامر کەرتی یەکێتی بوو، لەویٚ رابەری سەید براهیم کە سەرتیپی دەشتی کۆیە بوو بینیم، باسی چۆنیەتی وازهێنانم کرد لە حیزبی شیوعی، بۆ بەیانی لەگەڵ شەهید محەمەدی حاجی براهیمی سووسە کۆن چووم بۆ شیلەخان کە ماڵیان لەویٚ بوو،

نانی نیوەڕۆمان لەوێ خوارد و من رۆیشتم بۆ گوندی گەورەدێ و لەوێ چوومە ماڵی هاورێ سمکۆی برای شەهید خەباتە بچکۆل کە گوللەیەك بەر سەری کەوتبوو قسەی باش بۆ نەدەکرا، منیش لە کتێبەکەی شەعبان تاووسی کە باسی وەرزشەکانی یۆگای دەکرد خوێندبووەمەوە و پێموت: تۆ چای گوڵەباخ و ئاوی نەعنا و شلەمەنی بخۆ و واز لە خواردنی چەوری و گۆشتی ئاژەڵ بێنە و تەنها گۆشتی کەروێشك بخۆ، دوای ئەوەی هاتبوو بۆ زێوێ باش ببوو وتی: ئەو ڕێنماییانەی تۆم هەمووی جێبەجێکردووە و باش بووم. گەڕامەوە بۆ گولیجە و چوومە ماڵی مامۆستا کامەرانی حاجی عەلی و شادومانی برای، لەوێ رەحیمی کوڕم هاتبوو کۆمەڵێك کەلوپەلی هێنابوو بۆم کە لە چەرمەگاوە لە ماڵی محەمەد قادرەوە رەوانەیان کردبوو بۆ گولیجە بە تراکتۆری ئەوان، شەو لەگەڵ رەحیم لە ماڵی مامۆستا کامەران مامەوە، بۆ بەیانی رەحیمم ناردەوە و خۆم کەلوپەلەکانم بارکرد لە گوێدرێژێك کە پێشتر دابووم بە عاشووری مەلا سابیر لە زێوێوە خلیسکەی پێ بارکرد بوو بۆ یاران بەگی و لە باوەمەندان داینابوو، منیش لە کاتی گەڕانەوەم بۆ گولیجە چووم هێنامەوە و گەڕامەوە بۆ زێوێ. ئەم گوێدرێژەم لە سمایلی حەمە مراو وەرگرت کە ماڵی باری کردبوو لە زێوێوە بۆ سلێمانی و وتی: بۆ ئیشی خۆت بەکاری بێنە، سوودی زۆرم لێ بینی لە بارەدار و هێنانی کەلوپەل.

لە هاوینی ١٩٨٧ ئەبو سەلام چوو بوو بۆ لای مام جەلال، لە کاتی گەڕانەوەیدا نامەی مام جەلالی بۆ هەلۆ و حمەی تەیب هێنابوو کە بیپەڕێننەوە بۆ بەری قەرەداخ، میوانداریمکرد شەو لام مایەوە، منیش ئاژەڵێکم سەربڕیبوو میوانداری ئەو و هەلۆ و حمەی تەیبم کرد بۆ نیوەڕۆ. پاشان پەڕیتنەوە بۆ بەری قەرەداخ.

لە هاوینی ١٩٨٧ سەردانی قەرەچەتانم کرد، چوومە ماڵی پوورە فاتم کە حسەینی خاڵی هاتبوو بۆ ماڵیان و ئامۆزای خۆم بوو وتم: خێرە کاك حسەین لێرەیت؟! وتی: سەلاح هاتووە بووە بە پێشمەرگە، چاوی پێ نەکەوتبوو، لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە چووبوون بۆ بیران، دواتر دۆزییەوە و نەیهێشت ببێت بە پێشمەرگە.

لەوماوەیەدا لە گوندی زێویێ بووم کۆمەڵێك برادەری کۆمەڵە لەم گوندەدا دەژیان، رازی نەدەبوون خزمەتی سەربازی بۆ رژێمی عێراق بکەن و ئارەزووی بوون بە پێشمەرگەیان نەبوو، وەکو هێزی بەرگری مابوونەوە و هەموویان ئەندامی کۆمەڵە بوون، لەوانە دکتۆر نەورۆز، جەمالی مام صالح، دارا عومەر سام ئاغا، کە دەرچووی زانکۆ بوون، جەلالی حەمە نوقڵە، دلێر جەلال، یوسفی کتێبخانەی گشتی، یاسین و تەها کە کوڕی عەبدوڵلا بوون، جەمالی مەلا محەمەد و ئازادی برای و خەسرەوی پورزای و مولازم فوئاد، بەرزان عەبدوڵلا، عومەر عەلی، تەیفور حەمە خورشید، محەمەد حاجی عەبدولکەریم، عەلی مام ئەزوەر، حاکم سەروەر، رزگاری جەڕاح و غەفووری برای، شیروان عەبدول، کاکەسوور، سۆران و براهیم کە ئامۆزای شەهید مەلا خالید بوون، عەبدوڵلای حەمەسوور، ئەحمەدی حاجی قادر، شیروانی حاجی عەزیز، سۆرانی کەمال مەولوود، سەرهەد و سەروەری برای کە کوڕی تۆفیقی کەبابچی بوون، جەلالی قەصاب. کۆمەڵێك پێشمەرگە ماڵیان لەم گوندەبوو لەوانە کاك هەڵۆ کە سەرتیپ بوو لەگەڵ بەرزان و جەزای برای کە باوکیشیان ماڵی لەوێ بوو، کاك ئەحمەد کوردە، جووتیاری ئامۆزام، دکتۆر ئاسۆ و نوری جیهاز کە پێکەوە خانوویان کرد بوو. دکتۆر راپەڕ کوڕی عوسمان عوزێری بوو، حەمەی تەیب کە معاون سەرتیب بوو لەگەڵ ئاسۆی برای،

ئەیووب نەجم و سەعدی برای، مەلا خالید و عەزیزی برای و فایەقی ئامۆزای، فەرەج و کاروانە ریشە، وەستا لەتیف و برایەکی، وەستا فەرەج و بەکر و فایەق بیرانی و بەختیار، چەند کەسێکی تر بەداخەوە ناویان نازانم، بەداخەوە ئەم برادەرانە زۆربەیان شەهید بوون یان لە ژیاندا نەماون خوالێیان خۆش بێت.

لە هاوینی ١٩٨٧ لە کانی خەلیل بووین پێشمەرگەیەکی ناحاڵیم لێ پەیدابوو کە گوللە ئاربێجی شاردبووەوە لە کەڵەکی باخەکەی مندا بۆی نەدەدۆزرایەوە، بەهانەی بەمن دەگرت و دەیووت: ئەگەر نەیدۆزمەوە دەتکوژم و تۆ بردووتە! پاشان گەڕان دۆزییەوە و وازی لێ هێنام دواتر پێیوتم: کە کشتوکاڵت تەواو بوو دەبیت بە جاش! منیش هەر قسەی خۆشم بۆ دەکرد بۆ ئەوەی نەمکوژێت.

لە هاوینی ١٩٨٧ خەریکی شەنکردنی ترش بووم و قومری خێزانم بە کەو و بێژن خەریکی پاککردنی ترشەکە بوو، ئاردی ترشەکەمان لە دانەکەی جیادەکردەوە. خوالێخۆش بوو حاجی قادر سەردانی کردم وتی: ئەوە چی دەکەیت وا نابێت ئاردەکەی پارە باشتر دەکات! تۆ بۆ ئاردەکەی لێ جیادەکەیتەوە ئاردەکەی ترشی زۆرە!؟ ئەوسا زانیم چی لێبکەم، پێشتر ئاردەکەم لێ فڕێدەدا! ئەو ساڵە سەرمایەی باشی هەبوو توانیم خۆم و ماڵ و منداڵی پێ بەڕێ بکەم.

ڕۆژێك چەند برادەرێك میوانم بوون ئێمە بە کولەکە شفتەمان دروستکردبوو دەستیانکرد بە خواردنی، کە تێریانخوارد پێموتن: ئەوە شفتەی چییە؟ دکتۆر ئاسۆ وتی: ئەوە هی گۆشتی بەرخە!؟ منیش وتم: بە سەری باوکتان ئەوە شفتەی کولەکەیە!؟ وتیان: چۆن لە کولەکە شفتە دروستدەکرێت!؟ دەستیان کرد بە پێکەنین وتیان: ئەوە یەکەم جارە شتی وا ببینین.

لە پاییزی ١٩٨٧ جووتیار منی بەجێهێشت و چوو بۆ بەری سووسە کۆن، کاتی ئەنفالەکە لە عەوەڵان بوون تا ئەنفالکران.

لە زستانی ١٩٨٧ ئەبو سەلام لە کاتی گەڕانەوەی بۆ قەرەداخ سەردانی کردم چەند پێشمەرگەیەکی کورد و عەرەبی لەگەڵ بوو لەگەڵ ژنێك، شەو جێگایانم کردەوە ژنەکە وتی: من لەناو پیاواندا ناخەوم، منیش بردم بۆ ماڵی کاك هەڵۆ لەبەر ئەوەی ناودێ هیچ ماڵێکی لێنەمابوو، تەنها ماڵی من و کاك هەڵۆ نەبێت. کاك هەڵۆ ماڵەکەی بەجێهێشت چوو بۆ ناو پێشمەرگەکان و ژنەکەی لەگەڵ منداڵەکانی بەجێهێشت، بۆ بەیانی ژنەکە هاتەوە بۆ لامان بۆ دوای نیوەڕۆ بەڕێمکردن بۆ یەڵانقۆز.

لە هاوینی ١٩٨٧ ماڵم لە کانی خەلیل بوو، لەناو باخە ترشەکە کەپرێکی گەورەمان کردبوو، هەرچەندە مار و دووپشکی زۆر بوو، بەڵام چواردەوری کەپرەکەم کردبوو بە دیوار و دەرگایەکی بچووکم بۆ هێشتبووەوە بۆ هاتووچۆ و دیوارەکەم بە نایلۆن داپۆشیبوو، قوڕم بەسەریدا پەستکردبوو، لەژێر نایلۆنەکە هیچ شتێك نەدەهاتەناو کەپرەکەوە و ئەگەر بهاتایە لە ژێر نایلۆنەکە گیریدەخوارد و بۆ بەیانی دەمانکوشت و لەسەر نایلۆنەکەش دەخزی نەدەهات، شەو لەبەردەم دەرگاکەی کەوڵێکی ئاژەڵم دادەنا کە هیچ جانەوەرێك نەدەهات بە کەوڵەکەدا.

لە هاوینی ١٩٨٧ کابرایەك بە شووتییەکەوە سەرکەوت بۆ کانی خەلیل وتمان: بۆ لای ئێمە بهاتایە تێرمان شوتی دەخوارد. کابرا هات ئاوی خوارد و هەڵستا و ڕۆی بۆ زێوێ، پاش ماوەیەك گەڕایەوە، چونکە زێوێ چۆڵکرابوو، کە هاتەوە ئێوارە بوو سڵاوی کرد و وتی: ئەمشەو

جێگام بکەنەوە لاتان بم، ئێمەش بە خێرهاتنمان کرد، کاتی نانی ئێوارە بوو، بۆ شەو خۆی ناساند کە ناوی کاک حەمەئەمین بوو باوکی هاوڕێ سەروەر بوو کە پێشتر بە ئەڵغام قاچی شکابوو بردبوویان بۆ ئێران بۆ چارەسەرکردن، وتی: ئەم شووتییەم لە سلێمانییەوە هێناوە نایبەمەوە نسیبی ئێوەیە. سەروەری کوڕی هەواڵی ناردبوو پێشتر کە لە زێوێوە هاتبوو بۆ سەردانی، بەڵام ناردبوویان بۆ سەرگەڵوو لەوێوە بۆ ئێران، ئەم پیاوە کابرایەکی زۆر قسەخۆش بوو، بۆ بەیانی بەبێ شوتی گەڕایەوە بۆ سلێمانی. دواتر بە چەند شەوێك ئێوارەیەکی درەنگ بەرزانی کوڕی ئەحمەد کوردە کۆمەڵێك ژنی هێنابوو وتی: کاك کەریم ئەم ژنانە هاتوون بۆ لای کوڕەکانیان، بەڵام کوڕەکانیان لێرە نین با شەو لای ئێوە بمێننەوە، چونکە ئەوکاتە ماڵی کاك ئەحمەد لە شوێنێکی بەرز بوو وتبوویان ناتوانین سەرکەوین و کاك ئەحمەد ناردبوونی بۆ ماڵی ئێمە.

شەو لەناو کەپرەکە نووستن و من و کوڕەکانم لە دەرەوەی کەپرەکە نووستین، شەو هاواریان لێ بەرزبووەوە و یەکێکیان وتی: بابەڕۆ پێوەی دام، ئێمەش گڕی چراکەمان زیاد کرد بۆ ئەوەی بزانین چییە؟! لەوکاتەدا ژنێکی تریش هاواری لێهەڵستا وتی: دای بە منیشەوە! ئێمەش بە لایت دەگەڕاین بزانین چییە، قومری خێزانم هاواری کرد وتی: دای بە منیشەوە، کاتێك دۆزیمانەوە هەزار پێیەکی گەورە بوو کوشتمان. بە هاوار هاواری ژنەکان شەو کەس نەخەوت، بە لاوانەوە گۆرانییان بۆ کوڕەکانیان دەوت و دەیانوت: کۆڵ بە کۆڵم کرد بە دواتەوە شاخە و شاخ تا مار و دووپشکە پێوەی دام! بۆ بەیانی کاك ئەحمەد کوردە خوالێیخۆش بێت هات بۆ لامان وتی: چی بووە، وەزعەکەمان بۆ باس کرد وتی: بە خوا حەمەکەریم خۆت ئەو هەزار پێیەت خستۆتە ناویان بۆ ئەوەی تەماشایان بکەیت!؟!

لە پاییزی ساڵی ١٩٨٧ دارای برای کوێخا جەمال و یاسینی حاجی عەلی سەیدزادە لە گوندی زێویێ سەردانیان کردم، هەردووکیان پێشمەرگەی یەکێتی بوون لە تیپی ٢٣ی سووورداش، لەوکاتەدا زۆربەی پیاوماقوڵی چەرمەگا بە بەندی هێنابوویانن بۆ زێویێ کە بریتی بوون لە کوێخا جەمال و حاجی محەمەد قادر و ڕەشید سەیدزادە، بە کاك هەڵۆم وت: با بێن بۆ ماڵی ئێمە بۆ پشوودان، پێمووتن: دێم دەبم بە کەفیلتان بۆ ئەوەی ئازاد بکرێن، بەڵام کاك ڕەشید وتی: تۆ خۆت بە ئێمەوە ماندوو مەکە، چونکە ئێمە ئازاد دەبین و بڕیارمانداوە چەك هەڵبگرین بۆ ڕژێم با بەهۆی ئێمەوە تووشی کێشە نەبیت!؟ منیش ئەو وتانەی کاك ڕەشیدم پێ باش بوو کە بێ ترس وتی: ئێمە دەبین بە پیاوی ڕژێم و چیمان لێ دەکەن خۆ نامانکوژن! دوای دوو ڕۆژ ئازادکران و چوونەوە بۆ چەرمەگا و بوون بە پیاوی ڕژێم، بەڵام زۆریان پەیوەندییان بە شۆڕشەوە هەبوو.

دوای شەڕی چەرمەگا لە مانگی ١٢ی ١٩٨٧ تەیارە بۆردومانی زێویێی کرد، ئەو خانووەی پێشتر تێیدابووم تەختی زەوی بوو! دوو ژن میوانم بوون بە ناوی ئایشەی عەلی سوور و کافیەی کاکەمەند کە خزمی خۆم بوون، وامزانی خانووەکە بەسەریاندا رووخاوە، چونکە من لە بارەگای تیپی ٢٣ بووم کە هاتمەدەرەوە ئەوانم دی بەرەوخوار دەڕۆیشتن هاتبوون نامەیان بۆ بنووسم بۆ تەکیە و بەلەکجار بۆ ئەوەی کوڕەکانیان بەر بدەن، منیش کانی خەلیل و زێویێم بەجێهێشت چووم بۆ گوندی قەرەچەتان. ماڵم لەوێ دانا.

وەزع لە قەرەچەتان زۆر ناخۆش بوو هەموو ڕۆژێك تۆپباران بوو بە شەو پاسەوانیمان دەکرد، شەوێك غەریب عەسکەری هات لێمانڕاخوری

و چواردەورمانگرتن و پێمانووتن: چەکبن! کە دەرکەوت کاك غەریبە زۆری پێخۆش بوو، قەرەچەتان نزیکی قەڵای سووسێ بوو، ئێمە بەوشێوەیە بەرگری دەکەین و ناهێڵێن بە ئاسانی رژێم بێتە گوندەکە.

رۆژێك تۆپبارانکرا بە دەبابە حەلاوەخانی کچی حمەعلی شەهید بوو، چوومە ماڵی کەریمی حەمە علی کە لە تەنیشتی مزگەوتەکە بوو، دراوسێی ماڵی پورە فاتە بوو. لەو سەردەمەدا گوندی قەرەچەتان چۆڵ بوو تەنها ئەو کەسانەی تێدا مابوو کە نەیاری رژێم بوون. لەو خانووەدا هەیوانێکی تێدابوو بە نایلۆن بەری هەیوانەکەمان گرتبوو، چۆلەکە بە پۆلی گەورە دەهاتن خۆیان دەکرد بە هەیوانەکەدا و من و قومری خێزانم دەرگای هەیوانەکەمان دادەخست و دەکەوتینە چۆلەکە گرتن، هەندێکجار زیاتر لە ١٠٠ چۆلەکە دەبوون، هەموویمان لە کانییەکەی لای خۆمان بە جارێك پاکدەکرد، ژنانی گوندەکە دەیانوت: ئەو هەموو گۆشتەتان لە کوێ بوو، ئەویش دەیووت: چۆلەکەیە گرتوومانە، زۆربەی ئەو کاتەمان بە خواردنی چۆلەکە بەڕێدەکرد، تا خێزانم چووەوە بۆ سلێمانی.

دوای مانگێك سوپای رژێم بە پاڵپشتی جاش و تانك و شۆفڵ هات بۆ کاولکردنی گوندەکە، من لە ماڵەوە بووم بەیانی زوو بوو پوورە فاتە هات وتی: سەرت لە قوڕنێیت وا دەبابە گەیشتە ناودێ چی دەکەیت لە ماڵەوە!؟ منیش خۆم و تفەنگەکەم رامکرد بۆ ناو رەشکی، چونکە هەرکەس ناو رەشکی بگرتایە سەرکەوتوو دەبوو، کە چووم لەوێ چەند برادەرێکی چەکداری لێبوو دامەزرابوون بۆ شەڕ و شەڕ دەستیپێکرد. جاش لە وشکەخڕەوە دزەی کردبوو بۆ ناو رەشکی و تا نزیك ماڵی نەجم ئەحمەد هاتبوون، ئێمە نەمانزانی بوو دیار بوو کە جاشەکان شارەزابوون

خەڵکی قەرەچەتانیان لەگەڵدا بوو، ئێمە بۆ پێشەوە دەمانڕوانی و بەرگری باشمان کرد لای بەرئەشکەوتان، کاتێکمان زانی دەبابە و شۆفڵ گەیشتە ناودێ و جاشەکان هێرشیانکرد شەڕێکی دەستەویەخە روویدا، من و فوادی شەهید حمەسوور و حمەی حمەئەمینی مام صالّح لەسەر بەردێکی گەورەبووین کە وەك رەبایە وابوو بەرگریمان دەکرد بۆ پێشەوە، لەناو رەشکی لە هەموو لایەکەوە تەقە بوو کەس نەیدەزانی کێیە، جاشە یان پێشمەرگە؟! لە پڕ کاك هەڵۆ و مەفرەزەیەکمان بینی لەسەرەوە هاتن لە خڕی زێوێوە بەرەو کانی بلوسك، ئێمە وامانزانی جاشن، بەڵام ئەوان ئێمەیان ناسی هاواریان کرد ئێمە پێشمەرگەین تەقەمان لێمەکەن. منیش وتم: وەرن بۆ ئێرە هەر ئێمەین کەسی لێ نییە، لە پڕ هێزێکی زۆری پێشمەرگە لە چەند لایەکەوە هاتن سابیر کۆکەیی و فوادی ئەحمەدی ئەوڵا و صەباحەڕەش و کاروانەڕیشە و هاوڕێ کاوە هاتن تا دەهات شەڕ گەرم بوو، ئەوەی جێگەی وتنە ئەوەیە کاك ئەحمەد عەبدوڵڵا شەڕێکی باشی کردبوو کە بڕنەوێکی وەسەتی باشی پێبوو نەیهێشتبوو لە بەردی نوختەکەوە جاش سەر دەربێنێت، جاشەکان شکان بەرەو جادە رۆیشتن، بەڵام هەندێکیان سەریان لێشێوا خۆیان کرد بە کونە کارێزەکەدا، چونکە رێگای دەرچوونیان نەمابوو.

کوڕی مستەشارێك بە دوای ئەو جاشانەدا دەگەڕا کە خۆیان حەشار دابوو، دەگەڕایەوە بۆ ناودێ نزیکی پێشمەرگە ببووەوە و دەستکرایەوە بە تەقە و کوژرا. تەرمەکەی بە جێما و دەستی پێشمەرگە کەوت، کە هاتینە ناودێ بەشێك لە ماڵەکانی گوندەکە رووخابوو بە شۆفڵ و دەبابە یەکێك لەو ماڵانە ماڵەکەی من بوو، تەختی زەوی کرابوو، بەداخەوە کتێبێکم لەسەر گوندی قەرەچەتان نووسیبوو لەگەڵ چەند

كتێبێكی تر سووتابوو! چەند رۆژێك لەوەودوا لە بازگەی قەرەچەتان ئەوەی تەسكەرەكەی قەرەچەتان بووایە دەیانگرت و پێیاندەووت: برۆ ئەو تەرمەمان بۆ بهێننەوە، لەو گیراوانە محەمەد رەحمان بوو لە رێگەی شێخ رەئوفی سووسێوە پەیوەندییان كرد، رێكەوتن بە بەردانی قەرەچەتانییەكان بەرامبەری ناردنەوەی تەرمەكە، دواتر گەڕامەوە بۆ زێویێ و لە لایەن كاك فازیلەوە بێخەف و بەتانیم پەیداكرد و گەڕامەوە بۆ قەرەچەتان، چوومە ئەشكەوتی زێرین لەگەڵ كۆمەڵێك ماڵی قەرەچەتانیدا دەستمانكرد بە دروستكردنی خانوویەك بۆ من و رەفیقی مام رەئوف و شەهید ئازادی حەمە سوور و عەبدولی مام پیرۆت، دواتر خێزانم هاتە لام و كەلوپەل و خواردنی بۆ هێنام، لە كاتی هێنانی كەلوپەلدا سەگێكمان هەبوو پەلاماری قومری خێزانمی دا، بەڵام لەبەر ئەوەی جلی زۆری لەبەردابوو كاریگەری نەبوو.

لە مانگی ١٢ی ١٩٨٧ كاك فەرەیدون عەبدولقادر نامەیەكی بە هیوای كۆمەڵایەتیدا بۆ ناردم كە بچم بۆ لای، كە چووم بۆ چۆخماخ لەگەڵ یوسفی مام عومەر و شەهید ئازاد ئێوارە بوو، چاوم بە سامی حەرەكات كەوت زۆر هەوڵیدا لایان بمێنمەوە، شەو لایان ماینەوە بۆ بەیانی چووین بۆ بارەگای كاك نەوشیروان و كاك فەرەیدون، لەوێ سەید مەحمودی گەلاڵەی لێبوو پێیانوتم: دەچیت بۆ لای كێ؟ وتم: كاك فەرەیدون نامەی بۆ ناردووم كە پێیانووتبوو وتبوی: با بێت بۆ ماڵەوە. چووین بۆ ماڵی كاك فەرەیدون زۆر رێزی لێگرتین بە پاكیزەخانی خێزانی وت: من لەگەڵ دكتۆر مەحمود دەچم بۆ لای كۆمەڵەی ئێران ئاگات لەو میوانانە بێت، تا شەو كەس نەهات بە لامانەوە، پاكیزەخان ئاگای لە ئێمە نەمابوو كە میوانیانین، كاتێك شەو درەنگ بوو كاك فەرەیدون

هاتەوە زۆری پێناخۆش بوو زۆر داوای لێبووردنی لێکردین کە ئێمە بێ ئەو بێ خزمەت بووین، دواتر دەستیانکرد بە گۆشت برژاندن بۆمان.

پاشان دەستمانکرد بە گفتوگۆ و باسی شەڕی چەرمەگامان کرد وتی: ئێمە ئەو شەڕەمان بە راست زانیوە. منیش وتم: کۆمەڵێك جووتیاری قەرەچەتانتان گرتووە راست نییە، ئەوان بۆ تۆوکردن چوون جاش نەبوون. وتم: حاجی محەمەد چوار کوڕی کوژراوە من دەزانم کە دووانیان پەیوەندی هەبووە کە رۆژی پێشوو کەلوپەلی بۆ من هێناوە بۆ کولیجە بە رەحیمی کوڕمدا بە تەراکتۆری خۆیان و مامۆستا کامەران ئاگادارە. وتی: راست دەکەیت زۆری بێ تاوان پێوە بووە، ئەویش ئەنجامی شەڕە. رێکەوتین لەسەر ئەوەی نامەم بۆ بنووسێت بۆ مەڵبەندی یەك بۆ بەردانی سەیارە و تەراکتۆر و ئەو کەسانەی من ناوم هێنابوون بۆ ئەوەی سزایان نەدەن بە پارە، دوای گفتوگۆ یوسفم لەگەڵ بوو بەبێ چەك، چەکێکی پێشکەش کردبوو، بۆ بەیانی چۆخماخمان بەجێهێشت گەڕاینەوە بۆ ئەشکەوتی زێڕین.

لە مانگی ١ی ١٩٨٨ باوکم مرد، من لە بناری پیرەمەگرون بووم نەمتوانی لە پرسەکەی ئامادەبم، کۆمەڵێك خەڵك هاتن بۆ لام بەمەبەستی سەرەخۆشی، هەندێك لە خزمەکانم گلەییان بۆ دەناردم دەیانووت: وەرەقەی مستەشاری بۆ دەکەین لای عومەری حمە علی کە سەرۆك جاش بوو دۆستایەنی لەگەڵمان هەبوو، منیش ئەوەم بە دڵ نەبوو.

دوای مردنی باوکم کە ساڵی ١٩٨٨ بوو ناخۆشترین ساڵ بوو لە ژیانمدا، چونکە رژێمی رەفتارفاشستی بەعس بە درندانەترین شێوە پەلاماری گەلی کوردی دەدا بە چەکی کیمیایی و خاپورکردن و سووتاندنی گوندەکان و راپێچکردنی گوندنشینان لە ئۆردوگا

زۆرەملێكاندا و شالآوی ئەنفال كە بە هەشت قۆناخ بەڕێوەچوو. قۆناخی یەك دۆڵی جافایەتی و بنگرد و ماوەتی گرتەوە و بە دوایدا قەرەداغ و گەرمیان و دواتر دەشتی كۆیە و تەقتەق، كە بە قۆناخی هەشت كۆتایی هات لە ناوچەی بادینان.

لەوكاتەی دۆڵی جافایەتی بەرشالآوی ئەنفال و كیمیایی كەوت، من لە گوندی چۆخماخ بووم، رژێم بە راجیمە كیمیاییبارانی گوندەكانی گوێزیلە و هەڵەدن و یاخسەمەر و مالومە و سەرگەڵو و چۆخماخ و سێكانیان و گوندەكانی دەوروبەری كرد، كە بوو بەهۆی شەهیدبوون و برینداربوونی زۆربەی دانیشتوانی ئەم گوندانە، بەهۆیەوە دانیشتوانی ئەم گوندانە دەربەدەری ئێران بوون و ملك و ماڵ و ئاژەڵیان بەجێهێشت و لە كاتی چوونیان بۆ ئێران زۆر كارەساتبار بوو، چونكە بەفرێكی زۆر لە كوێستانەكانی ئەو ناوچەیە باریبوو، بوو بەهۆی رەقبوونەوەی بەشێكیان. دەمەوێت ئەوە بڵێم كە كاك نەوشیروان نزیكەی ٥٠ پێشمەرگەی تەرخان كردبوو بۆ كردنەوەی رێگاكان، بەڵام بەفرەكە ئەوەندە زۆر بوو، بە رۆژ رێگا دەكرایەوە و شەو رێگا نەدەما لەبەر بەفربارینی زۆر! رژێم شالآوی هێنا لە چەند قۆڵێكەوە، لە كارێزە و قەیوانەوە تا مەرگە و بنگرد لە هەموو لایەكەوە شالآو دەستپێكرد، ئەوەی جێگای ئاماژەیە ئەوەیە یەكێتی نیشتمانی بڕیارێكی شۆڕشگێڕانەی دەركرد بۆ ئەو ناوچانە كە خۆیان دەرباز بكەن لەو شالآوە، ئەوەی دەچێت بۆ ئێران با بڕوات و ئەوەی دەچێتەوە بۆ شارەكان با بڕوات، ئەمە بوو بەهۆی ئەوەی ئەم شالآوە زیانی گیانی كەم بوو كە كەس بە زیندوویی دەست رژێم نەكەوت. تەنها لە گوندی مالومە نەبێت كە بەڕێزێكیان بە ناوی عوسمان مستەفا بە هەڵە دەست رژێم

کەوتبوو، بوو بەهۆی بێ سەر و شوێنبوونی، جاشەکانی ئەو سەردەمە باسی ئازایەتی ئەم پیاوە دەکەن وتبوی: من فەرماندەی ئەم ناوچەیەم ئێوە ئەگەر کیمیاییتان نەبووایە نەتاندەتوانی ئەم ناوچەیە بە ئێمە چۆڵ بکەن! زۆربەی ئەو کەسانەی کە بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتن دوای چوونیان بۆ ئێران گەڕابوونەوە.

لە مانگی ٢ ی ١٩٨٨ ئازوقەیەکی زۆرم کڕیبوو بۆ میوانخانەکەی قزلەر، چاوەڕێ بووم رەوانەی بکەم. کوڕێکی وەستا صدیقی بیسکەنی هات بۆ لام بۆ بارکرنی ئازوقەکان و بردی بۆ قزلەر، پێیوتم: باوکم بە تەنیا لە بیسکەندی ماوەتەوە بەشکو بچیت رازی بکەیت کە بێت لەگەڵتان بۆ سەرکردایەتی، منیش لەگەڵ کاك فازیل چووین بۆ لای وەستا صدیق خوا لێیخۆش بێ بە هێسترەکانی بارەگای تیپی ٢٧ی تۆکمە، کە گەیشتین پشیلەی گوندەکەی لێکۆبووبووەوە تەنها خۆی بوو، زۆر هەوڵماندا لەگەڵی لەگەڵمان نەهات گەڕاینەوە بۆ زێویێ. من گەڕامەوە بۆ ئەشکەوتی زێڕین، پاش چەند رۆژێك کاك هەڵۆ هەواڵی بۆ ناردم چووم بۆ زێویێ پێیوتم: دەچین بۆ سەرگەڵو خۆت ئامادە بکە، کە گەڕامەوە بۆ ئەشکەوتی زێڕین کۆبوونەوەم بە هەموو خزمەکان کرد پێموتن: ئەوەی دەڕوات دەبێت بە جاش با بڕوات، ئەوەی دەبێت بە پێشمەرگە با لەگەڵ من بێت، ئاژەڵەکانتان بفرۆشن با لەناو نەچن، لەوکاتەدا حەمەی حاجی کەریم هات، وتم: ئێمە ئەڕۆین تۆ تازە دێیت! وەرە خانوەکەی من و خانوو دروست مەکە بۆ تۆ ئێمە دەڕۆین. پاش هەفتەیەك کاك هەڵۆ لە دەربەندی زێویێ چاوەرێی دەکردم لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگەی ئازا و لەخۆبردووی وەکو مام رۆستەمی قولەرەیسی و بەکر دارتوویی و سەردار و رزگار و نەبەز و مام تەها و

کوڕەکەی. من و ڕەفیقی مام ڕەئوف و شەهید ئازاد و عەبدولکەریم پیرۆت ئەشکەوتی زێڕینمان بەجێهێشت، چووین بۆ دەربەندی زێویێ، گەڕاینەوە بۆ زێویێ و شەو ماینەوە چاوەڕێی بڕزووی حاجی چراخی چەرمەگامان دەکرد، کە نەهات زێوێمان بەجێهێشت چووین بەرەو قزلەر لە میوانخانەکەی قزلەر نانمانخوارد، کاک هەڵۆ بەپەلە بوو کاک نەوشیروان ناردبووی بە شوێنیدا بەسەر پێوە نانی خوارد و ئێمەی بەجێهێشت وتی: ئێوە بە شێنەیی وەرن، حاجی مەحمودی گەلاڵە لێپرسراوی میوانخانەکە بوو. دوای پشوو و نانخواردن چووین بۆ چۆخماخ و لای سامی حەرەکات شەو ماینەوە، ئەو شەوە ٤٠ گوللە راجیمەی کیمیایی بۆردومانی گوندەکانی چۆخماخ و یاخسەمەر و هەڵەدن و گوێزیلە کرابوو، ئێمە ئاگامان لێی نەبوو، چونکە جێگاکەمان باش بوو، بەڕێکەوتین بۆ سەرگەڵو، لە ڕێگا وەزعی ئەو خەڵکە هەژارەمان بینی کە بەرچەکی کیمیایی کەوتبوون، کە گەیشتینە خوار سەرگەڵو مولازم عومەر و شێخ جەعفەرمان بینی وتیان: خێرە هاتووی! ؟ وتم: لەگەڵ کاک هەڵۆ هاتووم وەزع خراپە دەمەوێت بەشداری ئەو شەڕە بکەم. وتی: بچۆ بۆ لای کاک نەوشیروان لە سەرگەڵو قسەی لەگەڵ بکە. کاک نەوشیروان وتی: ئێوە بڕۆن بۆ زەڵێ با کاک هەڵۆ لێرە بمێنێت.

کاک هەڵۆ خواحافیزەی لێکردین و وتی: ئێوە بڕۆن من سەرپەرشتی ئەو جەبهەیە دەکەم لە دابان هەلاج، چونکە ڕژێم شالاو دێنێت. کاک نەوشیروان نامەی بۆ نووسیم بۆ مامۆستا نازم میوانخانەکەی زەڵێ وەرگرم کە قادر خەبات لە میوانخانەکە نامێنێت و دەچێت بۆ هەڵەبجە بۆ جەبهە، نامەیەکی تری بۆ نووسیم بۆ عەبدولکەریم هەڵەدنی کە بە کۆپتەری ئێرانی ڕەوانەمان بکات بۆ شانەخسێ، بۆ بەیانی چووین

بۆ کەرکەر، لە رێگا وتیان: شەهید یاسین کوڕی رەحمانی حاجی عەزیزی حاجیتان بەرکیمیایی کەوتووە و شەهید بووە، کە چووینە کەرکەر عەبدولکەریم هەڵەدنی لەوێ بوو، هەلیکۆپتەر بە شلیف مەسینەی پێبوو هات بۆ کەرکەر، ئێمەی سوارکرد و بردینی بۆ شانەخسێ، کە دابەزین لەوێ پردەکە ئاو بردبووی، نزیکەی مانگێك لەوێ بووین لە بارەگای تیپی ٣٣ ماینەوە.

دواتر کاك هەڵۆ هات بۆ شانەخسێ خزمەکانم بەجێیانهێشتم و لەگەڵ غەریب عەسکەری چوونەوە بۆ خوارەوە وتم: مەڕۆنەوە تیادەچن بە قسەیان نەکردم! وتیان: تۆ منداڵەکانت لە سلێمانییە ئێمەش کەسوکارمان لە قەرەچەتانە. پێموتن: خزمان هیچیان لەوێ نەماون، بەڵام هەر رۆیشتن، بەداخەوە کە شەهید ئازاد بەوهۆیەوە ئەنفالکرا و رەفیق و عەبدولکەریمیش تەسلیمی رژێم بوونەوە. دوایی کاك هەڵۆ پێیووتم: تۆ کەسایەتی خۆتت هەیە ئەوانی لێبن یان نا.

لە ١٥ی ٣ی ١٩٨٨ لەگەڵ کاك هەڵۆ و چەند برادەرێك چووین بۆ بانە لە گوندی کانی سوور، شەو ماینەوە لە مزگەوتی گوندەکە، بۆ بەیانی چووین بەرەو قاسمەڕەش و سەردەشت، شەو لە سەردەشت لە ئوتێل ماینەوە، بۆ بەیانی کاك هەڵۆ نەخۆش بوو قادری حاجی عەلی سەردانی کردین، ئەو رۆژە رژێم هەڵەبجە و شانەخسێی کیمیاییباران کردبوو، ئێمە دوو رۆژ لە سەردەشت ماینەوە، دواتر چووین بۆ زەڵێ، لەوێ بارەگای قادر خەباتمان وەرگرت و لەوێ ماینەوە کە من لێپرسراوی میوانخانەکە بووم.

رۆژێك دوای ئێمە كە چووین بۆ كانی سوور، گوندی شانەخسێ بە تەیارە كیمیاییباران كرا، بوو بەهۆی شەهیدبوونی شێخ عەزیزی شێخ یوسفی شەدەڵە، ئاسۆی شێخ نوری كە فەرماندەی كەرت بوو، دكتۆر كاوە، محەمەد ئەمینی خەجێ و كۆمەڵێكی تر كە ناویان نازانم.

رۆژێك نەوزادی نوری بەگ لەگەڵ شێخ جەمالی موزیع هات چەكیان پێنەبوو، لەوێ دوو چەكم داپێیان چەند رۆژێك لەوێ بوون تا ئیشی خۆیان جێبەجێكرد دواتر هاتنەوە چەكەكانیان دانا و چوونەوە بۆ ئێران، ئەو برادەرانەی ئەوێ زۆریان پێناخۆش بوو كە چەكم داوە پێیان، چونكە دەبووایە كاك هەڵۆ رازی بێت، كە كاك هەڵۆ هات وتم: كارێكی وامكردووە ئەگەر فەوتا خۆم دەیبژێرم، كاك هەڵۆ وتی: هەموو بارەگاكە لەناوبەریت ناڵێم بۆ واتكرد.

ئەفسەرێكی ناحاڵی لێبوو ناوی سەربەست بوو خەڵكی كەركوك بوو، دەستیدایە چەك لێم و دەیووت: من ئەفسەرم چۆن پاسەوانی بۆ من دەردەكەیت! وایدەزانی لە سوپای عێراقدایە، دواتر كاك هەڵۆ پێیووت: تۆ بە كەڵكی پێشمەرگایەتی نایەیت، برۆ دەچیت بۆ كوێ بچۆ، ئەویش لەگەڵ منداڵەكانی چوو بۆ ئێران و ئێمەی بەجێهێشت.

لە مانگی ٥ی ١٩٨٨ بەهادین نوری و سامانی برازای هاتن بۆ زەڵێ، ئەوكاتە لێپرسراوی میوانخانەكە بووم زۆر یارمەتیمدان بە دابینكردنی خێمە و كەلوپەل تا كاری خۆیان تەواو كرد، كە بەرگەیان كرد بۆیان هاتنەوە كەلوپەلەكانیان دانا و چوون بۆ سەقز.

لە مانگی ٥ ی ١٩٨٨ لەبەر ئەوەی زەڵێ گەرم بوو بارەگامان بردە بەری تووژەڵە، لەوێ ترشۆكەی باشی لێبوو، لەگەڵ كولەكە دەمانكرد بە شلە. لەسەر شاخی مامەندەوە رژێم بە دۆشكە تەقەی

لێدەکردین دوایی هاتینەخوارەوە بەرەو نۆکان و خێمەمان هەڵدا. پاش ماوەیەك لەوێ بووین رەمەزان کەرکوکی هات بۆ لام وتی: چۆن منداڵەکانمان بێنین؟ وتم: دەچین بۆ لای حیزبی دیموکرات لە ناوچەی سەردەشت بزانین منداڵەکانمان بۆ دێنن. کە چووین فەتاحی حەسەن پوری لێبوو زۆر رێزی لێگرتین، بەڵام رازی نەبوو منداڵەکانمان بۆ بێنێت بۆ شێنێ، دیاربوو ئەوان بە فەرمانی یەکێتی ماڵ و منداڵیان دەهێنا، سەرکردایەتی یەکێتی نامەیان بۆ هەموو کەسێك نەدەنووسی بۆ هێنانی ماڵ و منداڵیان. من و رەمەزان بەرەو سوورەدێ رۆیشتین لە بناری قەندیل لە ئاستی رەزکە و مارەدوو، شوێنێك بوو کە تەڕایی لێبوو ژمارەیەکی زۆر کوللەی لێبوو، دەبووایە ماوەیەك رابکەین بەناو کوللەکاندا بۆ ئەوەی زیانمان پێنەگەیەنن، من زووتر رامکرد ١٠ دەقە کوللەم لەخۆدەکردەوە، بەڵام ڕەمەزان نەیتوانیبوو رابکات پەلوپۆی شکابوو، خەریك بوو بکەوێت چووم رامکێشا و رزگارم کرد لە کوللەکان، ئەو ناوە گەڵای بە دارەوە نەمابوو کوللەکان هەموویان خواردبوو! دواتر پێشئەوەی بگەینە سوورەدێ کاك هەڵۆمان بینی وتی: بۆ چەکت پێ نییە؟! وتم: ئەمەوێت منداڵەکانم بۆ بێنن، دەچم بۆ سوورەدێ. کاك هەڵۆ زۆری پێناخۆش بوو، چونکە دەیویست لای ئەو بم نەچم بە شوێن منداڵەکانمدا، بەڵام من سوور بووم لەسەر هێنانی منداڵەکان، بۆیە رۆیشتین بۆ سوورەدێ چووینە بارەگای عەلی مام حسەین کە سەر تیبی قەندیل بوو. لەوێ زۆر ماینەوە تا مانگی ٦ماڵێکمان دۆزییەوە نانی بۆ دەکردین وەکو بارەگا. زۆر هەوڵماندا کەسێك بدۆزینەوە بۆ ئەوەی منداڵەکانمان بۆ بێنێت، برایەکی عەلی مام حسەین وەعدی دا بچێت بە شوێن منداڵەکانمدا، بەڵام نەچوو، پێیانووتین مام قادر هەیە ئەوکارە

دەکات پێیبلێن. چووین دۆزیمانەوە کە پیاوێکی بەساڵاچوو بوو پێمانوت و لەگەڵی رێککەوتین کە بچێت بە شوێن منداڵەکانماندا لە بەرامبەردا ٥٠٠ دیناری بدەینێ. عینوانیماڵی ئێمەمان دایە و نامەمان بۆ ماڵی رەمـەزان نووسی بوو کە قومری خێزانم بیبات بۆ کەرکوك، پیاوانە چـوو بـوو بـۆ ماڵی ئێمە و قومری خێزانم بە تەنیا نامەکەی برد بوو بۆ کـەرکـوك و لـە رێگەی دوکانی براکەی رەمەزانەوە ماڵەکەیـانـی دۆزیـبـووەوە، کـاتـێـك چووبووە دوکانەکە کۆمەڵێك ئەمن و ئـیـسـتـخـبـاراتـی لـێـبـوو، خـۆی تێکنەدابوو مامەڵەی کـراسـی کـردبـوو، دوای ئـەوەی پـیـاوانـی رژێـم رۆیشتبوون گفتوگۆی دەربارەی ماڵی رەمەزانی برای کردبـوو لـەگـەڵـی. ژنەکەی رەمەزان و دوو منداڵەکەی هێنابوو بۆ ماڵی خۆمان، مامە قالەش هاتبوو وتبوی: خۆتان ئامادە بکەن دێم دەڕۆین. مامەقالە ماڵی ئێـمـە و رەمەزانی هێنا بۆ سوورەدێ، لە پێشدا هاتبوون بۆ سـەنـگـەسـەر لـەوێ جێبێکی گرتبوو بۆ سوورەدێ، لە کونەکۆتر بازگەیەکی رژێـمـی لـێـبـوو نەیهێشتبوو بێن، دوایی بە رێگەی قاچاخدا بەپێ هاتبوون بۆ کونەکۆتـر، لەوێ جێبەکە بە بەتاڵی چاوەڕێی کردبوون و بۆ ئێـوارە گـەیشـتـبـوونـە سوورەدێ. رەحیمی کوڕم جامانەیەکی بە سەرەوە بوو بە نیاز بوو بـێـت بۆ پێشمەرگایەتی تەمەنـی ١٥ سـاڵ بـوو، کـاتـێـك ئـێـمـە لـەوپـەڕی ناخۆشیدابووین، ئەو شەوە لە بارەگای حیزبی دیموکرات خەوتـیـن، هـەر چۆنێك بێت تێمگەیاند باشترە بچێتەوە بۆ سلێمـانـی یـان چـەمچـەمـاڵ خوێندن تەواو بکات. پێم باش بوو سەری تیابچێت بەس خوێنـدن تـەواو بکات. پێمان باش بوو بچێت بۆ ماڵی خاڵە عەلی لـە چـەمچـەمـاڵ لـەوێ بخوێنێت، بۆ بەیانی رەحیممان بەڕێکرد بەبێ جامانە بـۆ سـلـێـمـانـی و ئێمەش ولاخمان گرت بەرەو قەندیل کەوتینەڕێ. کە دنیا رووناك بـووەوە

چووینە دامێنی شاخی قەندیل پێیاندەووت کۆڵتی سویێ، منداڵەکانم وردبوون نەمدەزانی چۆن سواری وڵاخیان بکەم، پەری و صاڵح سواری وڵاخێك بوون و خێزانم و کوێستانی کچم سواری وڵاخێکی تر بوون، منیش کەژانم دا بە شانمدا و رۆشتین، چونکە هەوراز بوو نەیدەتوانی خۆی بگرێت بەربووەوە و بە پێ رۆیشت، لەبەر ئەوەی پێڵاوەکانی خراپ بوو فرێی دا و بە پێخاوسی رۆیشت، زۆر کەسمان بینی بە سواری وڵاخ بەربووەوە و خلدەبوونەوە بۆ ناو ئاوەکە و دیار نەدەمان! بە کوێستانم وت: خێرا برۆ با وات لێنەیەت، ئەویش بە پێخاوسی لە ترسا خێرا دەڕۆی، منیش دەبووایە دەستێکم بە صاڵح و پەرییەوە بێت و دەستێکی ترم بە کەژان و دایکییەوە بێت، تا قەندیلمان بڕی، پێشئەوەی بگەینە سەرەوەی قەندیل کاروانچییەك کەژانی لێوەرگرتم بردی لەسەر شاخ بۆی دانام، تا سەرکەوتین لەسەر بەفرەکە کەژانی دانابوو، لەسەرەوە بەفر بوو دەبووایە لەسەر بەفرەکە بەخلیسکێنە برۆینەخوارەوە، چونکە سەرەوخوارییەکەی وەهابوو کەس بەسەر وڵاخەوە خۆی نەدەگرت، کاروانچییەکان لە پێش ئێمەوە وڵاخەکانیان برد بۆ خوارەوە و لەوێ چاوەڕێیان کردین، ئێمەش بە خلیسکێنە وردە وردە چووین بۆ لای کاروانچییەکان. بەفر شاخەکەی داپۆشیبوو، لەژێر بەفرەکە هاژەی ئاو بوو لە ژێرمانەوە دەڕۆیشت، زۆر سامناك بوو! ئەم خلیسکێنەیە زۆر دوور و درێژ بوو نزیکەی کاتژمێرێك دەبوو، ئەوەی ئاگای لە خۆی نەبووایە ملی دەشکا، منیش منداڵەکانم تێگەیاند کە چۆن خۆیان بخلیسکێنن، ژن و منداڵم دایەدەستی قەدەر، بەڵام هەرچۆنێك بێت بە سەلامەتی چوونەخوارەوە. لە دامێنی شاخەکە دەبووایە جارێکی تر سەربکەوین، سواری وڵاخم کردنەوە، لە پێچێکدا قومری خێزانم

بەربووەوە! لەوکاتەدا وردە بەرد دەخزان منیش ڕێشمەی ئەسپەکەم گرتبوو هاوارم کرد بۆ قاچاخچییەکان نەهاتن! وەکو فیلم تەماشای ئێمەیان دەکرد! تۆزێکی مابوو لە شاخەکە هەڵدێرێت، بەڵام هەرچۆنێك بێت هەوڵمدا ڕزگاری بکەم نەمتوانی، کەوت و پەراسووی شکا! زۆر تووڕەبووم لە قاچاخچییەکان وتم: بکەونە خوارەوە هەمووتان دەکوژم، وەرن یارمەتیم بدەن، ترسان هاتن یارمەتیم بدەن، چونکە ئەسپەکە کەوتبوو قومری خێزانم کەوتبووە ژێری و هەردووکیان دەخزان بۆ خوارەوە، توانیان ئەسپەکە ڕاستبکەنەوە و قومری خێزانمیان لە مردن ڕزگارکرد، بەڵام ئازاری زۆر بوو نەیدەتوانی هاواریش بکات، منداڵەکانی تر چەند جارێك بەربوونەوە، بەڵام سەلامەت بوون، بۆ شەو بە هیلاکی چووینە ناوەڕاستی قەندیل پێیاندەووت تاوڵان. شەو ماینەوە لەوێ مەڕداری لێبوو پێیانووتین: جێگای منداڵەکانتان بۆ دەکەینەوە و خۆشتان بچنە ئەو سەر تەندورە، منداڵەکانیان بۆمان خستەژێر خێمەیەکەوە، من و ڕەمەزانیش لەسەر تەندورێك خەوتین، ئەو ئێوارەیە یاپراخی قۆڵەمیریان کردبوو، نانێکی باشیان داینێ کە زۆر جێگای سوپاسە، بۆ بەیانی کەوتینەڕێ بە ئاسانی چووین بۆ کاولان، چونکە ئەو ڕێگایە بەرزونزمی نەبوو. لە کاولان چووینە بارەگای حسك، لای بارەگای حسك سامی حەرەکات لەوێ بوو کە برادەری خۆم بوو، بارەگاکەی خۆی بۆ چۆڵکردم، دکتۆر مەحمود سۆرانی لەوێ بوو چارەسەری خێزانمی کرد، پشوویەکی باشماندا، ڕەسوول مامەند خوالێیخۆش بێت لێپرسراوی ئەوناوە بوو سەردانی کردین و پێیووتین: چیتان پێویستە بۆتان دەکەین. بەرگەیان بۆ کردین و بە سەیارە ڕەوانەی ئەڵوەتانیان کردین کە کوڕەکانی کوێخا عەبدوڵڵای چۆخماخ پێشمەرگەی حسك بوون

یارمەتی زۆریان داین، ئۆتۆمۆبیلیان بۆ ئامادە كردین. كە گەیشتینە ئەڵوەتان لە بن دیوارێك دانیشتبووین چاوەڕێی سەیارەمان دەكرد بچین بۆ قاسمەڕەش، ژنێك هات وتی: ئەوە كاك حەمە صاڵح چی دەكەیت لە بن ئەو دیوارە؟! وتم: چاوەڕێی سەیارە دەكەین بۆ قاسمەڕەش دەچین. وتی: منماڵم لێرەیە منداڵەكان بێنە بۆ ماڵی ئێمە دوایی سەیارەتان بۆ پەیدا دەكەم، بردینی بۆ ماڵی خۆیان خزمەتێكی باشی كردین، ئەو ناوی نەسرین بوو ژنی ئەحمەد غەفور بوو ناسرابوو بە هاوڕێ نوری، كاتی خۆی لە پێشمەرگایەتی لە شاربازێر یارمەتیم دابوو بە هێنانی ژنەكەی لە وڵاغلووەوە بۆ بێتووش، پێیانووتین: ئەگەر لێرە دەمێننەوە خانووتان بۆ پەیدا دەكەم. منیش پێمووت: زۆر سوپاس دەبێت بچین بۆ قاسمەڕەش.

دوای پشوویەكی زۆر لەو ماڵە چوو سەیارەی بۆمان دابینكرد و بەرەو قاسمەڕەش بەڕێكەوتین. لە گڵكەند لاماندا، شەهید مەلا خالیدمان بینی فەرمووی كردین بردمانی بۆ ماڵی خۆیان، چوار شەو لە ماڵی عەبەخڕە و سابیر كۆكەیی و مەلا خالید و عەزیزی برای ماینەوە، دواتر لە كانی زەرد ژوورێكیان بۆ گرتین كە پشتەوەی تەویلە بوو، بەڵام ناچاربووین، چونكە جێگا نەبوو. ئەو ژوورە تەنها دارەڕا بوو بە گەڵا و كەمێك گڵ داپۆشرابوو، لەگەڵئەوەشدا بۆنی ئاژەڵەكان زۆر دەهات. منداڵەكانم لەوێ دانا و چووم بۆ سەردەشت هەندێك بەتانی و ئازوقە و پێداویستیم بۆ كڕین، كە هاتمەوە ئەوشەوە كێچێكی زۆر منداڵەكانی هەراسان كردبوو، چرایان داگیرساند بوو گێچ هەراسانی كردبوون، شوشەیەك ژەهرم بۆ كێچ دانا بوو خێزانم بەناچاری بە منداڵەكانی كرد بوو، هەموویان تووشی ژەهراوی ببوون و دەڕژانەوە! دایكی منداڵەكان ترسابوو بمرن بۆ بەیانی بردبوونی بۆ قاسمەڕەش چارەسەری كردبوون

لای دکتۆری شۆڕش. هەواڵەکەم بیست منیش چووم بۆ قاسمەڕەش، لەوێ بینیمن، دایکی منداڵەکان وتی: بەتاتەیان خواردووە! دکتۆریش دەیووت: ژەهراوی بوون!؟ نەیدەووت دەرمانی کێچم پێوەکردوون. دواتر زانیمان کە دەرمانی پێوەکردوون. هەر ئەو ڕۆژە کابرایەکی ئێرانی هاتبوو بۆ لای دکتۆر پێیووتبوو: چارەت لای من نییە بچۆ بۆ سەردەشت با نەشتەرگەریت بۆ بکەن. بە دکتۆرەکەم وت: بۆچی!؟ وتی: کێچ ناوکی کون کردووە دەبێت بە نەشتەرگەری بۆی چارە بکەن! ئەگەر دەرمانی بەکاربهێنایە وای لێنەدەهات!؟ دوای هەفتەیەك ماڵێکی ترمان دۆزییەوە کە ماڵی مام عەبدول بوو چووینە ئەوێ، ئەو ماڵە پاکتر بوو، کۆمەڵێك ماڵی عێراقی نزیکمان بوون وەکو ماڵی فەرەیدون عەبدولقادر و مامۆستا عەبدوڵڵا و دکتۆر براهیم و مەحمود سەنگاوی و فایەقی ئامۆزای مەلا خالید و خالید گەبەیی و کۆمەڵێك ماڵی کانی توویی و هتد، ئەو شوێنە ئاووهەوای خۆش بوو، مام عەبدول پیاوێکی فەقیرحاڵ بوو دەیووت: من دنیام زۆر دیوە حەوت ساڵ شوان و گاوان بووم لە گوندی سپی دارە و دارمەکەون لە دراوسێ دێی خۆیان بوون، ڕۆژێك مانگایەکیان قاچی شکابوو سەریان بڕی گۆشتەکەیان کرد بە خێر و سیوجگەرەکەی ناشتبوو! دەیووت: من گۆشتی دایکی خۆم ناخۆم! دەمانووت: بۆچی دایکتە!؟ دەیووت: من شیری ئەوم خواردووە چۆن گۆشتەکەی دەخۆم!؟ منیش پێمووت: ماشاالله کە فەقیریت، کەوا بێت گوێرەکەکە دەبێت بە برات! ئەویش وتی: برای شیریمە پێکەوە شیرمان خواردووە!؟ برادەران جگەرەکەیان دۆزییەوە و دەستیان کرد بە خواردنی، چەند ڕۆژێك لەسەر گۆشتی مانگا سوور بووین کە دەمێك بوو گۆشتمان نەخواردبوو. پاش دوو هەفتە چوومەوە بۆ گوێزێ بۆ بارەگای

کاك هەڵۆ، لەوکاتەدا خوالێخۆش بوو کاك نەوشیروان و خالید رەزا هاتبوون بۆ بارەگاکە، چونکە قاسمەڕەش گەرم بوو. لەبەر ئەوەی گوێزێ فێنك بوو بارەگاکان هەموویان لەوێ بوون. بارەگای حیزبی شیوعی لە خوار ئێمەوە بوو کە حمە رەشید و ئەسکەندەر لەوێ بوون، کاورێکیان کڕیبوو بۆ ئەوەی سەری بڕن من چووم هێنام لێم شاردنەوە وتم: بزانم هاورێ قادر حاجی محەمەد کە بە ئەسکەندەر ناسراو بوو دەیدۆزێتەوە ! ؟ هاورێ قادر هەر دەگەڕا بە دەوری بارەگاکەی ئێمەدا، بەڵام من لە هەوارە کۆنی مەڕدار دەرگام لێهەڵچنیبوو نەیدەزانی لە کوێیە، بەڵام شکی هەبوو کە من دەیزانم، هات بۆ لام دەیووت: توخوا نەتدیوە ؟ منیش دەمدوان دەمووت: تۆ دەڵێیت من هیچم لێ ون نابێت بۆ ئەمەیان نادۆزیتەوە ؟ ! وتی: نازانم لەم ناوەیە. وتم: دەبڕۆ ئەوەتا لەو کۆنە هەوارەیە چوو هێنای بردیەوە، بۆ بەیانی سەریان بڕی. دکتۆر دڵشاد هات بۆ لام وتی: ئەم مەڕە بووە بە هی تۆ دەبێت بێیت نانمان لەگەڵ بخۆیت، منیش چووم نانمخوارد، چەند رۆژێك لە گوێزێ بووم لای کاك هەڵۆ، ماوەی مانگێك مۆڵەتم وەرگرت بۆ ئەوەی منداڵەکان بەرم بۆ شارەکانی ئێران، گەڕامەوە بۆ کانی زەرد، جەمال و بێکەس لە ماڵی ئێمە بوون ماوەی چەند رۆژێك پێکەوە بووین، دوایی گەڕانەوە بۆ ئێران.

لە کانی زەرد ماست و دۆی باشی لێبوو دەهاتن لە کارێزەکەی بەردەم ماڵی ئێمە دایاندەنا پێیاندەووتین: هەرکاتێك دۆتان ویست بچن بیهێنن بۆ خۆتان، ئەم گوندە ئەسپێ و کێچی زۆر بوو بە هیچ جۆرێك لەناو نەدەچوو.

لە هاوینی ١٩٨٨ وردە وردە ماڵەکان دەچوون بۆ شارەکانی ئێران، لەوکاتەدا شەهید محەمەد براهیم سووسە کۆنی و محەمەدئەمین

حەمە مستەفا گیرابوون لە زەڵێ، حەمە سعید قەڵەم پاشا و حمە عەزیزی كوڕی هاتبوون بۆ ئازادكردنیان، چونكە كوێخا حمەسعید زۆر ڕێزی لێدەگیرا لەلایەن سەركردایەتی یەكێتییەوە و خاڵی محەمەد براهیم بوو، دوای ئازادكردنیان هاتن میوانداریمكردن و ڕێزم لێیانكرد، دوایی چوونەوە بۆ ئێران، ماڵی شەهید محەمەد هاتن بۆ ئەوێ.

دوای مانگێك لە ماڵی مام عبدول گواستمانەوە بۆ ماڵی حەمەی زەڵێ كە ماڵێكی زۆرخۆش بوو، لەناو دارستانێكدا بووین لەبەردەماندا كشتوكاڵ كرابوو لە هیچ شتێكمان كەم نەبوو، لەبەر ئەوەی كانی زەرد شوێنێكی فێنك بوو هەر ماڵێك وەكو ئێمە بهاتایەتە ئێران زۆر هیلاك دەبوون، منیش فەرمون لێدەكردن بۆ ئەوەی لای ئێمە كەمێك پشوو بدەن. لە ماڵی حمەی زەڵێ زۆربەی برادەران بە خۆیان و خێزانیان میوانداریيان دەكردین، شوێنەكەمان وا هەڵكەوتبوو كە خۆر كەم لێی دەدا، یەكێك لەو خێزانانە خێزانی مەلا عەلی بوو لە سنوورەوە هاتبوون چەند ڕۆژێك لای من بوون تا بەرگەیان بۆ كرا و چوون بۆ سەقز، پورە فاتە كە ژنی حەمەی زەڵێ بوو پێوەژن بوو، شەوێك هات بۆ لامان چوو سەرینی كوردی دۆشەكی بۆ هێنان بۆ میوانەكان، كە هێنایان یەكسەر ئەسپێ بە ماڵەكەدا بڵاوبوەوە، مەلا عەلی دەرمانی پەمپی پێبوو بۆ ئەسپێ كوشتن تا نیوەشەو دەستی كرد بە ئەسپێ كوشتن، دوای ئەوان مامۆستا بهادین نوری هات بۆ ماڵمان كە منداڵەكانم زۆریان خۆشدەویست بە تایبەتی كوێستانی كچم كە مەتەڵی لە منداڵەكان دادەهێنا، كە ڕۆی پارەیەكی زۆری لای ئێمە دانا، دوایی مامۆستا عەلای برای هات بەناونیشان بردیەوە، چونكە وتبوی: مامۆستا عەلا نەبێت نەدرێت بە كەس پێشتر برازاكانی هاتن نەماندانێ.

له‌ مانگی ٧ی ١٩٨٨ هیوای مه‌لا عه‌بدوڵلا له‌ فرۆشگاكه‌ی گوێزێ بوو بینیم وتی: كاك حه‌مه‌كه‌ریم ئه‌م گونیه‌ شه‌كره‌ چی لێ بكه‌م ناته‌وێ؟ وتم: بۆ؟ وتی: به‌پێ ده‌ڕۆم بۆ قه‌ندیل بۆم ناچێت. منیش وتم: با بۆ من بێت ده‌یبه‌مه‌وه‌ بۆ كانی زه‌رد ده‌یكه‌م به‌ دیاری تۆ بۆ ماڵه‌وه‌، سواری سه‌یاره‌ بووم بۆ ئه‌ڵوه‌تان و له‌وێوه‌ بۆ قاسمه‌ڕه‌ش و كانی زه‌رد، كه‌ چوومه‌وه‌ جه‌مال حه‌مه‌ئه‌مین و ره‌ئوف ره‌شید له‌وێ بوون، مانه‌وه‌ تا ئیشیان ته‌واو بوو، شه‌وان لای ئێمه‌ ده‌مانه‌وه‌، كانی زه‌رد ئاووهه‌وای خۆش بوو تا مانگی حه‌وت به‌فر له‌ دۆڵی مالیمۆس ئه‌مایه‌وه‌، منداڵه‌كان ده‌چوون بۆ هێنانی به‌ڵام ئاوی ئه‌وێ سارد بوو به‌فری نه‌ده‌ویست.

ساڵی ١٩٨٨ هاوینه‌كه‌ی له‌ گوێزێ بووین، براده‌رێكمان له‌گه‌ڵ بوو ناوی حه‌مه‌ بچكۆل بوو، نانی بۆ ده‌كردین، ئه‌وكاته‌ كاك نه‌وشیروان خوالێیخۆش بێت له‌وێ بوو، كاكه‌ حه‌مه‌ پێی زۆر گه‌وره‌ بوو پێڵاوی ژماره‌ ٥٠ بۆ ده‌بوو، به‌ پێ خاوسی ده‌گه‌ڕا! چونكه‌ له‌ هیچ شوێنێك پێڵاوی ده‌ستنه‌ده‌كه‌وت، ده‌بووایه‌ بچێت بۆ ئوورمییه‌ له‌وێ پێلاو به‌ كردن بدات، ئێمه‌ش به‌ كاك هه‌ڵۆمان وت و ئه‌ویش به‌ كاك نه‌وشیروانی وت، كاك نه‌وشیروان ١٥ هه‌زار تومانی بۆ خه‌رجكرد بۆ ئه‌وه‌ی بچێت پێڵاو به‌ كردن بدات له‌ ئوورمییه‌، له‌وكاته‌دا خالید ره‌زا له‌سه‌ر بێته‌ل بوو ده‌یووت: تا ئێستا كاك نه‌وشیروان ١٥ هه‌زار تومانی بۆ من خه‌رج نه‌كردووه‌.

له‌ مانگی ٨ی ١٩٨٨ له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خێزانم نه‌خۆش بوو منداڵه‌كانم برد بۆ سه‌قز، له‌ سه‌قز چه‌ند رۆژێك ماینه‌وه‌ تا به‌رگه‌یان بۆ كردین، شه‌وی یه‌كه‌م چووینه‌ ماڵی عه‌به‌ خڕه‌ و شه‌وی دووه‌م له‌ ماڵی سابیر كۆكه‌یی بووین كه‌ زۆر خزمه‌تیان كردین، شه‌وی سێیه‌م له‌ماڵی مه‌لا عه‌لی

ماینەوە، لای تەرمیتاڵی سەقز لە بازاڕ خوالێخۆش بوو مەلا نەوزاد چایخانەیەکی دانابوو، ئەو برادەرانەی ماڵیان لە سەقز بوو ئێواران دەچوونە ئەوێ، منیش لەگەڵیان دەچووم بۆ ئەوێ، لەوێ هەر کەس باسی ژیانی خۆی دەکرد کە چۆن دەربازی بووە لە ئەنفال و کیمیایی. ئەو برادەرانەی کە سەڵت بوون بە زۆری لە بارەگاکان دەمانەوە هاموشۆی شارەکانیان بە کەمی دەکرد، نیوەڕۆیەك لە ماڵی مەلا خالید میوانداریمان کرد و نیوەڕۆیەکی تر لە ماڵی کاك فازیل میوانداریمان کرد، بۆ ئێواران بە ماڵ و منداڵەوە دەچووین بۆ پارکەکان. ڕۆژێك شەهید محەمەد و خێزانەکەیم بینی پێمووتن: کە کیتەڵەیەك گۆشتمان لە کارێزەکەی لای ماڵی حەمەی زەڵێ داناوە، کە چوونەوە دەریبهێنن و بیخۆن، چونکە ئێمە زۆرمان پێدەچێت، ئەوان دەگەڕانەوە بۆ کانی زەرد، دوای ئەوەی بەرگەیان بۆ کردین بەڕێکەوتین بۆ تەورێز لەگەڵ ماڵی شەهید مەلا خالید و خوالێخۆش بوو محەمەد مۆریاسی، کە تا ئەوێ دوو پاکەت جگەرەی کێشا و قانی داین. کە چووینە تەورێز چووینە نیقاتگا کە میوانخانەی یەکێتی بوو، منداڵەکانمان لەوێ دانا و لەگەڵ مەلا خالید چووین سەردانی ئەو بریندارانەمان کرد کە لە نەخۆشخانەیەکی نزیکی میوانخانەکە بوون، لەوێ عەلی حاجی مەحمود گەلاڵەیی و شوانەی حاجی شەریف و محەمەد بازیانی و چەند برادەرێکی تری لێبوو، دوایی گەڕاینەوە بۆ میوانخانەکە، ئەحمەد مەجید خێزانەکەی لەوێ بوون. دکتۆر موحسین نمایندەی یەکێتی بوو لەو میوانخانەیە پێیووتین: ئەگەر لێرە دەبن خەرجیتان بۆ دەکەین، ئەگەر خۆتان دەچن بۆ ئوتێلی تر هەر نەفەری ١٠٠ تومان خەرجیتان دەکەین. ئێمەش پێمان باش بوو خۆمان بچینە موسافیرخانە بۆ ئەوەی سەربەست بین. ڕۆیشتین بۆ

موسافیرخانەی مەحمودی ئازەری لەوێ مەلا خالید ژوورێکی گرت و منیش ژوورێك، خۆمان خواردنمان دروستدەکرد و ئێواران دەچووینە پارکی گوڵستان و گوڵشەن، لەو چەند ڕۆژەدا محەمەد بازیانی هات بۆ لام وتی: بەڵکو لەگەڵ ئەحمەد مەجید بچن بۆماڵی مام عەلی ناوشوانی کە پێشمەرگەی ئەیلول بوو لەوێ مابووەوە کە کچێکی هەیە بۆم داوا بکەن، پێشتر قسەی لەگەڵ کچەکە و دایکی و براکەی کردبوو، سەیارەیەکی بۆ گرتین خۆیی و ئەحمەد مەجید و خێزانەکەی و من و خێزانەکەم چووین بۆ ماڵی مام عەلی خوازبێنیمان بۆ کرد، زۆر لەگەڵی ماندوو بووین وتی: بۆ شوانەی عەریف مەجیدم داناوە، ئەحمەد مەجید وتی: با هەندێکی لێبدەم! وتم: پاسدارمان بۆ بانگ دەکات!؟ ئێمە گەڕاینەوە و محەمەد بازیانی زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام راستی کرد دوای ئەوە کچەکەی شووی بە شوانە کرد لە سەردەشت دراوسێمان بوو. دوای نزیکەی ١٥ ڕۆژ گەڕاینەوە چووینە مهاباد، لە کەبابخانەیەك نانمانخوارد، دوایی چووینە پارکی چوارچرا ئەو شوێنەی قازی محەمەدی لێ هەڵواسرا بوو.

کەژانی کچم گۆرانی مهابادم مهابادمی دەووت، شەو لە مهاباد باینەوە لە موسافیرخانە، بۆ بەیانی هاتینەوە سەردەشت لەوێ چووینە موسافیرخانە، خێزانم چوو بوو بۆ بازاڕ هەواڵی سەلیمی کوڕی حاجی محەمەدی پرسی بوو کە دوکانی تەسجیلاتی هەیە، وتبوویان دوکانی کاك سەلیم لە سەرووی ئێرەیە، بەڵام وتبوویان باوکی سەلیم حاجی محەمەدی هەلاج دوکانەکەی لەبەر دەمتایە. چووبوو پێیووتبوو: من کچی سەلمەم، لەوێ خێزانم لەگەڵ خێزانی خاوەنی موسافیرخانەکە گفتوگۆی کردبوو دەربارەی ماڵی حاجی عەلی هەلاج و حاجی محەمەد هەلاج کە پورزای خەسووم بوون بەناوی سەلمە خوالێیخۆش بێت. خێزانی خاوەن

موسافیرخانەکە تەماسی کرد لەگەڵ ماڵی حاجی عەلی، دوای نیو کاتژمێر سەبری و رەحیمی حاجی عەلی هاتن لەگەڵیان چووین بۆ ماڵی حاجی عەلی، نەیانهێشت لە موسافیرخانە بمێنینەوە، ئەو شەوە هەموو کوڕ و کچ و خزمەکان لێمان کۆبوونەوە، وتیان: نابێت هەفتەیەك بڕۆن، بەڵام ئێمە نەمانتوانی بمێنینەوە بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ کانی زەرد، کەلوپەل و پێداویستیم بۆیان دابینکرد و بەجێمهێشتن و چوومەوە بۆ گوێزێ، لەو ماوەیەی لە گوێزێ بووم ماڵی حاجی محەمەد و حاجی عەلی و محەمەدی هەباس بە پاسێك هاتبوون تا ئێوارە مابوونەوە و رۆیشتبوونەوە کە خواردنێکی زۆریان هێنابوو، پێیانووتبوون: کە زستان هات لێرە ئیدارە ناکەن بەفر زۆر دەبارێت وەرن بۆ سەردەشت.

کە چوومە گوێزێ چوار برادەری ئێرانی هاتن کاك هەڵۆ پێیوتم: لەگەڵیان بچۆ بۆ دیوی عێراق لای رەزگە و مارەدوو، کە رەبایەکانی عێراق دەردەکەوێت. منیش لەگەڵیان چووم شەو لە بارەگایەکی بچووك لەگەڵیان مامەوە لای ئومێدی مەلا رەزا لە پشتی کانی بەهارە، بۆ بەیانی بە دۆڵەکانی قەندیلدا هەوراز و نشێو کەوتینەڕێ و ئەو کارەی هەیانبوو کردیان، کە بریتی بوو لە سەیرکردنی رەبایەکانی رژێمی عێراق بە دووربین، دواتر گەڕاینەوە بۆ گوێزێ. لە رێگا لای کانی و ئاوێك لاماندا یەکێکیان وتی: برادەر ئێنە ئیسمی کانی زەردە؟ منیش وتم: نا کانی زەرد پشتی قاسمەڕەشە. وتی: ئێنە هەم کانی زەردە ئونە هەم کانی زەردە. دیار بوو نەخشەی سەربازییان پێبوو ناوی هەموو شوێنەکانی تێدابوو، نەخشەکەی دەرهێنا و نیشانیدام بە پێکەنینەوە. دوای ئەوەی گەیشتینە گوێزێ رۆیشتن و بۆ بەیانی تۆپباران دەستی پێکرد، کاك هەڵۆ هات دەست خۆشی لێکردم و وتم: ئەمانە لەمن شارەزاتر بوون،

مەسەلەی کانی زەردم بۆ گێڕایەوە. دوای هەفتەیەك گەڕامەوە بۆ کانی زەرد. لەگەڵ منداڵەکان بڕیارماندا بچینەوە بۆ سەردەشت بۆ سەردانی خزمانی خێزانم، لە سەردەشت چووینە ماڵی حاجی عەلی و شەو ماینەوە، لەوێ دەفی بۆمان لێدا و دەیمەیان دەیووت: لە سەردەشتەوە دەفم لێداوە تا قەڵادزێ دامنەناوە ! دەروێشی شێخی سندۆلان بوو. بۆ شەوی دوایی چووینە ماڵی حاجی محەمەد، سەبری و ئازیز هاتن بۆ لامان وتیان: سبەینێ بۆ نیوەڕۆ لای ئێمەن، بۆ نیوەڕۆ چووینە ماڵی سەبری و ئازیز خزمەتێکی زۆریان کردین و وتیان: شەو لامان بن، بەڵام نەماینەوە دوانیوەڕۆ چووینە بازاڕ پێداویستیمان کڕی و گەڕاینەوە بۆ کانی زەرد. چەند رۆژێك لە ماڵەوە بووم و گەڕامەوە بۆ گوێزێ، لە ئەلوەتان جەزا و فەهمیم بینی نەیانهێشت بڕۆم شەو لایان مامەوە و بۆ بەیانی گەڕامەوە گوێزێ، کاك هەڵۆ پێیوتم: زستان لێرە ئیدارە ناکەین بچۆ بۆ دەوری قاسمەڕەش بزانە شوێنێك پەیدا ناکەیت. کە چوومە قاسمەڕەش لە نزیکی ئەوێ شوێنێك هەبوو پێیاندەووت: پاش قەبران، دیاریم کرد بۆ بارەگا، دواتر گەڕامەوە بۆ کانی زەرد لەوماوەیەدا مەلا عەلی و ئەبو سەلام سەردانی ماڵی ئێمەیان کرد بوو نەمتوانی بیانبینم. چەند رۆژێك لە کانی زەرد بووم دواتر گەڕامەوە بۆ گوێزێ، وردە وردە ئاووهەوا سارد دەبوو، کاك هەڵۆ پێیوتم: بچن بەشێك لە کەلوپەلی بارەگا و هەندێك لە برادەران بەرە بۆ پاش قەبران، بە سەیارە بارمکرد و چووین بۆ پاش قەبران، لەو برادەرانە خوالێخۆش بوو عەتا و عوسمانی دارتوو و فەهمی و کوڕەکانی حاجی مەحمود و خالیدی خوشکەزای و عومەر و بکری برای و وەستا ئەحمەدی ئامۆزایان و چەند برادەرێکی تر، بەردێکی زۆری لێبوو، خەتم بۆ کێشان و وتم: بیکەن بە دیوار، بەسەردیوارەکەدا

خێمەمان هەڵدا،ماڵێکی لێبوو بە ماڵی مام ئەحمەد ناسراو بوو، دوو سێ کچی هەبوو نزیکی بارەگاکە بوو دوو پێشمەرگە شەڕیان بوو لەسەر ئاوهێنان بۆ بارەگاکە، چونکە کانییەکە کچەکانی مام ئەحمەد بەکاریاندەهێنا ! ؟ چووم ئازوقەی پێشمەرگەکانم لە قاسمەڕەش هێنا و بۆم دانان و خالیدم کرد بە لێپرسراویان، بەجێمهێشتن چوومەوە بۆ گوێزێ، کاك هەڵۆ بڕیاریدا بارەگا لە گوێزێوە بار بکەین بۆ دۆڵەکۆکە، لەوێ مەلا بەختیار بەند بوو، ئازوقەی ٥ مانگمان بۆ دانان، چونکە زستانەکەی سەخت بوو، گوێزێ و دۆڵەکۆکە ناوەڕاستی قەندیل بوو زستانان ڕێگای دەگیرا، بەڵام خانووی باشی لێبوو.

بۆ زستان مەفرەزەیەکمان لە دۆڵەکۆکە بەجێهێشت کە بریتی بوون لە هاوڕێ گۆران و سەردار و بەکر دارتوویی و ڕێبوار هەورامی و براکەی عەبدوڵڵا وسو و ڕزگار و نەبەز و چەند کەسێکی تر، خۆمان گەڕاینەوە بۆ پاش قەبران، کاك هەڵۆ ماڵی پەیداکرد لای بارەگاکە لە ماڵی مام ئەحمەد بوو، لەوماوەیەدا خێزانم بێ من چووبوو بۆ سەردەشت خانووی پەیدا کردبوو لە نێزەڕۆی پشتی سەردەشت، کە گەڕامەوە بۆ کانی زەرد خێزانم وتی: خانووم لە سەردەشت پەیداکردووە.

لە مانگی ١١ی ١٩٨٨ ماڵمان باری کرد بۆ سەردەشت لە ماڵی پیاوێکی هەژار بووین کە کاری حەماڵی دەکرد ناوی محەمەد بوو، زۆر کاری بۆ دەکردین بۆ ئەو شتانەی کە پێویستمان بوو بە کۆڵ بۆی دەهێناین، چونکە نێزەڕۆ دوور بوو لە سەردەشت سەیارەش نەدەچوو بە کرێ نەبێت، بۆیە خەڵکی ئەوێ هەر بە حەماڵ شتومەکیان دەگواستەوە، ئەو ساڵە بەفر زۆر دەباری بەیانیان بە کۆڵ منداڵەکەی دەبرد بۆ مەدرەسە.

پێش ئەوەی رەحیم بگاتە ئێران لە مانگی ١٢ی ١٩٨٨، لەگەڵ قومری خێزانم چووین بۆ مهاباد شەوێك لە ماڵی خدری حاجی عەلی مابینەوە كە خزمی خێزانم بوو، بۆ بەیانی چووین بۆ رەزاییە بردم بۆ لای دكتۆر پێیوت: دەبێت بە نەشتەرگەری منداڵانی بۆ لا ببرێت ئەگینا پارچەپارچە دەبێت و هەڵدەوەرێت بە قسەمان نەكرد، چووینە لای دكتۆرێكی تر وتی: ئەو بۆ پارە وا دەكات منداڵانی هیچی نییە تەنها منداڵی نابێت. لە رەزاییە چووین بۆ لای عومەر حامید كە عەتای لابوو نەشتەرگەری بۆ كرابوو، چونكە قاچی دەوالی هەبوو، دوو شەو لەوێ بووین و گەڕاینەوە بۆ سەردەشت.

لە مانگی ١١ی ١٩٨٨ رەحیمی كوڕم لە چەمچەماڵ لەلایەن رژێمەوە چاودێری دەكرا، شەوێك خزمێكی خاڵی، رەفیق حیزبی بوو، ناوی نەوزادی مەلا قادر بوو زاوای شكور چایچی بوو خوالێیان خۆش بێت، هاتبوو بۆ ماڵی خاڵی پێیانیووتبوو ئاگای لە خۆی بێت ئەمن بە نیازن بیكرن. بڕیاریان دابوو هەر شەو لەگەڵ نەنكی بە سەیارە چەمچەماڵ بەجێبێڵن و چوو بوون بۆ سلێمانی، پێشتر نامەم بۆ ناردبوو كە لێی قەوما چۆن بێتە لامان لە ئێران، بۆ بەیانی چوو بوون بۆ سەنگەسەر لە ماڵی دێوە سپی چەند رۆژێك مابوونەوە كە خزمێكی نزیكی نەنكی بوو. دواتر لە رێگەی قاچاخچییەوە هاتبوو بۆ سوونێ و شەو لەوێ مابووەوە كە بە نارەحەتی گەیشتبووەوە سوونێ و لە نۆكانەوە هاتبوو بۆ قاسمەرەش، دوو شەو لە بارەگاكانی كاك نەوشیروان مابووەوە و هەواڵی كاك هەلۆ و منی پرسیبوو، محەمەدی برای ئەحمەد مولوودی دیبوو بردووی بۆ پاش قەبران، دوو شەو لەوێ مابووەوە تا كاك هەلۆی دیبوو. كاك هەلۆ نامەی بۆ نووسیبوو بۆ پەیوەندییەكانی یەكێتی

لە قاسمەڕەش، لەوێ بەرگەیان بۆ کردبوو هاتبوو بۆ سەردەشت. لە چەمچەماڵ بۆ بەیانی ئەو شەوەی ڕەحیمی کوڕم چەمچەماڵی بەجێهێشتبوو ئەمن چوو بوون بۆ ئەو خوێندنگەیەی چەمچەماڵ کە لێی دەخوێند بە نیازی گرتنی!؟ لە سەردەشت هەواڵی ماڵی حاجی محەمەدی پرسیبوو بردووبوویان بۆ دوکانەکەی، لەوێ حاجی محەمەد وتبوی: دوای نیوەڕۆ بە نیازین بچین بۆ ماڵی ئێوە لە نێزەڕۆ، بۆ نیوەڕۆ بردووی بۆ ماڵی خۆیان و دوای نیوەڕۆ هێنابووی بۆ ماڵی ئێمە، کە دایکی دیبووی یەکسەر بوورابووەوە لە خۆشیدا. دوای نیوەڕۆ کە چوومەوە بۆ ماڵەوە ڕەحیمم بینی.

لە نێزەڕۆ خاوەن ماڵەکە دایکێکی پیری هەبوو خەڵك دەیان دووان، لە چلەی هاویندا پێیاندەووت لە شیوە برایمە لافاو هەڵستاوە حەمە ئاو بردوویەتی؟! دایکی بە خۆیدا دەکێشا حەمەڕۆی دەکرد و دەیووت: دایکت کوێر بێت چۆن ئاو بردی! لە پڕ دەهاتەوە دەچوو بەرەو پیری و دەیووت: شکور هاتییەوە ئاو نەیبردووی!؟ ئەویش دەیووت: لافاوی چی بەم چلەی هاوینە؟!؟

کە چووینە نێزەڕۆ بە خێزانم وت: قومری تا ماڵەکە دادەگرین برنجێکی سوورمان بۆ لێبنێ، کاکەحەمە بە تەمەنی خۆی برنجی سووری نەخواردبوو دەیووت: برنج بە رووپ گۆجەی، واتا دۆشاوی تەماتە بە خوا بە تامە و فاتیحای تەعامی دەخوێند! ئێمە لێی نانێین، چونکە رووپ گرانە! منیش وتم: هەر جارێك برنجی سوورمان هەبوو وەرە نان لێرە بخۆ.

زۆربەی ماڵە عێراقییەکانی سەردەشت لە نێزەڕۆ کۆبووبوونەوە کە نزیکەی ٦٠ ماڵ دەبووین، وەکو خزم هەڵسووکەوتمان لەگەڵ یەکتر

دەكرد، وەكو ماڵی مەلا خالید وبرا و ئامۆزاكانی و عەبەخڕە و قادر پاسۆك و مام صالّح ئاوەژێی و كوڕەكانی و رەسووڵی حاجی شێخە و حمەئەمین مستەفا و محەمەد برایم و خالید گەبەیی و حەمەڕەشید گاپیلۆێنی و مەحمودی برای و شەهید مەردان و ئەحمەد كانی توویی و هتد.

لە زستانی ١٩٨٩ مانگی ١٢ لەگەڵ رەحیمی كوڕم چووین بۆ فەرمانداری سەردەشت، لەوێ ئاغای شەفایی لێبوو نمایندەی ئێران بوو بۆ كاروباری ئاوارەكان، حاكم قادر لەوێ بوو پشتگیری كردین پێیانخۆش بوو كە منداڵی ئاوارەكان بخوێنن. ئاغای شەفایی نووسراوی بۆ كردین بۆ ئامۆزشی پەروەرش كە چووینە ئەوێ لە دبیرستانی ئازادی ناونووسیان كرد و دەستی بە خوێندن كرد، بەڵام لە پۆلێك دوای خۆی وەریانگرت خستیانە پۆلی چوار نەك پێنج. بەداخەوە تەنها كوڕەكەی من و كوڕی محەمەد سوڵتان لە دبیرستان بوون كەسی تر خۆی ناونووس نەكردبوو بۆ خوێندن.

لە زستانی ١٩٨٩ رژێم لێبووردنی دەركردبوو بۆ پێشمەرگە، رۆژێك فەهمی و جەزای برای و كاك ئەحمەدی باوكیان خوالێیخۆش بێت هاتن بۆ ماڵمان وتیان: عافواتە ئێمە دەڕۆینەوە. زۆر هەوڵمدا لەگەڵیان كە نەچنەوە، بەڵام كاك ئەحمەد و جەزا و منداڵەكانی رۆیشتنەوە و فەهمییان بەجێهێشت.

لە زستانی ١٩٨٩ چووم بۆ كرماشان بۆ سەردانی مامۆستا جەمال و سامی وەستا سابیر، لەوێ سەردانی مامۆستا عەبدوڵڵام كرد كە لێپرسراوی پەیوەندییەكانی یەكێتی بوو، لەوێ زۆر رێزی لێگرتم و وتی: ئەگەر ماڵت لێرەیە خانووت بۆ پەیدا دەكەم؟ منیش وتم: تەنها بۆ

سەردان هاتووم ماڵم لە سەردەشتە. نیوەڕۆ لای ئەو نانمخوارد و دواتر چوومەوە بۆ لای مامۆستا جەمال کە لە ماڵێك بوو کوڕەکەی ناوی حەسەن بوو، ئەوکاتەی من لەسەر چایخانەکەی حەمەی پورزام بووم لە سلێمانی ئەو کاری نانەوایی دەکرد. ئێستاش ئەو پەیوەندییە ماوە کە زەینەبی دایکی و حەمەی برای هاموشۆی پەریخانی کچم دەکەن لە سلێمانی. دواتر گەڕامەوە بۆ سەردەشت.

لە زستانی ١٩٨٩دا گەلێك کارەساتی دڵتەزێن روویاندا کە بووە هۆی شەهیدبوونی چەند کەسێك لەوانە: شەهید مەردان بوو لە لایەن ناپیاوێکەوە کە پورزای خۆی بوو لە بارەگاکەی مابووەوە لە بلەکێ، شەو چووبوو لە بارەگاکە دەریهێنابوو شەهیدی کردبوو! بۆ بەیانی تەرمەکەمان هێنایەوە بردمان بۆ رەبەت لەوێ بە خاکمان سپارد، دوایی ماڵێکی ئێرانی کەشفیان کردبوو، لە پێشدا چوو بوو بۆ ماڵیان شەو لەوێ مابووەوە و بە نیوەشەو ڕۆیی بوو بۆ بارەگاکە، کاتێك زانیبوویان تەقە کرابوو. بە بڕیاری مام جەلال بە سزای خۆی گەیشتبوو لەگەڵ بکری برای کە پێشتر لە مالومە تاوانێکی ئەنجام دابوو لەوکاتەدا کەشف ببوو. مام جەلال پێیووتبوون: هەردووکتان ناپیاون پێویستە نەمێنن. پێشئەوەی مەردان بکوژرێت ژنەکەی هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە داوای ٥٠٠ دیناری کردبوو لە خێزانم بۆی دابینکردبوو، کە چووین بۆ پرسەکەی ئەم پورزا ناپیاوەی چای تێدەکرد وەکو ئاگای لە هیچ نەبێت وابوو! ؟ بۆ بەیانی حاکم وشیار هات بۆ رەبەت هەواڵی پورزاکەی پرسیبوو وتبوویان ئەوەتا ! کەلەبچەی کردبوو بردبووی بۆ قاسمەڕەش، پاش دادگاییکردنی بە سزای خۆی گەیشتبوو.

لە بەهاری ١٩٨٩حاجی مەولود باوکی ئەحمد مەولود هات بۆ ماڵمان، محەمەدی کوڕی لەگەڵ ئێمە پێشمەرگە بوو لای کاك هەڵۆ، رژێم ناردبووی بۆ ئێران بۆ ئەوەی پێشمەرگەکان رازی بکات تەسلیم ببنەوە، چونکە ئەوکاتە رژێم لێبووردنی دەرکردبوو، دوای من سەردانی چەند ماڵێکی تری کردبوو، کە هات بۆ ماڵمان کوڕێکی شەهید حمەسووری لەگەڵ بوو بەناوی رزگار، چەند رۆژێك لە ماڵی ئێمە مایەوە، نەخۆش بوو بردم بۆ لای دکتۆر چارەسەرم بۆ کرد و دواتر وتی: دەچم بۆ بارەگای پاش قەبران، نزیکەی ١٥ رۆژ لەوێ بوو دواتر هاتەوە بۆ ماڵمان وتی: من نابم بە پێشمەرگەی یەکێتی، دەبم بە پێشمەرگەی حسك، بردم بۆ لای قادر چاوشین خوالێیخۆش بێت نزیکەی مانگێك لەوێ بوو دواتر هاتەوە وتی: ئەڕۆمەوە تەسلیم دەبمەوە! زۆر هەوڵمدا نەڕوات، بەڵام هەر ڕۆی.

لە زستانی ١٩٨٩ماڵی کاك هەڵۆ هاتن بۆ ماڵمان نیوەڕۆ لەوێ بوون، دوایی چوون بۆ بازاڕ بۆ کڕینی پێداویستی خۆیان و ئێوارە گەڕانەوە بۆ پاش قەبران، دواتر کاك عومەر غریب و مامۆستا عەلا هاتن بۆ لامان شەو لامان مانەوە، بۆ بەیانی چووم بۆ بازار کیتەڵەیەك ماستی جوانم کڕی، کاك عومەر وتی: من ماست ناخۆم تەنها نان و گوێزی خوارد. دوای نانخواردن چوون بۆ قاسمەڕەش، دواتر جەزای برای فەهمی لەگەڵ خێزانەکەی هاتن بۆ ماڵمان بۆ ئەوەی پێکەوە بڕۆنەوە بۆ سلێمانی تەسلیم بینەوە، من زۆر هەوڵمدا لەگەڵیان کە نەڕۆنەوە، بەڵام دوای ئەوان رۆیشتن.

لە کۆتایی بەهاردا سەبری خانی کچی حاجی عەلی خانوویەکی بۆ گرتین لە ناوشاری سەردەشت پێیاندەووت: کەمەربەندی، دەکەوتە پشت دارۆخانەی مەولانی. ماڵی کەریمی شەوکەتی بوو، ماڵێکی باش بوون

دراوسێکانیشمان زۆر باش بوون وەکو ماڵی عەزیزی شێخی کە مامۆستای رەحیم بوو و مامۆستا رەفیق و محەمەدی ئەحمەدی و ئاغای رەزوانی و خزمەکانی خێزانم، وەکو لە سلێمانی بین وابوو، هەستمان نەدەکرد کە ئاوارەین. هەروەها چەند ماڵێکی عێراقی دراوسێمان بوون وەکو ماڵی فاتیح شوانی و عەبە خڕە و مامۆستا عادل و سالاری ٥٧ و هاوڕێکانی، تا راپەڕین لەو ماڵە بووین وەکو ماڵی خۆمان وابوو.

لە بەهاری ١٩٨٩ لەلایەن قەرارگای رەمەزانەوە بانگهێشت کراین بۆ بەشداربوون لە چلەی ئیمام خومەینی، لە سەردەشت دوو پاسی گەورەیان بۆ دابین کردین بردیانین بۆ قوم، لەوێ لە مزگەوتی حسەینییە جێگامان بۆ دابین کرابوو بۆ پشوودان، بۆ ئێوارەکەی بە رێپێوان سەردانی ماڵی ئیمام خومەینیمان کرد لە قوم، لە لایەن برایەکی ئیمامەوە پێشوازی لێکراین کە ماڵەکەی لە قوڕ دروستکرا بوو، دوو داری هەنار و هەنجیری تێدا بوو لەگەڵ کتێبخانەیەکی بچکۆلە کە لە حوجرە دەچوو. لە ماڵی پیاوێکی هەژاری ئیماندار دەچوو وەکو ماڵێکی کۆنی مەڵکەندی. شەو لە قومماینەوە بۆ بەیانی پاص ئامادە کرابوو بۆ چوونمان بۆ بەهەشتی زەهرا کە گۆڕی ئیمامی لێبوو. دوای مردنی ئیمام بەو چل رۆژە شەقامی قیر و فرۆکەخانەی تایبەت دروست کرابوو. کە چووینە ئەوێ زیاتر لە ملوێنێك جەماوەری لێبوو بە هەلیکۆپتەر ئاوپرشێنی جەماوەر دەکرا بۆ ئەوەی فێنك ببنەوە، چونکە گەرما کاریگەری لەسەر ئەو خەڵکە هەبوو، بە تایبەتی ئەو کەسانەی هەوڵی دەستلێدانی گۆڕەکەی ئیمامیان دەدا. نیوەڕۆ مەراسیمەکە تەواو بوو گەڕاینەوە بۆ قوم و لەوێ نانی ئێوارە خورا و شەو گەڕاینەوە بۆ سەردەشت. بەیانی زوو گەیشتینە زەمزیران لەوێ نانی بەیانیمان خوارد

كە بریتی بوو لە هەنگوینی كوێستان و رۆنەكەرەی كوردی، خواردنێكی شاهانە بوو. بۆ نیوەڕۆ هاتینەوە بۆ سەردەشت و هەر كەس بۆ ماڵی خۆی، چونكە ئەو ڕۆژە یەكەم رۆژی جەژنی قوربان بوو.

لەوكاتەدا ماڵمان هاتبووە سەردەشت، رۆژێك ژنێكی كاڵفام هات لەبەردەمی ماڵی ئێمە دانیشت، منداڵەكان نانیان بۆ بردبوو، لەگەڵ خواردنی نانەكەدا پێیوتبوون: ئێوە عێراقین چی دەكەن لێرە!؟ ئەوانیش وتبوویان: لە دەستی صەدام رامانكردووە! ئەویش بە دەم پێكەنینەوە وتبووی: بەخوا دەچنەوە بۆ عێراق، صەدام نامێنێت، ئێوە دەبن بە حكومەت ئەگەر پێتان بەڕێوە بچێت!؟! منداڵەكان پێیپێدەكەنین، ئەویش وتبوی: ئێوە من بە شێت دەزانن دوایی بۆتان دەردەكەوێت كە صەدام لە كون دێننە دەرەوە و مەحكەمەی دەكەن و دوایی عیدام دەكرێت!؟! بەڵام پێشینان وتوویانە: قسە یان لە شێت یان لە منداڵ! قسەكانی ئەو كاڵفامە هەمووی راست دەرچوو!

پاش ماوەیەك باری گوزەرانمان زۆر خراپ بوو، برادەرێكی كوردی ئێرانیم بینی سەر بە حیزبی دیموكرات بوو، ناردم بۆ لای ئەحمەدی برام بۆ ئەوەی كرێی خانووەكەم بۆ بنێرێت بۆ خەرجی منداڵەكان، كە چووبوو ئەحمەدی برام لێیتووڕە ببوو، وتبوی: من برام نییە بە ناوی حەمەكەریم، تۆ بۆ هاتووی بۆ ئێرە؟ خانووەكەمان لەوكاتەدا جاشێك داگیری كردبوو پارەی نەدابوونێ وتبوی: ئێرە ماڵی پێشمەرگەیە هەواڵی حكومەت دەدەم لێتان ئەگەر باسی پارە بكەن!؟ ئەو برادەرە زۆر پێیناخۆش بوو هەڵسابوو رۆیشتبوو، مەلێحەی براژنم خوالێیخۆش بێت دوای كەوتبوو وتبوی: من پارەت دەدەمێ، ئەو لە ترسی ئەمن ناوێرێت پارەت بداتێ، لێمان زووير مەبە، ئەو برادەرەی هێنابووەوە بۆ ماڵی

خۆیان، پارە و کەلوپەلی دابوو پێی بۆ ژن و منداڵەکانم، براژنە مەلێح زۆر دڵسۆزی منداڵەکان بوو، لە پاداشتی ئەوە کاتێك کوێستانی کچم ببوو بە ئەندام پەرلەمان، ئەحمەدی مامی نارد بوو بۆ حەج پێیووتبوو: دەبێت لەوێ حەجیش بۆ نەنە مەلیح بکەیت، لەبەر ئەوەی ئەو ئێمەی زۆر خۆشدەویست پاداشتی دەدەمەوە. منداڵەکان بە براژنمیان دەووت: نەنە، لە بری ئامۆژن، خوا لە خێری دەرنەکات حەجی بۆ هەردووکیان کڕیبوو. ئەو برادەرە ئێرانییە کە هاتەوە کەوتە گلەیی لە کاکم و مەدحی براژنم، منیش پێموت: زویر مەبە حیزبی بەعس ئەوەندەی باری خەڵکی شێواندووە کەس لە کەس ئەمین نییە. چەند جارێك ئەمن چۆتە ماڵی پێشمەرگە خۆیان کردووە بە هاوڵاتی، ئەوەی یارمەتی بۆ پێشمەرگە بناردایە دەگیرا و لە سێدارە دەدرا، لەبەر ئەوە کاکم ترساوە و نەیتوانیوە خزمەتت بکات من لە جیاتی ئەو داوای لێبووردنت لێدەکەم.
دوای هاتنەوەی کاکم لە حەج، کاك عەلی برای جەزای حەمە تالیب لە هۆزی میکایەڵی، چووبوو بۆ بەخێرهاتنەوەی کاکم، پێیوتبوو: ئەحمەد نیوەی ئەم حەجەی تۆ بۆ حەمەکەریمە کە نوێژیش ناکات!؟ چونکە بە پارەی کوێستانی کچی چوویت بۆ حەج، ئەگەر ئەو نەبووایە نەتدەتوانی بچیت بۆ حەج. کاك عەلی هات بۆ لام وتی: وام وتووە!؟ منیش وتم: نەدەبووایە وابڵێیت.

لە زستانی ١٩٨٩ بارەگامان لە پاش قەبران بوو لە جیاتی خانوو خێمەمان گەرم دەکرد، لە پشت ئاشەکۆنێکدا داری باشی لێبوو ماڵە ئێرانییەکان نەیاندەوێرا داری لێبەرن دەیانوت: چاکە! واتە شەخسە گوناحە داری لێبێنین. منیش عەتام پێش خۆمدا بوو دارم پێدەهێنا خوالێیخۆش بێت دەمووت: خەوم پێوە دیوە لە خەوما ئەم شەخسە

دەیووت: پاکم کەرەوە داری زۆر لێیە. ئەوان دەیانووت: گوناحـە.. بـەم دارانە تەواو گەرم بووبووینەوە خوا لە خێری دەرنەکات. ئەم بـارەگـایـە زۆرخۆش بوو بە سۆندە ئاومان راکێشابوو لە کانییەکەی لای مـاڵـی مـام ئەحمەد بۆ بەردەم بارەگاکە، پێشمەرگە هیلاك نەدەبوون بۆ هێنانی ئـاو و دار.

یەکێتی بڕیارێکی دەرکرد وتی: ئەوەی کاسپـی بـکـات و مـنـداڵ بەخێو بکات وەکو ئەوە وایە ئارپیچی بنـێـت بـە ڕژێـمـەوە، بـەڵام کـە زانییان خەڵك دەستی کردووە بە کاسپی بڕیـارەکـەیـان گـۆڕی وتـیـان: ئەوەی کاسپی بکات پێشمەرگە نییە دەبێت بگەڕێنەوە بۆ بارەگاکان!؟

لە زستانی ١٩٨٩ مەحمود ووسوو برای عەبدوڵلا ووسوو لـە دۆڵـەکـۆکـە پێشمەرگەی بارەگای ئێمە بوو، شەوێك بە رووداوێکی نادیار شەهـیـدیـان کرد، کەس نەیزانی کێیە! لەبەر ئەوەی دوژمندار بـوو، ئـێـمـە زۆرمـان پێناخۆش بوو لە ماڵی عەبدوڵلا ووسوو لە سەردەشت پرسەیان بۆ دانا.

ئەو ماوەیەی لە سەردەشت بووین خاوەن ماڵەکەمـان پـیرەژنـێـك بوو تەمەنی نزیکەی ١١٥ ساڵ دەبوو، لە لایەن کـچ و کـوڕەکـانـیـیـەوە خواردنی بۆ دەهات بۆی نەدەخورا، تا وای لێدەهات بـۆگـەنـی دەکـرد! دوایی دەیهێنا بۆ ئێمە دەیووت: با خەسار نەبێت!؟! منداڵەکان تـووڕە دەبوون و لێیانوەرنەدەگرت. ئەویـش تـووڕە دەبـوو! نـاچـار مـنـیـش لێموەردەگرت دوای ئەو فڕێم دەدا! پێمدەووت: خواردنێکی خۆش بـوو، ئەویش دەیووت: میرزا کەریم پیاوی چاکە. رۆژێك پشیلـەیـەکـی هـەبـوو بێزاری کردبوو شەو نەیدەهێشت بخەوێت پێیوتم: چی لێ بکەم؟ مـنـیـش وتم: بۆمی بگرە و بیخەرە گونییەکەوە، منیش نـاردم بـۆ قـاسمـەڕەش، دواتر پورە شۆکێ هەواڵی پشیلەکەی دەپرسی دەیـووت: بـێ خـزمـەت

نییه‌؟ منیش پێمده‌ووت: له‌ باره‌گاكه‌ی مام جه‌لال دامناوه‌ خه‌مت نه‌بێت هه‌موو رۆژێك نان و گۆشته‌، دوایی وه‌فاتی كرد خوالێیخۆش بێت.

له‌ به‌هاری ١٩٨٩ له‌ بازاڕ تووشی كاك حه‌مه‌ڕه‌شید گاپیلۆێنی بووم وتی: به‌ چییه‌وه‌؟ خه‌ریكی وتم: ده‌چمه‌ باره‌گا و جاروبار دێمه‌وه‌ بۆ ماڵه‌وه‌. وتی: ئه‌گه‌ر ده‌ستت به‌تاڵه‌ وه‌ره‌ له‌گه‌ڵ ئێمه‌ بۆ مه‌رزه‌كه‌ كاسپی ده‌كه‌ین. وتم: من خێزاندارم پاره‌م نییه‌! به‌ڵام خێزانم ئاڵتونی هه‌یه‌ ده‌یفرۆشم. چووین بۆ بازار ئاڵتونه‌كه‌مان فرۆشت و به‌ پاره‌كه‌ی ده‌ستم كرد به‌ كاسپی، كاك هه‌ڵۆش ١٠٠ هه‌زار تومانی دامێ، له‌گه‌ڵ كاك عه‌به‌خڕه‌ چووین بۆ مه‌رزه‌كه‌ له‌وێ دوكانێكمان كڕی له‌ بێده‌لان نزیك سوونێ، كه‌ هی شێرزادی برای شێركۆی شێخ عه‌لی بوو، دواتر عه‌لی ئاوه‌ژێیی بوو به‌ شه‌ریكمان، ده‌ستمان كرد به‌ كاسپی بۆ دابینكردنی بژێوی خۆمان.

یه‌كه‌م مامه‌ڵه‌ی كه‌ كردم له‌گه‌ڵ محه‌مه‌د گه‌به‌یی بوو كه‌ ١٠ ته‌ن فافۆنی پێفرۆشتم و پێیوتم: بچۆ له‌ ئێران بیفرۆشه‌ دوایی پاره‌كه‌م بۆ بنێره‌. فافۆنمان وه‌رگرت شێركۆی فاتیح شوانی و خالید گه‌به‌ی خۆیان كرد به‌ شه‌ریكم، له‌ سه‌رده‌شت ساخمان كرده‌وه‌ و پاره‌كه‌مان بۆ ناردووه‌ بۆ مه‌رزه‌كه‌ كه‌ خێرێكی باشی كرد. له‌ بێده‌لان هه‌رچییه‌ك له‌ عێراقه‌وه‌ بهاتایه‌ ده‌مانكڕی و ده‌مانبرد بۆ ئێران بۆ فرۆشتنی، ئه‌و رۆژه‌ی بیانووتایه‌ كه‌لوپه‌ل دێت ده‌چووینه‌ كه‌پره‌كه‌ی كه‌مال و جه‌بار كه‌ كوڕی حاجی مه‌جیدی كونه‌ماسی بوون، كه‌ پێشتر تووشی كێشه‌ی كۆمه‌ڵایه‌تی ببوون ماڵیان هاتبوو بۆ بێژوێ. له‌ كه‌پره‌كه‌ی ئه‌وان چاوه‌رێی كه‌لوپه‌لمان ده‌كرد، چونكه‌ كه‌پره‌كه‌یان نزیك بوو، له‌سه‌ر رێگای سوونێ بوو، هه‌ر شتێك بهاتایه‌ یه‌كه‌م جار له‌به‌رده‌می ئه‌و كه‌پره‌

دەڕۆی، كاتێك كەلوپەل دەهات دەبوو بە ڕاكردن ئەی ئەو كوڕەی بیگرتایە، هەر چییەك بیگرتایە دەبوو بە هی خۆی. ئەگەر كاتی ژەم بووایە نانێكی سادەی بۆ دروستدەكردین یان تەماتەی سوورەكراو بوو، وامدەزانی پلاو و گۆشتە! ئێمە وازمان لە پێشمەرگایەتی نەهێنا، بەلام شۆڕش ئێمەی پێ بە خێو نەدەكرا، بۆیە دەستمان كردبوو بە كاسپی، لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەوانەی كاسپییان دەكرد پێشمەرگە بوون، مەرزەكە نزیك بوو لە ڕەبایەكانی ڕژێمەوە بۆیە بە شەو پاسەوانی خۆمان دەكرد، لەوانە شێخ عومەری شێخ كەریمی حەفید و زوراری حاجی شێخ قادر و عەبەخڕە و من و صدیق كوێخا تەها خوالێیخۆش بێت و گەورەدێیەكان و گەڵاڵەییەكان و ئەحمەد باڵخی و خالید گەبەیی و شێركۆی فاتیح شوانی و بەهادین و هتد.

لە هاوینی ساڵی ١٩٩٠ڕۆیشتین بۆ سەردانی ماڵی حەمەڕەشید قەرەداغی لە گەندەسوورەی لای بانە، دوو شەو ماینەوە، كاتێكی خۆشمان بەسەربرد. لە گەڕانەوەدا چووینە سەقز بۆ ماڵی مامۆستا عەلا. ماڵی مەلا عەلی ئێرانیان بەجێهێشتبوو بەرەو سوریا. دوو شەو لە ماڵی مامۆستا عەلا بووین دواتر چووین بۆ سەرا بۆ سەردانی ماڵی محەمەد سمایل و ئامینەی مام عومەری ئامۆزام، دوو شەو ماینەوە و دواتر چووین بۆ مهاباد لەوێوە گەڕاینەوە بۆ سەردەشت.

لە سەردەشت ئێواران پیاسەی سەرچاوە و سەردانی دوكانی محەمەدی ئەحمەدیمان دەكرد، دەستماندەكرد بە قسەی خۆش و بەسەرهاتەكان، یەكێك لە قسە خۆشەكان كاك عەبدوڵڵای ڕەسووڵ پیرۆز بوو كە پێشتر پێشمەرگەی دیموكرات بوو هاتبووەوە، كاری شۆفێری دەكرد، ئەویش ئێواران دەهات بۆ ئەم دوكانە، هەروەها زۆر لە

کوردپەروەری سەردەشت دەهاتن بۆ لامان، لەوانە خانەوادەی رەحیمی و رەزوانی و خالقی و چەند خانەوادەیەکی تر. رۆژێك کاك محەمەد وتی: با بچین بۆ ماڵی کاك عەبدوڵڵا ژنەکەی لە زیندان ئازاد بووە، کە چووین کاك عەبدوڵڵا زۆری پێخۆش بوو وتی: میرزا کەریم وادەزانم باوکم زیندووبۆتەوە کە پێشمەرگەی کوردستانی عێراقی هاتووی سەردانم دەکەیت. منیش زۆر سوپاسم کرد و وتی: دەبێت شام واتا نانی ئێوارە لای من بکەن ئەوسا بڕۆن، بەڵام کاك محەمەد کاری هەبوو نەمانتوانی بمێنینەوە، خێزانەکەی لەسەر کاری سیاسی بەند کرابوو، هەرگیز چوونی دوکانەکە و قسەخۆشەکانم بیر ناچێت، بە تایبەتی ئەو قسەیەی کاك عەبدوڵا کە وتی: کورد دەست دەکات بە کونەماردا پێوەی دەدا دواتر دەستەکەی تری تێدەکات! ناڵێت من مار پێوەی داوم لەم کونەدا، بۆچی دەبێت دەستی پێدا بکەمەوە!؟

لە هاوینی ١٩٩٠ لەگەڵ ماڵی عەبەخڕە چووین بۆ ماڵی دەروێش عەبدوڵڵا کە خەزووری خالید گرژەیی بوو، پێشتر لە ساڵی ١٩٦٨ کرێچی ئێمە بوون لە سلێمانی، دوو شەوماینەوە و خزمەتێکی باشیان کردین، دواتر گەڕاینەوە بۆ سەردەشت.

لە هاوینی ١٩٩٠ کاك هەڵۆم بینی وتی: وەرە بابچین بۆ مهاباد بۆ پرسەی خێزانی ملازم عومەر کە کچی شێخ جەناب بوو، چووینە ئەوێ و رۆیشتین بۆ مزگەوت چەند کاتژمێرێك لە پرسەکە بووین، دواتر گەڕاینەوە بۆ سەردەشت.

لە هاوینی ١٩٩٠ خێزانی شەهید ئیسماعیل گەورەدێیی هات بۆ ماڵمان لەگەڵ مستەفای کوڕی، وتم: خێرە هاتووی؟! وتی: خەریکی کاری خێرین لەگەڵ ماڵی مەجیدی برای عەبدولقادر هەڵەدنی ژن بە ژنمان

کردووە، دەبێت بێیت بۆ گەوەلان بۆ شایی. منیش وتم: برازای خۆمە دێم بەسەرچاو. کە چووم کۆمەڵێك خزمی خۆی بانگ کردبوو تا ئێوارە لەوێ بووم و کاك ئەحمەدی برای شەهید سمایلم لەگەڵ بوو، هەموویان ڕێزیان لێگرتم، چونکە برادەری شەهید بووم لە کاتی پێشمەرگایەتیدا.

لە هاوینی ١٩٩٠ کاك محەمەدی سمایل و ئەنوەری کوڕی هاتن بۆ ماڵمان وتیان: دەچین بۆ پیرشێخ بۆ ماڵی باوکی عەلی شارستێنی بۆ ژن بە ژن تۆش وەرە، کە چووین بۆ ماڵیان دوای پشوو خوشکی ئەنوەرمان لە عەلی مارەکرد و خوشکی عەلیمان لە ئەنوەر مارەکرد، لەبەر ئەوەی کاك محەمەد دەستی کورت بوو یارمەتیم دان، لەگەڵ ماڵی کاك عەلی و باوکی سەردانی یەکترمان دەکرد.

لە زستانی ١٩٩٠ لەوکاتەدا صدام کوێتی داگیرکردبوو، خەڵك زۆر بێزار بوو ئەیان ویست هەرچۆنێك بێت ئێران بە جێبێڵن و بگەڕێنەوە بۆ سلێمانی، قاچاخچی دەگەڕا نەفەری بە ٧٠ هەزار تومان دەبرد بۆ یۆنان، پێم باش بوو بچم بۆ یۆنان لەگەڵ ماڵ و منداڵدا، مامەڵەم لەگەڵ قاچاخچیدا کردبوو کە بەهار بڕۆین، ئەو زستانە کاك سابیر ڕۆی حەزی دەکرد منیشی لەگەڵدا بم، بەڵام من نەڕۆیشتم ویستم بەهار بڕۆم، هەرچییەکی هەبوو من و کاك حەمەڕەشید لێمان کڕی، کۆمەڵێك سەڵت ڕۆیشتن بۆ یۆنان.

پێش شەڕی کەنداو ڕژێم لێبووردنی دەرکرد بە لێبووردنی خەنەبەندان ناسرا، خەڵکێکی زۆر ڕۆشتەوە بۆ عێراق، بە نامە خزمەکانم ئاگادارکرد کە چەند مانگێکی تر ڕاپەڕین دەبێت وریای گەنجەکانتان بن، خۆیان تەسلیم نەکەنەوە ئامادەی ڕاپەڕین بن. ئەو ماڵانەی کە چوونەوە بۆ ناوچەی ئێمە ڕژێم لە گۆمەڵگای پیرەمەگرون قاتعی ٩ یان بۆ

دروستکردن که موڵکی ئێمه بوو، تا ئێستا لەگەڵ حکومەتی هەرێم لە دادگادایین بۆ سەندنەوەی مڵکەکانمان. دوای ئەوە شەڕی کەنداو دەستیپێکرد و عێراق کوێتی بەجێهێشت و راپەڕینی باشووری عێراق بەرپا بوو، رژێم دەستی بە سەرکووتکردنیان کرد.

له ساڵی ١٩٨٩ له دوکانەکەی حەمەی مەلا کۆڵ دەستمانکرد بە کاسپی بە فرۆشتنی سەوزە و میوە، ئەو دەچوو بۆ مهاباد میوەی دەهێنا و رەحیمیش لەسەر دوکانەکە دەیفرۆشت، حەمەی مەلا کۆڵ رەحیمی دەناردەوە بۆ نانی نیوەڕۆ هەرچی له دەخیلەی دوکانەکەدا بووایە نەیدەهێشت تا کەشف بوو لەلایەن رەحیمی کوڕمەوە، پێش ئەوەی بڕواتەوە بۆ نانخواردن پارەی دەخیلەکەی ژمارد بوو، کە گەڕابووەوە خاڵە وتبوی: زۆرم فرۆشتووە کە سەیری دەخیلەکەی کردبوو کەشف ببوو کە خۆی بردبووی دوایی هێنابووی بەسەر کوڕی کچەکەیدا! بەڵام جێی باوەر نەبوو، بۆیە وازمان له شەریکایەتی ئەو هێنا، دواتر رەحیم چوو بۆ دارۆخانەی مەولانی.

کاك هەلۆ دوای پاش قەبران ماوەیەك ماڵی چوو بۆ سەقز لای ماڵی باوکی، دواتر هات بۆ سەردەشت خانوویەکمان بۆ بە کرێ گرت لە ماڵی حاجی محەمەدی خزمی خێزانم. ماوەیەکی باش پێکەوە بووین دواتر گواسترایەوە بۆ مەڵبەندی یەك له وشکەناو لای درزلّی، دواتر چوونە ئوولەژێر بەرامبەر کانی دینار. لەگەڵ مامۆستا عوسمان کانی پانکەیی گەڕاین بۆ گرتنی خانوو بۆ ماڵی کاك هەلۆ لە مەریوان، چونکە ئەو شارەزای مەریوان بوو خەڵکی زۆر لێدەناسین، بەڵام دەستمان نەکەوت، ناچار له کانی دینار خانوومان بۆ گرت، ماڵی کاك هەلۆ چوو بۆ کانی دینار، بەڵام ماڵی ئێمه له سەردەشت مایەوە، منیش چووم بۆ کانی

دینار بۆ لای کاك هەڵۆ بارەگامان دانا لە ئوولەژێر لای بارەگای جەمیل هەورامی کە لە کانی دینار نزیك بوو، بە پێ دەڕۆیشتین بۆ ئوولەژێر تا ئێوارە لە بارەگا دەبووین، دواتر دەچووینەوە بۆ کانی دینار، لە کانی دینار ماڵی نەسرەدین هەورامی لێبوو جارجار سەردانم دەکردن، شوێنێکی خۆش بوو، چونکە هەموو ماڵەکان عێراقی بوون، ماڵەکان هی سەردەمی شەڕی ئێران عێراق بوون، دوای شەڕ ئێرانییەکان گەڕابوونەوە بۆ مەریوان. بە کرێیەکی هەرزان دەدرا بە عێراقییەکان. ئەو شوێنە دوو کۆمەڵگابوون پێیاندەووت: جووجەسازی و کانی دینار، منیش هەمیشە لە نێوان کانی دینار و سەردەشت هاتووچۆم دەکرد.

لەسەردەشت هەموو شەوێك خەوم دەبینی بە شارێکەوە لە خوار قەرەچەتان من حاکمی بووم، دادگایی هاوڵاتیم دەکرد، هاوڵاتیانەکانی کەلوپەلی یەکتریان بردبوو، بۆ یەیانی بۆ منداڵەکانم دەگێڕایەوە دەمووت: من هیچ شارێکم لە خوار قەرەچەتانەوە نەدیوە چۆن خەوی پێوە دەبینم!؟ دوایی بۆم دەرکەوت کە ئەوشارە پیرەمەگرونە، باسی خەوێکی منداڵیم بۆ کردن لە خەوما داڵێك هەڵی گرتم بەسەر کۆمەڵێك شاخدا ڕۆیشتم و بەریدامەوە کە بەربوومەوە دەستم کرد بە هاوار باوکم وتی: بە خوا کوڕەکەم شێت بوو، چونکە هەموو گیانم کەوتەسەر ئارەقکردن، دوای ٥٠ ساڵ خەوەکەم هاتەدی کە سواری هەلیکۆپتەر بووم لەسەر سنوور دایبەزاندم. دوای ڕاپەڕین منیان کرد بە لێپرسراوی بەرەی کوردستانی بە فەرمانی خوالێخۆش بوو کاك نەوشیروان لە قەزای دوکان دەستمکرد بە دادگایی خەڵك! خەوەکەم هاتەدی.

لە زستانی ١٩٩٠ لە سەقزەوە دەچووم بۆ کانی دینار، کاك غەریب هەڵەدنیم بینی لە تەرمینالی سەقز لەگەڵ خێزانەکەی، ئەویش دەچوو بۆ

سنە، پارەی پاسەکەی بۆ دام و پێکەوە زۆر قسە و باسمان کرد دەربارەی ئەوەی من بچم بۆ پارتیزانی دوای ئەنفال و کیمیایی، پێی باش بوو لەگەڵیان بم، چونکە بنکەیەکی پارتیزانییان لە دۆڵەبی پشتی قەرەچەتان هەبوو، بەهۆی ئەوەی شارەزای ئەوناوە بووم بە چاکیاندەزانی ئەو مەفرەزەیە منیشیان لەگەڵ بم، کە بریتی بوون لە: بێستوون سابووراوایی و شوانە موخاخی و هتد. کاك غەریب پێیوتم: تۆ ناسراویت خەڵك زۆر دەتناسن و یارمەتی ئەو مەفرەزەیە دەتوانرێت بدرێت لە لایەن تۆوە، کۆمەڵگای پیرەمەگرون نزیکی ئەوانە و خەڵك دەتوانرێت ببینرێت، ناوی منی نووسی بۆ جەولەی دووەم بچم لەگەڵیان، جارێکی شەهید غەریب و بێستوون سابووراوایم بینی لە سەردەشت، کاك غەریب بە نیاز بوو کاك بێستوون رەوانەی ئەو مەفرەزە پارتیزانە بکات کە پێشتر چووبوونە خوارەوە، ئەوکاتە زستان بوو من ئامادە بووم بچمە خوارەوە، بەڵام شەهید غەریب وتی: ئەمجارە با کاك بێستوون بڕوات بۆ هاوین من و تۆ پێکەوە دەچینەخوارەوە، منیش بۆچوونەکەیم بە چاکزانی، دوای مانگێك شەهید غەریب هاتە لام وتی: کاك نەوشیروان بەتالیۆنێکی بۆ کردووینەتەوە پێمخۆشە لەگەڵ کاك هەڵۆ سەردانی کاك نەوشیروان بکەیت بۆ ئەوەی تۆ بگوازێتەوە بۆ ئەوێ، چونکە ئەم بەتالیۆنە ئیشوکاری ناوچەی ئێمەی لە ئەستۆیە کە شەهید غەریب لێپرسراوی بەتالیۆنەکە بوو، غەریب عەسکەری جێگری بوو بێستوون سابووراوایی رابەر سیاسی بوو.

رژێم گومانی هەبوو کە پارتیزانەکان لەو ناوچەیەن، زۆر هەوڵی دەدا بزانێت چۆن پێشمەرگە لەو ناوچە چۆڵانە دەژین و پەیوەندی بە خەڵکەوە دەکەن!؟ وای لێهاتبوو نووشتەی ناوچەوانی مانگای

دەکردەوە، بزانێت نامەیە بۆ ڕێکخستنەکان یان نا، کۆمەڵێك ماڵ یارمەتی پێشمەرگەکانی رەتڵی سووورداشیان دەدا وەکو ماڵی رەئوف دوکانی و شێخ رەئوف و شێخ عوسمان و رەسوول تەلانی و مام رەسوولی کرژە و شەوکەتی سووورداش و هتد، چەند برادەرێکی قەرەچەتانی فیرار بوون لە دۆڵەبی نەیاندەزانی بارەگای رەتڵی سووورداش لەوێیە، نامەیان بۆ من ناردبوو کە لەوێن بۆ ئەوەی کە چوومەوە بییانبینم، وەکو تەهای حمەئەمین، دوای ئەوەی بێستون سابووراوایی پەیوەندی بە رەتڵی سووورداشەوە کرد بوو کاك فوئادی ئەحمەد عەبدوڵڵا پەیوەندی پێیانەوە کردبوو بووبووەوە بە پێشمەرگە لەگەڵیان. لەکاتی هاتنیان بۆ ناو پیرەمەگرون چەند جارێك لەگەڵ پیاوەکانی رژێمدا تووشی بەریەککەوتن دەبوون و دەبوو بە شەڕ، بەڵام دەبووایە پارتیزانەکان خۆیان بپاراستایە، بۆیە زۆر شەڕ نەدەکرا ئەگەر بەریەککەوتن دروست نەبووایە.

لە پاییزی ١٩٩١ مام تەها دوکانێکی لە کەمەربەندی دانابوو، کە دولکە و لێوان و گوڵدانی لێ دانابوو، لەگەڵ کوڕەکەی ماوەیەك مانەوە، شەوێك هات بۆ ماڵی ئێمە کە محەمەدی ئەحمەدی لێبوو مام تەها زبری لێدەکرد دەیووت: دوکانێکم لە سەقز و دوکانێکم لە بانە و دوکانێکم لە مهاباد هەیە، ئەم دوکانەی ئێرەم بۆ پڕوپاگەندە داناوە، کێ بیەوێت دەچم لە عەجەمستان بۆیدەهێنم!؟ محەمەدی ئەحمەدی ئیشارەتی منی کرد وتی: ئاغا گیان دوکانێك لە شوێنێك دابنێ باشترە بۆ زیندەگی خۆت! زانی زبری لێدەکات، دوایی کە رۆی دیار نەما، خەڵك هەواڵیان لێ دەپرسیم، دیار بوو پارەی خەڵکی لابوو.

لە ساڵی ١٩٩٠ من چووم بۆ مەریوان کە هاتمەوە لە بانە مەلا بەکرم بینی، بەڵام ئێوارە درەنگ بوو، مەلا وتی: سەیارە نەماوە بۆ سەردەشت چی بکەین!؟ پاش ماوەیەك جێبێك هات راوەستا و مەلا یاسینی تێدابوو کە خەڵکی تەگەران بوو، هاواری دەکرد سەردەشت سەردەشت، دیار بوو سەیارەی کرِیبوو بۆ ئیشکردن، بەڵام شۆفێری نەدەزانی شۆفێری بۆ گرتبوو، من و مەلا بەکر سوار بووین، دواتر دکتۆر عومەر ماوەتی هات ئەویش سوار بوو لە رێگا تاریك بوو کە هیچ نەدەبینرا، مەلا بەکر ١٠ تومانی دایە لەبری ١٠٠ تومان بە منی وت: تۆش ١٠ تومانی بەرێ، بەڵام من بە قسەم نەکرد دیار بوو مەلا یاسین هەستی پێنەکردبوو! وتم: عەیبە. وتی: بە خوا وادەکەم، کە نزیك بووینەوە لە بازگەی سەردەشت مەلا بەکر دابەزی و چوو بۆ بێزیلە پاش ئەوەی ئەو کارەی کرد دواتر ئێمەشی گەیاندە سەردەشت.

لە ساڵی ١٩٩٠ لەگەڵ خێزانەکەم چووین بۆ نەڵاس بۆ سەردانی ماڵی عەبدوڵڵا خرِە، لەوێ دوکانی دارتاشی دانابوو وەزعی زۆر پێی باش ببوو، شەو لەوێ ماینەوە، کەژان لە خوێندنگەی سەردەشت دەیخوێند بە کاك عەبدوڵڵای وت: مێزێکم بۆ دروست بکە بۆ ئەوەی سەعی لەسەر بکەم، بەڵام زۆر نزم بێت، کاك عەبدوڵڵا پێیوت: بەسەرچاو کەژان گیان، کاك عەبدوڵڵا کچێکی هەبوو ناوی ماریا بوو لەگەڵ کچەکانی مندا نێوانی خۆش بوو، کە لە ماڵیان دەرۆیشین بەدواماندا دەگریا. کاك عەبدوڵڵا وتی: بە خوا بچینەوە بۆ عێراق چاومان بە یەك ناکەوێت، راستی کرد کە هاتینەوە بۆ عێراق کاتێك ماریامان بینی چوار منداڵی هەبوو، هەموویان کچ بوون.

لە هاوینی ١٩٩٠ کاك هەڵۆ هات بۆ لام وتی: با سەردانی خالید گەبەیی بکەین هەر دەڵێت ئێوە حساب بۆ من ناکەن، منیش بە چاکمزانی، چونکە خێزانەکەی ژنی چاك بوو زۆر نێوانی لەگەڵ منداڵەکانی من خۆش بوو، کاك هەڵۆ و خێزانەکەی و من و خێزانەکەم چووین بۆ بێزیلە بۆ سەردانی ماڵی خالید گەبەیی. کە چووین زۆر گەرم بوو لە سەربانی ماڵەکەی کەپری کردبوو بۆ ئەوەی فێنك بێت. رێزێکی زۆری گرتین و میوانداریيەکی باشی کردین، شەو ماینەوە و بۆ بەیانی گەڕاینەوە بۆ سەردەشت.

لە ساڵی ١٩٩٠ لەگەڵ ماڵی عەبدوڵڵا خڕە چووین بۆ بنەوخەڵەف کە دەکەوێتە سەر رێگای کانی زەرد و قاسمەڕەش، بۆ سەردانی ماڵی محەمەد خەلەکانی کە پیاوێکی بەڕێز بوو، شەو لەوێ ماینەوە، کۆمەڵێك ماڵی عێراقی لێبوو سەردانیان کردین، وەکو ماڵی سوارە و براکەی کە دوو برای بەڕێز بوون لە نێوان قاسمەڕەش و نۆکان بە جێب کاریان دەکرد، لە کاتی گفتوگۆدا وتم: منداڵەکان دەچنە خوێندنگە؟ وتی: لە راستیدا دوێنێ ئەم کچەمان لە سەربانی خوێندنگەکە بینیمان لەبەر لوولەی زۆپاکە خۆی گەرم دەکردەوە، کە چووە بۆ خوێندن نەچۆتە پۆلەکەی چۆتە سەربانی خوێندنگەکە لەبەر لوولەی زۆپاکە خۆی گەرم کردۆتەوە، تا خوێندنگە کەسی تێدا نەماوە دوایی هاتۆتەوە و ئێمەش وامانزانیوە دەخوێنێت، ئەوساڵە ئاوها خوێندویەتی، چیرۆکێکی زۆر ناخۆش بوو.

لە زستانی ١٩٩١ کاك هەڵۆ گەڕایەوە بۆ قاسمەڕەش، بارەگامان لەوێ دانا تا راپەڕین، ئەو گفتوگۆیەی لەگەڵ شەهید غەریب کردبووم لەگەڵ کاك هەڵۆ باسم کرد پێی باش بوو لەگەڵمدا هات بۆ لای کاك

نەوشیروان، لەوێ کاك کۆسرەت و صلاح چاوشینی لێبوو، کاك نەوشیروان زۆری بێ چاك بوو وتی: ئێمە بەرنامەی راپەڕینمان داناوە و نیازی چوونەخوارەوەمان هەیە، نامەی بۆ نووسیم وتی: بچۆ بۆ بەتالیۆنی ١٥ لەبەر ئەوەی خەڵکی قەرەچەتانی لە خوار قەرەچەتان گۆمەڵگایەکی لێیە ناوی پیرەمەگرونە، ١٠ هەزار ماڵی لێیە، پەیوەندی بە خەڵکەکەوە بکە. منیش وتم: کێ لەوێ لێپرسراوە؟ وتی: شێخ عەبدولکەریمی شەدەڵەی لێیە. منیش وتم: خۆزگە لەگەڵ کاك مولازم عومەر دەبووم، کاك نەوشیروان وتی: ئێمە کارمان بە تۆ هەیە لەوناوە، منیش قبوڵم کرد، کە چووم بۆ بەتالیۆن بارەگاکەی لە زەڵێ بوو ناوی خۆم نووسی و دوای چەند رۆژێك گەڕامەوە بۆ سەردەشت، تەها سێکانیانی هەواڵی منی پرسی بوو بۆ ئەوەی بمبینێت، ماڵی منیان نیشان دابوو، کە هاتمەوە بۆ ماڵەوە بینیم مووچەی ٣ مانگی بۆ هێنابووم، چونکە ئەو لێپرسراوی ئیداری بوو.

لە مانگی یەکی ١٩٩١ خەریکی خۆ ئامادەکردن بووم بۆ گەڕانەوە، کۆڵێکم بە کۆڵەوە بوو برادەرێکی خۆمم بینی ناوی خالقی بوو لە گۆرانی وتندا دەنگێکی خۆشی هەبوو وەکو تایەر تۆفیق، وتی: میرزا کەریم بۆ کوێ دەچیت؟ تێمگەیاند کە نیازی راپەڕینمان هەیە و صدام تووشی شکست بووە و شارەکانی لێ پاك دەکەینەوە. خالقی وتی: بەلامەوە سەیرە، بەڵام چونکە جێگەی باوەڕ بووم بڕوای کرد. پێیوتم: میرزا کەریم پیاوی چاك بە مەڕۆ با دوکان بکەینەوە لەگەڵ عەبدوڵلا رەسوول و محەمەدی ئەحمەدی کاسپی دەکەین و زۆر قازانج دەکەین، چونکە برادەرم بوو باسی شۆڕشمان دەکرد، ئاگای لە شکست و هەڵسانەوەمان بوو، منیش بە پەلە بووم وتم: رێزم بگەیەنە بۆ برادەران فەرمانم پێکراوە

دەبێت زوو بڕۆم. دڵی پڕ بوو لە گریان و باوەشی پێداكردم و پێیوتم: پیاوی چاك بە ئاگات لە خۆت بێت، منیش خوا حافیزیم لێكرد و وتم: ئەگەر مام دەتبینمەوە ئەگەر مردم گەردنم ئازاكە. دوایی چووم بۆ قاسمەڕەش، چونكە بارەگای بەتالیۆن هاتبووە قاسمەڕەش، چەند ڕۆژێك لەوێ بووم خەریكی خۆئامادەكردن بووین بەرەو بێتووش.

لە مانگی ١ ی ١٩٩١ لای كاك هەڵۆم بەجێهێشت و پەیوەندیم كرد بە بەتالیۆنی ١٥ كە سەر بە میحوەری ٤ بوو، شێخ عەبدولكەریم لێپرسراوی میحوەر بوو.

پێش راپەڕین یەكێتی نیشتمانی بەرنامەی راپەڕینی دانا و هێزی ئامادەكرد بۆ خوارەوە، منیش لە بەتالیۆنی ١٥ بووم بەرێكەوتین بۆ بێتووش بە پاس لە دەرماناوێ و پێورانەوە، بۆ ئێوارە چووینە بێتووش كە هێزێكی ١٥٠ كەسی لێبوو، پێشتر مەفرەزەیەكمان ناردبوو بە سەرپەرشتی مەلا تایەری كلێسە كە شارەزای بەستنی كەڵەك و پەڕینەوە بوو لە ئاودا، بەڵام ئەو زستانە باران زۆر دەباری هەر كەڵەكیان دروست دەكرد بۆ پەڕینەوە و ئاو دەیبرد، كە چووینە ئەوێ بارەگاكە بچووك بوو مزگەوتەكەش پڕ بوو لە پێشمەرگە، من و مەلا بەكر و برادەرێكی قەمچۆخە چووینە بارەگای پارتی لای هێزی رزگاری كە پێشتر حاجی مەحمودی گەورەدێ لێپرسراوی بوو خوالێیخۆش بێت، لە لایەن رژێمەوە گیرابوو لای پیرەمەگرون كەوتبووە كەمینی سەربازییەوە، كاتی راپەڕین لە ئەمنە سوورەكە ئازاد بوو. لەبری ئەو فەقێ سمایلی جاف لێپرسراوی هێزی رزگاری بوو، كە چووینە ئەوێ ٦ پێشمەرگەی پارتی لێبوو وتیان: ئەو هێزە چییە هاتووە بۆ ئێرە ! ؟ مەلا بەكر وتی: ئاگادار نین! راپەڕین دەكەین و هێزە هاوپەیمانەكان دژی صدامن ئێمەش دەست بەسەر

شارەکاندا دەگرین. وتیان: نە بابە بە راستانە!؟!؟ گاڵتەیان پێدەهات. وتمان: دیارە ئێوە فەرمانتان بۆ نەهاتووە ئاگاتان لێی نییە!؟ وتیان: نەوەڵا ئاگامان لێی نییە و هیچ فەرمانێکمان بۆ نەهاتووە. وتیان: ئێمە لە دەست کیمیایی رامان کردووە بەرگەی کیمیایی تر ناکرین و ناچین بەر کیمیایی بکەوین، ئەوە صەدامە تا یەك پیاوی ما بێت بەرگری دەکات و لە ناومان دەبات، چۆن دەهێڵێت شارەکان بۆ پێشمەرگە بێت، بۆ بەیانی چووینەوە بۆ بارەگای خۆمان بەمشێوەیە دەستمکردەوە بە شۆڕش کاتی راپەڕین.

لە کۆتایی مانگی ٢ی ١٩٩١ دەستمانکرد بە رۆیشتن بۆ خوارەوەك لەسەر قەدەغە و قندۆڵ تێپەرمان کرد پاسدارەکانی ئەو ناوە دەستیان بە تەقەکردن کرد، چونکە کەوتینەناو حەقڵی ئەڵغامەوە، بەڵام ئێمە ناشارەزا بووین هەر رۆیشتین، نزیکی بارەگای گەناو بووینەوە سەربازەکانی عێراق هاتن خۆیان تەسلیم کرد، لەوکاتەدا بە سەربازەکانمان وت: ئێمە پێشمەرگەین دەچینەوە بۆ ئەودیو ئەگەر دێن لەگەڵمان بن وەرن، ئەگەر نا بچن بۆ ئێران. پێیان باش بوو بڕۆن تەسلیمی ئێران بن، ئێمەش چەند کەسێکمان لەگەڵدا ناردن بۆ لای پاسدارەکان، لەوکاتەدا شێخ عەبدولکەریم هات لەسەر بەردێك دانیشتین نامەیەکی بۆ کاك نەوشیروان نووسی وتی: بگەڕێرەوە بۆ لای ئەو، چونکە راپەڕین لە رانیە بووە و ئازاد کراوە، ئێمە لەو رێگایەی بۆمان نیشانکراوە ناڕۆین، چونکە حەبل و کەڵەك ئاو بردی، بۆیە دواکەوتین لەبەر ئەوە لە رانیەوە بە سەیارە دەڕۆین بۆ دوکان، تا ئەوان چوون دوکان و پیرەمەگرون راپەڕی بوون، مەفرەزەکەی رەتڵی سووورداش لەگەڵ شانە چەکدارەکانی پیرەمەگرون، پیرەمەگرونیان ئازاد کردبوو.

لەوکاتەدا ئەڵغامێك تەقییەوە لای گەناو تەها سێکانیانی قاچی لە دەستدا، شێخ عەبدولکەریم پێیوتم: نامرێت بە پەلە بیگەیەنە سەردەشت. منیش لەگەڵ دوو پێشمەرگە هەر ئەوشەوە گەیاندمانە بێتووش و لەوێوە بە سەیارە گەیاندمانە سەردەشت بۆ چارەسەرکردن، بۆ بەیانی گەڕامەوە زەڵێ چووم بۆ لای کاك نەوشیروان بۆ ناردنی نامەکە، لەوێ حاکم قادر و مەلا یاسین و نەبەز و کاك هەڵۆ و چەند کەسێکی تری لێبوو وتیان: چۆنە تۆ دابەزی بووی گەڕایتەوە، منیش رووداوەکەم گێرایەوە و ویستم نامەکە بدەم بە کاك نەوشیروان حاکم قادر وتی: نامەکەی نەدەیتێ! داخی مەسعود بەرزانی بە تۆ دەڕێژێ لە داخا سەری بە دیوارا دەکێشێت!؟ وتیان: ئێمە دەچین بۆ سلێمانی چونکە راپەڕین بووە تۆش لەگەڵ ئێمە وەرە، منیش وتم: ئێوە دەچنەوە بۆ سلێمانی من کارم لەوێ نییە، من دەچمەوە بۆ میحوەری چوار.

لەگەڵ کاك ئەحمەد و چەند خزمێکی گەورەدێی لە شێنێوە بە سەیارە چووین بۆ رانیە، لە رانیە چاوم بە کاوە کلکەسماقی کەوت کە جێبێکی قیادەی پێبوو وتی: تۆ خۆت جیابکەرەوە من دەتبەم بۆ پیرەمەگرون، ئەوان رۆیشتن و منیش چووم بۆ بارەگای حیزبی شیوعی لەوێ کۆمەڵێك برادەری کۆنم بینی، دوایی لەگەڵ کاوە چووین بۆ حاجی ئاوا لەوێ خزمی لێبوو بەنزینیان بۆ پەیداکرد دوایی بەڕێکەوتین بۆ پیرەمەگرون، لەوێ بەتالیۆنی ١٥ بارەگایان دانابوو لە شوێنی رێکخراوی حیزبی بەعس. کە چووم ئەحمەد مەولود و شێخ فەرهاد و مەلا بەکری لێبوو، وتیان: تۆ لای ئێمە بمێنەرەوە و هێزەکەی میحوەری چوار بەرەو کەرکوك رۆی. بۆ ئێوارە چووینە ماڵی حاجی مەولود بەڕێکەوت حاجی مەولود دراوسێی ئامۆزاکانم بوو نەمزانی بۆ بەیانی ویستم بچمەوە بۆ

بارەگا حەسەن و ئازادی ئامۆزام بینی وتیان: چی دەکەیت لەمناوە؟!
وتم: هاتووینەتەوە. وتیان: ئەمانە هەمووی ماڵی ئێمەیە. کە چوومەوە بۆ بارەگا ئامۆزاکانم هەموویان هاتن بۆ لام و صەلاحی مام حسەین بە چەکەوە بوو بە پێشمەرگە لەگەڵم، بۆ بەیانی چوومە سلێمانی و سەردانی ماڵی ئەحمەدی برامم کرد تا ئێوارە لەوێ بووم و گەڕامەوە بۆ بارەگا. لە پیرەمەگرون خەریکی کاری حیزبی و بەرەیی بووین خەڵکمان ڕێکدەخست و ئیشوکارمان بۆ دەکردن کە بریتی بووین لە من و شێخ فەرهاد و مەلا بەکری جاسەنە و حەمە رەئوف دوکانی و ئەحمەد مەولود کە هەر یەکەمان ١٥–٢٠ پێشمەرگەی خزمی خۆمان لەگەڵ بوو.
لە ٢٠ / ٣ / ١٩٩١ کاك بێستوون سەردانی کردین بۆ ئەوەی بزانێت تەقەمەنیمان لایە بۆ بەرگری. لە قەرەهەنجیر لە کاتی پاشەکشێدا مەلا خالید تەیارە لێی دابوو شەهید ببوو، لەگەڵ صەلاح چووین بۆ پرسەکەی لە مزگەوتی حاجی فەرەجی سووسێ.

بۆ بەیانی لە ماڵی جەمالی مەلا محەمەد بووم هەواڵ هات وتیان: خەڵك لە کەرکوکەوە کۆڕەوی کردووە، لەو کاتەدا عەلی ژنبرام و بەکری مام عەبدوڵڵا هاتن بۆ لام، چووین بەرەو چەمچەماڵ بزانین هەواڵ چییە؟ کە چووینە دەربەندی بازیان تەیارە بۆردومانی دەکرد و خەڵك و پێشمەرگە کۆچڕەویان دەکرد، کاك بەکر وتی: من بەرمیلێك بەنزینم لایە لە باینجان دەچین دەیهێنین، لەسەر ڕێگای باینجان کۆپتەر بۆردومانی دەکرد کۆمەڵێك لاشە لە دەوروپشتی جادەکە کەوتبوو، باینجان چۆڵی کردبوو بۆ سلێمانی، بەرمیلە بەنزینەکەمان سەرخست و گەڕاینەوە بۆ سلێمانی، لە ڕێگا کۆپتەر بۆمان نزیکبووەوە و ئێمەش دادەبەزین و خۆمان دا بە زەویدا، وایاندەزانی مردووین! لە تەیناڵ مام عەبدوڵڵا و

منداڵەکانیانمان بینی بە پێ دەڕۆیشتن بۆ سلێمانی، پێمانووتن: سەرکەون. وتیان: بەپێ دێین. عەلیش ئاگای لە کەسوکاری نەما لە چەمچەماڵ. کە هاتینە سلێمانی لێکدابڕاین و ئێمە چووینە ماڵە خزمەکانی خۆمان، بۆ شەو چەند کەسێکی قەرەچەتانی سەردانیانکردم بڕیارماندا پێکەوە سلێمانی چۆڵ بکەین، بۆ بەیانی دارای ئامۆزام پاسەکەی پڕکرد لە ماڵ و خێزان و رۆی جێگای سەلّتی نەکردەوە. من و صەلاح و شەریف و مام ئەوڕەحمان و هیوا بەرەو ئەو شوێنە چووین کە پێشتر دامانانابوو لەگەڵ شێخ فەرهاد و شێخ ئەحمەد پێکەوە بڕۆین، بەڵام چاوەڕێی ئێمەیان نەکردبوو ڕۆیشتبوون، ئێمەش لای مەکتەبەکەی زەرگەتە سالاری ٥٧ مان بینی وتی: شار چۆڵ بووە بگەڕێنەوە بۆ ئێران. تەیارە بەسەر سلێمانیدا دەسووڕایەوە، خەڵك جادە و جادە دەڕۆی، من پێمباش بوو بە شارەزایی خۆم بڕۆین، چووینە لای کارگەی چیمەنتۆی سەرچنار لای خانوویەك لاماندا نایلۆنی لێبوو بۆ ئەوەی دلۆپە نەکات، بە شەریفم وت: سەرکەوە ئەو نایلۆنە داگرە. لەوکاتەدا تەیارە بووردومانی قلیاسان و باخی بەختیاری دەکرد لەوە دەچوو سوپای رژێم هاتبێتە ناو سلێمانی، دوای داگرتنی نایلۆنەکە بەرێکەوتین بەرەو هەناران، لەوکاتەدا تەیارە بۆردومانی لای ئێمەی کرد بە دۆشکە، خێزانێك لە پێشمانەوە بوو منداڵیان بەجێهێشت و خۆیان رایانکرد، ئێمەش منداڵەکانمان لەگەڵ خۆمان برد، وردە وردە بۆ گوندی سنگر بۆ ئێوارە لەوێ منداڵەکانمان تەسلیمی خێزانیان کردەوە، ئێمە رانێك گۆشتمان دەستکەوت چووین لە کەلاوەیەك نایلۆنەکەمان دابەسەریا و بەردمان خستەسەر، داری لێبوو بەکارمانهێنا بۆ خۆگەرمکردنەوە، وەکو ژووری لێهاتبوو هەستمان بە سەرما و هیلاکی نەکرد، بارانیش بەردەوام

دەباری. بۆ بەیانی چووین بۆ قوڵەجاغ، بەڵام بە ئەڵغام چێنرا بوو چەند کەسێك ئەڵغامی پێدا تەقیبوو، من ڕێچکەیەکم گرت وتم: لامەدەن بە دوامدا بڕۆن، چونکە پێشتر وڵاخ و خەڵك پێیدا ڕۆیشتبوون هەمووی تەقیبووەوە و هەر بارانیش دەباری، گەیشتینە ڕێگای گاپیلۆن و کارێزە ئەڵغام نەما، هەر سەیارە و مەکینە بوو لادرا بوو یەکی کەوتبوو خاوەنەکەی بەجێیهێشبوو! بۆ ئێوارە هاتینە ماوەت و نایلۆنەکەمان دابوو بەسەرماندا بۆ ئەوەی تەڕ نەبین. کە چووینە ماوەت خێمەیەك درابوو بەسەر خانوویەکی بلۆکدا بە چۆڵی، چووینەناوی و پشووماندا کە تاریك داهات عەریف دەروێش هات وتی: حمە کەریم قەرەچەتانی دەبێت جێگامان بکەنەوە، ئێمەش جێگامان کردنەوە خێزانیان لەگەڵ بوو، برنجێکی سووریان لێنا و لەگەڵیان خواردمان، بۆ بەیانی گەیشتینە سەرچەم بە نایلۆنەوە، لەوێ جۆلانە بەرنەدەکەوت بۆ پەڕینەوە، لە ڕێگا پەروینی مامە عەلی و کچێکیمان بینی دابڕا بوون لە مامە عەلی و حاجی سەلیم، چەند ڕۆژێك لەسەر چەم بووین، من پێمووتن: ئێوە بە شێنەیی وەرن من دەپەڕێمەوە بۆ ئەوبەر، پاش خوداحافیزی پەڕیمەوە بۆ ئەوبەر و لەوێ محەمەدی هەباسم بینی وتی: ئەو ماشێنە بۆ سەردەشت دەچێت ناسیاوە بڕۆ لەگەڵی، منیش سواری ماشێن بووم گەڕامەوە بۆ سەردەشت، لەوێ خێزانم چووبوو بۆ ئۆردووگای بانە هەواڵی منی پرسیبوو وتبوویان هەموویان شەهیدبوون، کە چوومەوە پێمووتن کەس شەهید نەبووە مەلا خالید نەبێت.

لە کاتی کۆڕەوەکەدا زۆر کەس سەیارەکەی بە کەلوپەلەوە بە جێهێشتبوو، خەڵك دەچوون کەلوپەلەکەیان دەبرد و سەیارەکەی دەمایەوە، سەیارەی وا هەبوو پەنجەر ببوو خاوەنەکەی خەریکی

تایەکەی بوو، یەکێکی تر خۆی تێکنەدەدا و خەریکی تایەی دیوەکەی تری بوو! خاوەنەکەی کە پێیدەزانی دەیووت: کاکە ئەوە چی دەکەیت؟ ئەویش خۆی تەریق نەدەکردەوە و پێیدەووت: ئەمدیوی بۆ تۆ و ئەودیوی بۆ من!؟ خاوەن سەیارەکە هاواری دەکرد دەیووت: برا سەیارەی خۆمە تۆ شەڕی چیم پێدەفرۆشیت!؟ ئینجا کابرا دەرۆیشت. حەمە سەعیدی پوورزام شەڕواڵەکەی شتبوو، بە هەر دوو دەستی هەڵیخستبوو بە دەرپێ کورتێکەوە خەوی لێکەوتبوو، ژنێك شەڕواڵەکەی لێسەندبوو خەبەری نەبووبۆوە، بە دەرپێ کورتێکەوە بەناو خەڵکەکەدا رۆیشتبوو! وتبوویان: کاکە ئەوە بۆ وات لێهاتووە!؟ ئەویش رووداوەکەی دەگێرایەوە!؟

کە چوومەوە بۆ ماڵەوە بینیم زۆربەی ماڵە خزمان لەوێ بوون، جێگامان نەدەبووەوە، پێشتر ئەو هەواڵەمان بیستبوو، ئازوقەیەکی زۆرمان کۆکردبووەوە لە پشت ژوورەکەی خۆمان دارێکی زۆر هەبوو بەکارمانهێنا بۆ سووتاندن، پەکمان لە هیچ نەدەکەوت، پێشتر ژمارەی تەلەفۆنی خاوەن ماڵەکەمان دابوو بە خزمان بۆ ئەوەی لە کاتی هاتندا سوودی لێ ببینن.. لە ماڵیشەوە کەس هەستی نەدەکرد کە ئاوارەیە، رەحیمی کوڕم لەسەر دارۆخانەی مەولانی ئیشی دەکرد، هەر کەسێك پێویستی بە دەرمان هەبووایە بۆی دابین دەکرد، لەوکاتەدا مام عەلی سۆیلە و کوڕی مام رەحیم هاتبوون، چەند شەوێك پشوویان دا و دواتر گەڕانەوە بۆ سوونێ، چونکە منداڵەکانیان چووبوونە ئەوێ.

دوای هەفتەیەك شێخ ئەحمەد و شێخ فەرهادم بینی خەریکی کڕینی کەلوپەل بوون بۆ ئەو پێشمەرگانەی لە خوارەوە بوون، پێیانوتم: سەیارەمان لەسەرچەم داناوە بۆ گەیاندنی کەلوپەلەکان، دێیتەوە

لەگەڵمان بڕۆینەوە خوارەوە؟ منیش پێمباش بوو، تا ئەوان كەلوپەلیان كڕی منیش چوومەوە خۆم كۆكردەوە بۆ خوارەوە و بە منداڵەكانم وت: ئاگاتان لەم میوانانە بێت من دەڕۆم. چووم بۆ لایان و سەیارەمان گرت بۆ سەرچەمی كەڵوێ، بە سیم لە چەم پەڕینەوە، لەوبەر سەیارەی خۆمان چاوەڕێی دەكردین، كە چووین نیوەڕۆ بوو بسكیتمان پێبوو خواردمان و چووین بۆ ماوەت. بارەگای خوالێخۆش بوو جەبار فەرمان لەوێ بوو سەرپەرشتی هێزی پێشمەرگەی دەكرد، ئەویش پارە و پێداویستی داپێمان و پێیووتین هێزەكانی خۆتان لە شەدەڵە كۆبكەنەوە. ئێمە ئێستا دیالۆگمان هەیە لەگەڵ رژێم بزانین چی روودەدات؟ بۆ ئێوارە چووینە بەرگەڵوو كە بارەگای بەتالیۆنی ١٥ لەوێبوو، غەریب عەسكەری سەرپەرشتی دەكرد، چونكە غەریب هەڵەدنی بریندار بوو چووبۆوە بۆ سەردەشت، لەوێ كەلوپەلەكانمان دانا و شێخ فەرهاد مایەوە، من و شێخ ئەحمەد و مەلا بەكر هاتین بۆ شەدەڵە، لەوێ شێخ عەبدولكەریم و ئەحمەد مەولود و چەند پێشمەرگەیەك لەوێ بوون بارەگایان لەسەر كانی و ئاوی ماڵە مەڕەكەی ماڵی شێخ عەبدولكەریمی گەورە دانا بوو، كە چوومە ئەوێ شێخ عەبدولكەریم پارەی دا بە ئەحمەد مەولود و مۆڵەتی دایە بچێتەوە بۆ سەردەشت بۆ سەردانی ماڵ و منداڵی.

دوای پشوو شێخ عەبدولكەریم پێیباش بوو لەو ئێستگەیەی دەنگی گەلی كوردستان كە لە شەدەڵە دانرا بوو بروسكەیەك بكەم، ئەم بروسكەیە بۆ ئەوە بوو هەرچی پێشمەرگەی پیرەمەگرون و دوكان هەیە پەیوەندییان بە منەوە هەبووە و لە دوای كۆچڕەو دابڕابوون بێنە شەدەڵە بۆ دووبارە رێكخستنەوە. چەند رۆژێك دوای ئەوە سەركەوتی مامە عەلی و صەلاحی مامە حسەین هاتن و دوای ئەوان رەفیق و رزگاری

مام عەول هاتن، لەوێ مەلا بەکر و خزمەکانی و براکانی ئەمحەد مەولود و ئامۆزاکانی نزیکەی ٢٠ کەس دەبووین، کاك عەبدولکەریم پێی باش بوو بارەگای رێکخستن و بەرەی کوردستانی جیابکرێتەوە لە بارەگای میحوەری چوار، منیش بە چاکمزانی، چووین کانی و ئاوێکمان دۆزییەوە پێیاندەووت: کانی و ئاوی محەمەدی حاجی حسەینی شەدەڵە، کە شوێنێکی لەبار بوو بۆ بارەگا. بارەگای بەرەی کوردستانی و رێکخستنمان بردە ئەوێ، لە کاتی خێمە هەڵداندا ئاسنێکمان لێ عاسی بوو کە کونی تێدا نەبوو بیکەین بە عاموودی خێمەکەدا! وتم: صەلاح بیگرە و دوایی یەك فیشەکم پێوەنا لەو شوێنەدا کە ویستمان کون بوو، هەموو دەستیان بە پێکەنین کرد وتیان: بە خوا شەریکەش وا کونی ناکات! خێمەم هەڵدا و ئازوقەی باشمان لابوو، لەوێ ماڵێکی مەڕداری لێبوو ژنەکەی خزمی خۆمان بوو ناوی کافییە بوو، خوشکی خەلیل عارف بوو لە تەڕەمار، هات بۆ لامان داوای برنج و رۆنی لێکردین، ئێمەش وتمان: هەموو رۆژێك وەرە برنج و رۆن بەرە، بەڵام تۆ دەبێت هەموو بەیانییەك بێ ماستمان نەکەیت. چووین بەرمیلێکمان دۆزییەوە کردمان بە تەندور، داری زۆر لەوناوە هەبوو، هەموو رۆژێك نانی گەرم و ماستی فرێشمان دەخوارد، چەند بارەگایەکی تر لەوناوە بوون سوودیان لەو تەندورە بینی بۆ نانکردن، لەبەر ئەوەی نەیاندەزانی چۆن تەندور دروست بکەن. چەند رۆژێك لەوێ ماینەوە، رۆژێك مەلا بەکر هاتە تەنیشتمەوە پێیوتم: خێمە و ئازوقەیەکی زۆر لەسەر کانی سوێسکەی پشت جاسەنە بە جێماوە بۆ نەچین سوودی لێوەر بگرین؟ بڕیارماندا من و مەلا بەکر و خزمەکانمان بچینە ئەوێ، چووینە ئەوێ ماوەیەك لەوێ بووین و بەرنامەمان دانا کە چۆن بچینەوە بۆ پیرەمەگرون، رێکخستن

هاتن وتیان: سوپای رژێم ناوێرێت بچێتە پیرەمەگرون تەنها لەسەر جادە دەمێننەوە، باشترە بارەگا بەرینە ناو پیرەمەگرون، لەو کاتەشدا ئەحمەد مەولود گەڕایەوە، رۆژێك شەوقی کوێخا سمایل سەردانی کردین کە لە ئێرانەوە گەڕابووەوە و ئێمەش رەوانەی دوکانمان کرد، کە چووینەوە بۆ پیرەمەگرون رژێم توانای ئەوەی نەبوو رووبەڕوومان بێتەوە و لە جادە نەدەهاتەخوارەوە. لە پشتی تەڕەمار رەبایەکی لێبوو، لە لای مەشروعی ئاوەکەش رەبایەیەکی تری لێبوو، بارەگای بەرەی کوردستانیمان دانا و پەیوەندیم کرد بە قادر چاوشین لە حسك و نادر قەڵادزێیی لە پارتی بۆ دانانی نوێنەری خۆیان لە بەرەی کوردستانی، عەلی سەرگەڵوویی وەك نوێنەری پارتی و سەلامە سوور وەك نوێنەری حسك دەستنیشانکران.

لە کۆتایی مانگی شەش کاك هەڵۆ و مامۆستا عەبدوڵڵا هاتن کۆبوونەوەمان کرد کە کۆمیتەی رێکخستن دابنرێت، ئێمەش پەیکەری کۆمیتەمان دانا و بڕیارمان دا کە ئەوانەی کەرتی رێکخستنیان لابوو بیانکەین بە ئەندام کۆمیتە لەوانە: فەرەیدون کرژەیی بۆ کەرتی چەمی رەزان، سەرچنار بۆ کەرتی رێکخستنی پیرەمەگرون، رەئوف دوکانی بۆ کەرتی سووورداش، بارزان بۆ کەرتی دوکان و بەنداوەکەی، چەتۆی مام صالح بۆ کەرتی بنگرد. کاك هەڵۆ و مامۆستا عەبدوڵڵا پێیان باش بوو من ببم بە لێپرسراوی کۆمیتەی رێکخستن، بەڵام شێخ عەبدولکەریم بوو بە کۆسپ لەبەر ئەوەی وتی: ئێمە پێویستیمان بە کەسێکی بەهێز هەیە بۆ بەرەی کوردستانی، لەبەر ئەوەی مامۆستا عەبدوڵڵا و شێخ عەبدولکەریم شۆڕشگێڕان بوون قسەی کاك هەڵۆیان پشتگوێخست و کاك ئەحمەد مەولودیان کرد بە لێپرسراوی کۆمیتەی رێکخستن و منیشیان کرد بە

لێپرسراوی بەرەی کوردستانی. لەگەڵ ئەوەشدا من کارگێڕی کۆمیتە بووم لەگەڵ مامۆستا فایەق.

لە ساڵی ١٩٩١ لە پیرەمەگرون بووم لە کۆمیتەی ڕێکخستن و لێپرسراوی بەرە بووم لە قەزای دوکان، هەموو ڕۆژانی هەینی لەگەڵ چەند برادەرێك کە دەچوون بۆ کێلێ بۆ مامەڵە پارەیان پێ بوو وەکو محەمەد گەبەیی و خالیدی برای و سیروانی کوڕی کە دۆستی چاك بوون، کاتی خۆی ماڵمان لە گەبە بوو لەگەڵ ئەو ماڵە نێوانمان خۆش بوو، ئەوان لە سلێمانییەوە دەهاتن بەیانی زوو بۆ پیرەمەگرون هێشتا دنیا ڕووناك نەدەبووەوە، منیش لە سەربانی بارەگا چاوەڕێم دەکردن، دوای هاتنیان لەگەڵیان سوار دەبووم بۆ کاتژمێر ٨ی بەیانی دەگەیشتمە کێلێ و بە نیو کاتژمێر دەگەیشتمە سەردەشت و دەچوومەوە بۆ ماڵێ، جارێ وا هەبوو کە دەگەیشتمە ئەوێ تازە نانی بەیانیان دەخوارد! بۆ بەیانی ڕۆژی شەممە دەهاتمەوە بۆ پیرەمەگرون بۆ کاری خۆم، برادەران دەیانووت: چۆن دەتوانی هەینی بڕۆیت بۆ سەردەشت و شەممە بێیتەوە!؟

ڕۆژێك چووین بۆ ماڵی حاجی فەتاح لەوێ کوڕێکی حاجی ئوتێلی هەبوو لە سلێمانی، پیاوێکی هەواڵگری لە بەغدادەوە هاتبوو شەو لە ئوتێلەکەی مابۆوە و دەبووایە بچێت هەواڵ بە مەڵبەند بدات لە لیستی میوانی ئوتێلەکە، بەڵام ناوی ئەوی نەناردبوو، ئەوشەوە کە لە ماڵیان بووم وتیان: گیراوە و بێ سەروشوێنە و بردوویانە بۆ هەڵەبجە. پێموتن: بە شوێنیدا مەگەرێن یەکێتی بەند نابات بۆ هەڵەبجە، من دەگەڕێم بۆتان. بۆ بەیانی کۆمیتەی پیرەمەگرون کۆبوونەوەی هەبوو لە مەڵبەندی سلێمانی کە بارەگاکەی لە قەڵاچوالان بوو، لە کاتی نانی نیوەڕۆدا

دانیشتبووم پیاوێكم بینی لە فاتیح دەچوو من لە منداڵیدا دیبووم چوومە لایەوە وتم: ناوت چییە؟ وتی: ناوم فاتیحە كوڕی حاجی فەتاحم. وتم: من حەمەكەریم قەرەچەتانیم خزمی باوكتم بە شوێن تۆدا دەگەڕێم. وتی: تۆمەتبارم بەوەی كە موخابەراتم هێناوە بۆ ئێرە و لە ئوتێلەكە شاردومەتەوە، بەڵام من ئاگاداری هاتنی نیم و ئەو برادەرە هەوڵیداوە كە ناوی نەچێت بۆ مەڵبەند، منیش ڕووداوەكەم بۆ كاكە حەمەی كارگێڕی مەڵبەند گێڕایەوە، ئەویش وتی: لەگەڵ برادەران قسە دەكەم دواتر وەڵامت دەدەمەوە. منیش وتم: دەبم بە كەفیلی كە ئەو پەیوەندی بە موخابەراتەوە نییە. پێمووت: كەسوكارەكەی دەنێرم بۆ سەردانی ڕێگایان پێبدەن، ئەویش ڕازی بوو. هاتمەوە بۆ سلێمانی و بە ماڵی حاجی فەتاحم وت: كوڕەكەتانم دۆزیوەتەوە لە قەڵاچوالانە بچن بەناوی منەوە سەردانی بكەن. دوای هەفتەیەك چووم بووم بە كەفیلی و ئازادیان كرد.

لە ساڵی ١٩٩١ دوای كۆچڕەو هەر كەسێك شتی لێبدزرایە بە فەرمانی بەرەی كوردستانی شتەكەمان بۆ دەگێڕایەوە، بەڵام دەبووایە قورئان بخوات كە ئەو شتە هی ئەوە. ڕۆژێك هەواڵیان هێنا وتیان: لە ماڵێك كۆمەڵێك كەلوپەلی بە نرخیان لە حەوشە شاردۆتەوە داروچیلكەی دابوو بە سەریاندا، ئێمە چووین كەلوپەلەكانمان دەرهێنا لە قاتعی چوار، ژنی ماڵەكە بوورایەوە و كەوت بە زەویدا، بەڵام ئێمە شتەكانمان دەرهێنا و لە حەوشە بڵاومانكردەوە و قورئانێكمان هێنا و دامان نا، هەر كەسێك بیووتایە ئەوە هی منە دەبووایە دەستی بدایە بە قورئانەكەدا و شتەكەی دەبردەوە. شتەكان بریتی بوون لە تەلەفیزۆن و سەلاجە و زۆر شتی تر كە هەمووی هی دراوسێكانی بوو، ئەوەی سوێندی بخواردایە بیووتایە

هی منە دەیبردەوە بۆ ماڵی خۆی. بەتالیۆنەکەی خالید گرژەیی و شوانەی حاجی شەریف یارمەتیدەرێکی باشی بەرە بوون بۆ دۆزینەوە و گەڕانەوەی شتەکان. ئێمەش ناوی ئەو کەسانەمان نەدەبرد کە شتەکانی برد بوو، بە خاوەن شتەکانمان دەووت: ئەم ماڵە شتەکانی بۆ هەڵگرتوویت تا هاتوویتەتەوە، ماڵی واش هەبوو هاتبوون بۆ لامان پێیانووتین: ئێمە شتمان بردووە بە خاوەنەکەی بڵێن با بێت بیباتەوە ئێمە بۆمان پاراستووە.

لە ساڵی ١٩٩١ ماڵم لە سەردەشت بوو، جارێك چوومەوە لە پیرەمەگرونەوە شوانەی برازام کە منداڵ بوو وتی: منیش دێم بۆ سەردەشت، کاکم و براژنم هەر ئەو کوڕەیان هەبوودەیانویست دڵی نەشکێنن. وتیان: با بێت لەگەڵت. منیش بردم بۆ سەردەشت لە بازگەی ئێران رایکرد سەربەرەوخوار بۆ لای سەیارەکانی سەردەشت، سوار بووین چووین بۆ سەردەشت بۆ ماڵی خۆمان، منداڵەکان زۆریان پێخۆش بوو، چونکە چەند ساڵێك بوو نەیانبینیبوو، من بەجێمهێشتن و لەگەڵ منداڵەکان بەناو بازاڕی سەردەشتدا گەڕابوو زۆری پێخۆش بوو، دوای هەفتەیەك کە گەڕامەوە و بردمەوە بۆ ماڵی خۆیان لە سلێمانی.

لە ساڵی ١٩٩١ لە سەردەشت گەڕامەوە فەرەجی خوشکەزام لەگەڵ بوو پێمووت: دوو شوتی گەورە دەکڕم دەبێت تۆ هەڵیگری، هەر شووتییەکی ١٠ کیلۆ بوو، بردمان بۆ ماڵی مامە حسەین کە مانگی ٥ بوو زۆر بەلایانەوە سەیر بوو، چونکە لای خۆمان مانگی ٧ پێدەگات، فەرەج هەر بۆڵەبۆڵی بوو دەیووت: خاڵە ئەم شوتیانە چی بوو کردت بە کۆڵی منەوە؟! منیش پێمووت: تۆ یەکەم جارە لە ئێرانەوە بچیت بۆ پیرەمەگرون دەبێت دەستت بەتاڵ نەبێت، دوایی دەڵێن فەرەج بە دەستی بەتاڵ هاتووە.

لە ساڵی ١٩٩١ لە پیرەمەگرون كۆمەڵێك خزمی خۆم پـێـشـمـەرگـە بوون لەگەڵم وەكو: دارای مامە عەلی و سەركەوتی مامە عەلی و صـلاح و فلاح و رێبوار و شەریف كە كوڕی مامە حسەیـن بـوون. لـە مـانـگـی ٧ زەكاتی شۆڕشمان لە جووتیارەكان وەردەگرت و گەنمێكـی زۆرمـان لـە بارەگای بەرە كۆكردبـووەوە، هـەر دەڕاسـەیـەك ١٠٠٠ دینـارمـان لـێ وەردەگرت، ١٠ هەزار دینارم برد بۆ قەلاَچـوالان بـۆ عـومـەر غـەریـب و نەوزادی نوری بەگ و پێمووتن: گەنمێكی زۆرم لایە چی لێبكەم؟ وتـیـان: لۆریت بۆ دەنێرین باری كەو بیبە بۆ ئاشی عوسمان بیكە بە ئارد بـۆمـان بهێنە، كاتێك لۆرییە ئاردەكەم بۆ بردن وتیان: یەكەم جارە لە كوردستان بەوشێوەیە ئادر بهێنرێت بۆ یەكێتی! زۆر سوپاسیان كردم.

لەوكاتەدا لە پیرەمەگرون بووم لە هەر قاتـعـێـك ئـەنجـوومـەنمـان هەڵبژارد و ئەنجوومەنی بالاَمان هەڵبژارد بریتی بوون لە ٧ كەس، ئەمانـە چەكدار كرابوون دەچوون بۆ رێگای چەمچەماڵ بۆ هێنانی بەشە نـەوت و غازی پیرەمەگرون، كە لە بـازگـەی رژێـم لایـدەدا خـەڵـك دەیـبرد بـۆ گوندەكانی خۆیان ئەمانیش بە چەكەوە حیمایەیان دەكـرد تـا دەهـاتـە پیرەمەگرون. كە دەهات ئێمەش بە پسووڵەی بەرە بەسەر پیرەمەگرونـدا دابەشمان دەكرد، هەركەس بە سەرەی خۆی، پیرەمەگرون پێكهاتبوو لە ٨ قاتع، هەر رۆژی لە قاتعێك دابەشدەكرا. ئـەو سـووتـەمـەنـیـیـەی كـە دابەش دەكرا تا ئێستا بەوشێوەیە دابەشنەكراوە. بـۆ بـەنـزیـنـیـش بـە حەوت سەیارە یەك بەرمیل بەنزینـمـان دەدانـێ، ئـەگـەر سـەنـەویـان هەبووایە و لای ئێمە دابنرایە. بۆ بایەعیش سەرژمێرێكی تازەمان كردبـوو پیرەمەگرون بریتی بوو لە ٢٨ هەزار كەس بـوو، بـایـەعـی هـەمـوو ئـەو كەسانەمان بڕی كە سەر بـە رژێـم بـوون وەكـو پـۆلـیـس و ئـەمـن و

ئیستیخبارات کە عەرەب بوون و گەڕابوونەوە شوێنی خۆیان. ئەو کەسانەی کە لەسەر هەڵوێستی سیاسی بایەعییان بڕابوو بایەعیمان بۆ گەڕاندنەوە. یەکێك لەوانە حسەینی ئامۆزام بوو کە بایەعییەکەی بڕابوو. صیانەی کارەبا سەیارەی نەبوو لەسەر عەرەبانە پەیژەیان بە ماڵانەوە دەگێڕا بۆ صیانەکردن! منیش وەك بەرەی کوردستانی فەرمانم دەرکرد بۆ ئەو ماڵە دەوڵەمەندانە کە سەیارەی باشیان هەبوو دەبووایە بە نۆرە سەیارەکەیان ببردایەتە بەردەم صیانەی کارەبا بۆ جێبەجێ کردنی ئیشوکاریان. ئەو سەیارەیە لە بەیانی کاتژمێر هەشتەوە تا ئێوارە لە خزمەتی صیانەدا بوو. بۆ ئاویش کاتی رژێم کۆمپانیایەك خەریکی جێبەجێکردنی پرۆژەی ئاو بوو کە لە گرژەوە ئاوی دەهێنا بۆ پیرەمەگرون، بەڵام کاتی راپەڕیندا کارەکانی وەستا بوو، ناردم بە شوێنیدا وتم: کێشەت چییە؟ وتی: بڕی ١٠٥ هەزار دیناری دەوێت. منیش پێمووت: تەواوی بکە ئێمە پارەکەت بۆ دابین دەکەین. وتی: باشە، ئێمە لیژنەیەکمان دروستکرد بە سەرپەرشتی وریا تاڵەبانی کە مدیر ناحیە بوو بە ئەندامی نوێنەری بەرە و دائیرەی ئاو بۆ فرۆشتنی ئاسنە شکاوی دائیرەی ئاو بۆ دابینکردنی ئەو پارەیە، پیرەمەگرون کێشەی ئاوی چارەسەر کرا، بۆ پەروەردەش ئەو مامۆستایانەی کە مووچەیان بڕابوو بەبێ مووچە وانەیان دەووتەوە، بڕیارماندا بە دابینکردنی پاس کە هەموو رۆژێك بچن بە شوێنیاندا بۆ سلێمانی بۆ هێنانیان کە نزیکەی ٢٢ مامۆستا بوون، ئەو پاسانەی لە هێڵی پیرەمەگرون سلێمانی ئیشیان دەکرد دەبووایە هەر رۆژی باسێکیان ئەو کارەی بکرتایە. بۆ زەویوزاریش ئەو کەسانەی عەقدیان لە رێگەی ئەمن و ئیستیخبارات وەرگرتبوو لێمانسەندنەوە و دامان بەو کەسانەی پێشتر عەقدیان نەبوو

لێیانوەرگیرابۆوە بەهۆی هە ڵوێستی سیاسییەوە. بە پێی بڕیاری ٣٨ کە بڕیارێکی تەعریبی حیزبی بەعس بوو، بە پێی ئەو بڕیارە جووتیاری کورد بۆی نەبوو لە جادە لابدات بۆ کێڵانی زەوییەکانی، پیاوەکانی سەر بە رژێم بە پارەیەکی کەم لە رژێمیان وەرگرتبوو بە کرێیەکی کەم، ئێمەش بڕیارماندا کە بەرهەمی ساڵی ١٩٩١ نیوەی بۆ جووتیاران بێت و نیوەکەی تری بۆ پیاوانی رژێم بێت، زەوییەکانیش بەپێی بڕیاری ٩٠ گەڕاندمانەوە بۆ جووتیارانی گوندەکان و جارێکیتر دەستمانکرد بە دابەشکردنی ئەو رێکخراوانەی کە دەهاتن بۆ خزمەتگوزاری بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندەکان، بە تایبەتی بۆ دابەشکردنی دار و پاچ و خاکەناز و کەلوپەلی بیناسازی، ئێمەش لیژنەمان لە بەرە دروستدەکرد کە دەگەڕان بە گوندەکاندا، هەر ماڵێك خەریکی دروستکردنی خانوو بووایە لە گوندەکەی ئەوا دابەشدەکرا بەسەریاندا. ئەو رێکخراوانەی خواردنیان بهێنایە و زۆر بووایە لە رێگەی بایەعەکانەوە دابەشماندەکرد. ئەو رێکخراوانەی ئەمکارەیان دەکرد وەکو: رێکخراوی کرا و کرۆ و کەیر. ئەم رێکخراوانە زیاتر لە رێگەی شێخ عەبدولکەریم و کوڕەکانی صالًح عەسکەرییەوە دەهاتن. ئەو گوندانەی کە ئاوی نەبووایە رێکخراوی فاو بیری ئیلتیوازی بۆ هەڵدەکەندن. بەڕێز مام جەلال بۆ هەر گوندێك ١٠ هەزار دیناری دابین کردبوو بۆ دروستکردنی مزگەوت، ئەنجوومەنی گوندەکان لە رێگەی بەرەی کوردستانی و مەڵبەندەکانەوە ئەم پارەیە خەرجدەکرا، ناکرێت دەوری رێکخراوی ئیخاسەی ئیسلامی لەبەرچاو نەگیرێت بۆ دروستکرنی مزگەوت، بەڵام ئێمە ئاگادار نەبووین چۆن مزگەوت دروستدەکات. رێکخراوی یونسێف دەهاتن لە رێگەی بەرەوە کابینەیان بۆ کردنەوەی خوێندنگەی گوندەکان دادەمەزراند.

لە مانگی ٦ی ١٩٩١ چوومەوە بۆ سەردەشت بۆ هێنانەوەی ماڵ و خێزانم، کە چوومەوە خۆمان کۆکردەوە، ماڵەکەم سواری پیکابێك کرد و جێبێکم بۆ منداڵەکان گرت و هیچ بەڵگەیەکی ئاوارەییم تەسلیمی ئێران نەکردەوە، خۆم وەکو ئاوارەی کۆچڕەو لە قەڵەمدا و فەرمانداری سەردەشت نووسراویان بۆ کردم بۆ گەڕانەوە، لە سەردەشتەوە بەڕێکەوتین بۆ کێلێ، لەوێ ڕێکخراوی کۆچی لێبوو کە لۆری بە بەلاش بۆ دەگرتین بۆ ئەو ماڵانەی دەگەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان، لۆرییەکیان بۆ ماڵی ئێمە و ماڵێکی تر دابینکرد، کە لە پێشەوە خێزانم و خێزانی ماڵەکەی تر سوار بوون و ئەوانی تر لەسەر چەمچەی لۆرییەکە سوار بوون زۆرمان پێخۆش بوو. کە لە کێلێ هاتینە خوارەوە مەجید قادرمان بینی کە ناسراو بوو بە حاجی مەجید، لە بن دارێك دانیشتبوو کە چاوی بە ئێمە کەوت زۆر بەهێز چەپڵەی لێدەدا و هەستی بە خۆشی دەکرد کە وەزع باشە، چونکە من لێپرسراوی بەرە بووم و ماڵم هێناوەتەوە بۆ سلێمانی. پێش ئەوەی ماڵ بێنمەوە خانوویەکم لە سلێمانی کڕیبوو لە گەڕەکی زەرگەتە کە دراوسێی کۆمەڵێك ماڵی باش بووم وەکو: ڕەئوفی سوارە و کەریم و هاروون و یاسینی ئامۆزام. ماڵەکەم هێنایەوە بۆ سلێمانی و لە گەڕەکی زەرگەتە نیشتەجێ بووم، ئەو ماڵەی کە زوو هەمبوو لە ماڵی باسیمەی ئامۆزای خێزانم و ماڵە کۆنەکەی خۆم دانرا بوو، کوێخا جەمال بە سەیارەی کوڕەکەی و براکەی ئەو کەلوپەلانەیان بۆ گوێزامەوە. لە کاتی گەڕانەوەم لە سەردەشت، ڕەحیمی کوڕم خوێندنی مابوو، لەوێ مایەوە لە ماڵی مەولانی، چونکە لەسەر دارۆخانەکەیان کاری دەکرد تا خوێندنی تەواو کرد.

ئەو ماوەیەی ماڵمان لە سەردەشت بوو هەرگیز نەمانزانیوە كە ئاوارەین، چونكە كۆمەڵێك ماڵی بەڕێزی سەردەشت هاموشۆیان دەكردین لەوانە: خانەوادەی ئەحمەدی و رەزوانی و شێخی و كەریمی و مەولانی و خالقی و فەهیمی و كۆمەلێك ماڵی وەك مامۆستا تۆفیق و رەفیقی برای مامۆستا غەفوور و محمەدی هەباس و حاجی سمایلی خوێفرۆش و محەمەدی مەلا كۆڵ و چەند ماڵێكی تر، پاش هاتنەوەمان لە سەردەشت زۆربەیان سەردانیان كردووین وەك، مامۆستا تۆفیق و كوڕانی حاجی عەلی هەلاج كە رەحیم و رەحمان و خدر و سەلیمی حاجی محەمەدی هەلاج و كوڕەكانی و محەمەدی هەباس و خێزانەكانی و سەبری و ئازیز و ماڵی قادری هەباسی هەرزنە و محەمەدی ئەحمەدی.

لە كاتی هاتنەوەمدا لە ماڵی خزمان و دۆستان و برادەرە كۆنەكانم هەمیشە بانگێشتی نانخواردن دەكرام، منیش لەبەر ئەوەی كارم لە پیرەمەگرون بوو وەعدم دەدانێ بۆ رۆژی هەینی كە دەستم بەتاڵ دەبوو میوانداریيان دەكەم، منداڵەكانم زۆر دڵخۆش بوون كە بە سەربەرزی گەڕاوینەتەوە بۆ وڵاتی خۆمان و ناو كەسوكار، هەمیشە ماڵمان پڕ بوو لە میوان كە لە پیرەمەگرون و چەمچەماڵ و دوكان و جێگاكانی تر دەهاتن بۆ سەردانمان و دەیانووت: دەبێت سەردانمان بكەن، ئێمەش دەچووین بۆ سەردانیان. لە كاتی هاتنەوەدا ئازوقەیەكی باشمان هانیبووەوە لە ئێران، ماڵی فەرەجی خوشكەزام هاتنە ماڵی ئێمە تا خانووەكەی خۆم چۆڵ بوو كە كرێچی تێدابوو، پاش چۆڵبوونی خانووەكە ئەوان چوونەناو ئەو خانووە.

لە مانگی ٥ی ١٩٩١ لە بەرەی كوردستانی بووم، خوالێخۆش بوو كاك سمایل هات بۆ لام وتی: ئامۆژنە سەلما كە دایكی قومری خێزانم بوو

مردووە، تازە لە سەردەشت گەڕابووەوە بۆ چەمچەماڵ، پێشتر لە سەردەشت تووشی ئەم نەخۆشییە ببوو، ڕەحیمی کوڕم بە کۆڵ بردبووی بۆ بیمارستان بۆ چارەسەرکردنی، منیش پێموت: تەسلیم کراوە؟ وتی: بەڵێ، منیش وتم: با بڕۆین بۆ پرسەکەی، تازە پێویست ناکات بچم بۆ هێنانەوەی خێزانم لە سەردەشت، مانگی شەش دەڕۆم منداڵەکان دێنمەوە بۆ ئێرە ئەوسا خێزانم با بچێت بۆ سەر گۆڕەکەی. چەند ڕۆژێك لە چەمچەماڵ بووم دواتر گەڕامەوە بۆ سەردەشت و منداڵەکانم ئاگادار کرد و پرسەمان لەوێ دانا و خەڵکی سەردەشت دەهاتن بۆ سەرەخۆشی لە قومری خێزانم بە تایبەتی خزمەکانی سەردەشتمان.

لە مانگە ٧ ی ١٩٩١ ڕاپەڕینی دووەم دەستی پێکرد، دەنگی تۆپ لە چەمی قلیاسان بوو، دایکی منداڵەکان هەر بۆڵەبۆڵی بوو دەیووت: بۆ ئێمەت هێناوەتەوە بۆ ژێر لوولەی تۆپ!؟ منیش دڵخۆشیم دایەوە وتم: چەند ڕۆژێکی تر رژێم لە سلێمانی نامێنێت و وەکو ڕاپەڕینی یەکەم پاکیان دەکەینەوە، مەترسن. لە ماوەی ٣ ڕۆژدا رژێم و سوپاکەی لە ناو سلێمانی نەمان، چوونەدەرەوەی شار، بەڵام لە دەرەوەی شار ڕەبایە مابوو ئەویش لە ڕاپەڕینی سێیەمدا نەما و تا بانی مەقان سوپای رژێم هیچ بوونێکی نەما. من چوومەوە بۆ پیرەمەگرون و دەستکرا بە ڕەبایە گرتن، یەکەمجار ڕەبایەی پشتی تەڕەمار گیرا لە لایەن جەماوەر و پێشمەرگەوە، بۆ شەو شەهید ئەحمەد کاکەبرا لەگەڵ کۆمەڵێك پێشمەرگە چوون ڕەبایەی قیرتەپەیان گرت، بۆ ڕۆژی دوایی دەوروبەری پیرەمەگرون پاککرایەوە، ڕەبایەکانی سەرجادەی قەرەچەتانمان چەك کرد کە کۆمەڵێك چەکی قورسیان لابوو وەکو دۆشکەی چوار لوولە، دامان بە خالید گرژەیی کە ئەو ئامر بەتالیۆن بوو، ئەویش لە جیاتی

ئەوە ئاربیجی و تفەنگی دا پێمان بۆ پاراستنی بارەگاکە. خالید گرژەیی و شوان موخاخی زۆر ئازا بوون لە هاوکاریکردنی بارەگای ڕێکخستن و بەرەی کوردستانی، یەکێك لە ڕێکخستنەکانی ئێمە ناوی عەلی شیوەکە بوو هاوانێك و کۆمەڵێك گوللە هاوانی لابوو هات بۆ لام وتی: چی لێبکەم؟ وتم: با لای خۆت بێت بۆ کاتی پێویست کە پێموتی: بیهێنە.

لە مانگی ١٠ ی ١٩٩١ هەموو سوپای بە جێماوی ڕژێم کە چەك نەکرابوون لە خەلەکان و سورداش و دوکان کۆبوونەوە، بەرەی کوردستانی چوون بە دیالۆگ ڕێککەوتن کە ڕێگایان پێ بدەن بگەڕێنەوە بۆ قەرەهەنجیر، لە کاتی گفتوگۆدا کۆمەڵێك لە نوێنەری لایەنەکان کە پێشتر سەر بە ڕژێم بوون بە ئەفسەرەکانیان دەووت: سەیدی! منیش تووڕەبووم لێیان وتم: ئەوان وەکو فیرنەگولله وان خواخوایانە نەیانکوژین و چەکیان نەکەین ئێوە سەیدی سەیدی چیتانە!؟ بڕیاردرا کە بگەڕێنەوە بۆ قەرەهەنجیر و پێشمەرگە دەستیان لێنەوەشێنێت، لە کاتی گەڕانەوەدا هەر سەیارەیەك پەکی کەوتایە نەدەبووایە بگەڕێنەوە سەری، سەیارەیەکیان لە ئاستی قەرەچەتان پەکیکەوت پڕ بوو لە ئازوقە جێما، چونکە هێندە بێتوانا بوون نەیانتوانی بگەڕێنەوە سەری و مەلا بەکر ڕایکێشا بۆ بەردەم بارەگا سوودی باشی هەبوو. دوای گەڕانەوە لە بانی مەقان جێگیر بوون. لە کاتی دوورینەوەی گەنمدا ڕژێم دەستیکرد بە وەرگرتنی گەنم لە سووورداش و مەرگە و دوکان، هەموو گەنمەکەی لە پیرەمەگرون کۆکردەوە، کۆمەڵێك نەفس نزم هەوڵیان دەدا تاڵانی بکەن، بەڵام ئێمە وەکو بەرە نەمانهێشت تاڵانی بکەن و دەوری گەنمەکەمان دابوو بۆ ئەوەی پەلاماری نەدەن، چونکە ئەو گەنمە هی هەموو گەلی عێراق بوو تا لۆری هات بۆ گوێزانەوەی نەمانهێشت تاڵانی بکەن،

گەنمەکەیان برد بۆ کەرکوك و گەنم لەوێ نەما، دوای ئەوە دامودەزگاکانی رژێم کەوتەدەست بەرەی کوردستانی تا دروستبوونی حکومەتی هەرێمی کوردستان.

لە مانگی ٧ ی ١٩٩١ چووم بۆ بەری گەبە و گولیجە بۆ سەرپەرشتیکردنی دەڕاسەکان، رەسووڵ و صەلاحم بردبوو لەگەڵ خۆم، کە گەڕامەوە بۆ بارەگا سەرکەوتی مامە عەلی هات بۆ لام وتی: کەریم زینەت و برایمی کوڕی لە لایەن پاسۆکەوە بەندکراون، منیش تووڕەبووم وتم: من نوێنەری یەکێتی نیشتمانیم کە زۆرینەی خەڵکمان لایە و منیش لێپرسراوی بەرەم، چۆن بە بێ ئاگاداری من خەڵك بەند دەکەن؟! بچن ئەو کلیلانەم بۆ بێنن، چووم دەرگاکەم کردەوە و وتم: حاجی کەریم بڕۆنەوە، ئەو دەیویست نەڕوات بۆ ئەوەی شت روونەدات، بەڵام من بە پاڵ کردمەدەرەوە، لەوکاتەدا نوێنەری پاسۆك کە ناوی حەمە ئامۆزا بوو چەکێکی بە دەستەوە گرتبوو بە حاجی کەریمی وت: بگەڕێرەوە، منیش تاوی چەکەکەی سەرکەوتی مامە عەلیم دا و خستمەسەر ملی کاکە حەمە و پێمووت: بجوڵێیتەوە مێشکت تەقیوە، دوای ئەوە پێشمەرگەکانی یەکێتی دامەزران و هەموو شوێنێکیان گرت، لەوکاتەدا خزمەکانەی مەلا بەکر یەکێکیان چەکەکەی لەسەر پێ بوو ریزێك فیشەکی تەقاند و پێشمەرگەکانی پاسۆکمان چەککرد و حاجی کەریم بە راکردن چووەوە ماڵی خۆی، دوای تەقە سابیر ئەحمەد رۆستەمی چەرمەگام بینی کە پیاوێکی کەتە و چوارشانە بوو چین لەسەر شان رایدەکرد بۆ بازاڕەکە، دواتر برادەرانی پاسۆك چوون بۆ قەڵاچوالان بۆ شکات، لەوێ لیژنەی پاسۆك هات بۆ بارەگای بەرە، نوێنەری پاسۆك عومەری حاجی عەبدوڵڵا بوو کە خزمی خۆمان بوو، لەگەڵ نوێنەری پاسۆك رێککەوتین و چەکەکانمان بۆ گێڕانەوە.

لە ساڵی ١٩٩١ بە دواوە زۆر گەڕام بە دوای بەڵگەنامەكان بە تایبەتی كتێبی كورد و كوردستانی ئەمین زەكی بەگ، هیچم دەستنەكەوت كە باسی قەرەچەتان بكات، دەچوومە هەر كتێبخانەیەك پرسیاری زۆرم دەكرد تا رۆژێك چوومە كتێبخانەی ئەوقاف، لەوێ مامۆستا كەریم زەندم بینی باسی خۆی بۆ كردم كە مامۆستا بووە لە قەرەچەتان لە كاتی ئەودا كێشەی لە نێوان حاجی گورون و عوسمان صالح روویداوە لەسەر كوێخایی. مامۆستا زۆر هەوڵیداوە بۆ ئەوەی رێكبكەون، بەڵام بە نووسین هیچمان لەسەر قەرەچەتان دەستنەكەوت، مەلا نامیق كە فەرمانبەری ئەوقاف بوو هەر هەوڵی دەدا بۆ ئەوەی بەڵگەنامە دەستبكەوێت، بەڵام بێسوود بوو، خوولیای ئەوە بووم كە شتێكم دەستبكەوێت، چونكە ئەم گوندە پڕ بوو شوێنەواری مێژوویی، رۆژێك یاسین حەسەن عەزیز هات پێیوتم: مەلا عومەر ئابلاخی كتێبێكی هەیە باسی ئەشكەوتەكانی قەرەچەتان دەكات زۆر هەولّم دا، بەڵام هیچم دەستنەكەوت.

لە ساڵی ١٩٩١ شێخ عەبدولكەریم پێیوتم: بچۆ بۆ بازیان بزانە وەزع چۆنە؟ منیش صەلاحی مامە حسەینم برد و چووم بۆ ئەوێ كەسی لێنەبوو تەنها مامۆستا جەلالی لێبوو لەسەر كانییەكەی كوپەلە خێمەیەكی هەڵدابوو، كۆمەڵێك مانگای بەستبووەوە پێیووتین: ئێرە بەرەی كوردستانییە من نوێنەری یەكێتیم و كوڕەكەم نوێنەری پارتییە، كە چوومەوە بۆ لای شێخ عەبدولكەریم پێمووت: وەزعی بازیان شڕە! ئەوانیش كۆمیتەی رێكخستنی بازیانیان دروستكرد و ئاوات بهادینیان كرد بە لێپرسراوی، تا كۆمیتە كەوتەكار. ئەم برادەرانە دەوریان هەبوو لە دروستبوونیدا وەكو: عەتا و لوقمان تەڕەماری و كاوەی ئامۆزام و

نەوزاد کافرۆشی و ئازاد کەریم و شێخ سەلام و نامق حەسەن، دوایی کێشە کەوتە کۆمیتەی پیرەمەگرون، کاك ئەحمەد مەولوودیان کرد بە لێپرسراوی کۆمیتەی بازیان، ئێمەش وەك کۆمیتە چووین بۆ مەڵبەندی سلێمانی کە بەهاری ١٩٩٢ بوو لەوێ ئاسۆی شێخ نوری کارگێری مەڵبەند بوو، سەرپەرشتی کۆمیتەی پیرەمەگرونی دەکرد بەمەبەستی هەڵبژاردنی لێپرسراوی کۆمیتە، بە کۆی دەنگ بڕیار درا من بکرێم بە لێپرسراوی کۆمیتە، ئەندام کۆمیتەکان بریتی بوون لەمانە: شێخ فەرهاد و مەلا بەکر و مامۆستا فایەق و سەرچنار و فەرەیدون گرژەیی و عومەری حەمە کاکی و بەرزان و عەباسە سوور و رەئوف دوکانی و چەتۆ مام صالّح کەرکوکی. دوای هەڵبژاردن کە هاتینەوە بۆ بارەگا کۆمەڵێك کە هەستیان بە لێپرسراوی نەدەکرد و نەیاندەتوانی لە مەڵبەند بۆچوونی خۆیان دەربڕن، کەوتنە تانە لە هەڵبژاردنەکە و دەیانوت: ئێمە ریش سپییان بۆ داناوین و هەڵبژاردمان نەکردووە ! ؟ کە بیستم زۆرم پێناخۆش بوو، نەشمویست بارودوخ تێکبدەم کە زیانی هەبێت بۆ رێکخستن، لەوکاتەدا بە شێخ فەرهادم وت: وەرە دەچم بۆ مەڵبەند پشتگیریت دەکەم ببیت بە لێپرسراوی کۆمیتەکە، چونکە پیاوێکی شۆڕشگێر بوو، بەڵام قبوڵی نەکرد وتی: من نابم بە لێپرسراوی ئەوانە، چوومەوە بۆ مەڵبەند وتم: وا دەڵێن، پێم چاکە کە من هەر لێپرسراوی بەرەی کوردستانی بم و ئاوات بهادین بنێرن بۆ لێپرسراوی کۆمیتە و من پشتگیری دەکەم. پارەیەکی باشیان بۆ خەرجکردین بۆ نویکردنەوەی بارەگای کۆمیتە. دوای ئەوە بڕیارێك هات دەبووایە لێپرسراوی کۆمیتە لێپرسراوی بەرەی کوردستانی بێت، لەوکاتەدا ئاوات بهادین هات وتی: کاك حەمەکەریم رێپێدراوە وەك لێپرسراوی کۆمیتە هەڵسوکەوت بکات،

کە من جێگری بووم، لەو کاتەدا کە من لێپرسراوی بەرەی کوردستانی بووم لە قەزای دوکان، ئەندامی بەرەی کوردستانی پارێزگای سلێمانی بووم کە لێپرسراوی بەرەی کوردستانی لە سلێمانی جەلالی شێخ کەریم بوو، کۆبوونەوەی پێدەکردین لە بارەگای بەرەی کوردستانی لە سلێمانی.

لەو کاتەدا کە من لێپرسراوی بەرەی کوردستانی بووم لە قەزای دوکان و بارەگاکەی لە پیرەمەگرون بوو، بەهۆی ئەوەی بە ساڵاچووبووم یان لەبەر ئەوەی سەر بە یەکێتی نیشتمانی بووم و یەکێتیش خاوەنی رووبارێك خوێن بوو لەم دەڤەرەدا کە پێیاندەووت: ناوچەی دۆڵی جافایەتی و ناوچەی سووررداش، ئەو برادەرانەی کە کاریان لەگەڵ دەکردم و نوێنەری لایەنەکانی تر بوون رێزێکی زۆریان دەکردم، هەر لیژنەیەك دروستدەکرا دەبووایە من سەرپەرشتی بکەم، واتە سەرپەرشتی هەموو لیژنەکانم دەکرد و کەسیان بێ ئاگاداری من هیچ کارێکی بە ئەنجام نەدەگەیاند، سوپاسیان دەکەم. ئەوەی بە لامەوە گرنگ بوو لیژنەی جووتیاران بوو کە مەبەستم بوو کاری باشی تێدا بکەم، چونکە زۆری ئەو کەسانەی کە سەر بە شۆڕش بوون زەوییەکانیان زەوت کرا بوو و عەقدیان بۆ تازە نەکرابووەوە! بە هەوڵی من زەوییەکانیان بۆ گێڕایەوە و چوونەوەسەر زەوییەکانی خۆیان، ئەوەش جێگای ئامارەیە ئەوکاتە کاك عوسمان لێپرسراوی لقی کشتوکاڵی بوو زۆر هاوکاری کردین لە گێڕانەوەی زەوییەکان.

لە بەهاری ١٩٩٢ لەگەڵ زیرەك کەمال کە نوێنەری حیزبی شوعی بوو چووین بۆ بازاڕ بۆ چاودێریکردنی نرخی شتومەك، کە چووین قەسابێك بەرامبەر دوکانەکەی خۆی لەو تەپووتۆزەدا قەسابی کردبوو!

لەوکاتەدا پارەی ئەصل و تەزویر وەکو یەك وا بوو، ژنێك ٢٥ دیناری تەزویری پێبوو داوای کیلۆیەك گۆشتی دەکرد، قەصابەکە لێیوەرنەدەگرت دەیووت: ئەمە تەزویری تەزویرە، هاورێ زیرەك وتی: با سزای بدەین، وتم: لێرە نابێت، دەچینەوە بۆ بارەگا لەوێ دەنێرین بە شوێنیدا، زیرەك کەوتە قسە لەگەڵی وتی: من سەیری پارەکەم کردووە تەزویر نییە و تۆش هیچ مەرجێکی تەندروستیت تێدا نییە لەم تەپووتۆزەدا قەسابی دەکەیت، لەو کاتەدا سووڕایەوە و یەخەی منی گرت و وتی: ئێوە بوون بە خوای ئەم خەڵکە، ناهێڵن کاسپی بکەین! منیش بە هەموو هێزی خۆم یەك شەقازلەم لێدا و یەکسەر کەوت و بووڕایەوە، خەڵکەکە چوون ئاویان هێنا و کردیان بە سەروچاویدا تا هۆشی هاتەوە، خزمەکانی هاتن یەکێکیان هەڵەی کرد فەلاحی ئامۆزام تەور و تەوراسی پێبوو دەیبرد بۆ سلێمانی بۆ دەمە زەردکردنەوەی، بە هەموو هێزی خۆی دای بە پشتیدا و کەوتە هاوار وتی: ئەو گوێنیە چی تێدایە پشتم شکا! دوایی پێشمەرگە هات قەسابەکە و خزمەکانی بە بەندی هێنایانن بۆ بەرە، دوایی خزمەکانیمان بەردا و قەسابەکەمان نارد بۆ سلێمانی بە بەندکراوی، نوێنەری حیزبەکان پێیانووتم: پێشمەرگەکانت تەور و تەوراسیان لە گوێنیدا بەکارهێناوە، خۆشت بە خاکەناس لێت داوە بە شەقازلە چۆن دەبووڕێتەوە!؟ دوای چەند ڕۆژێك کاکە حەمەی مامە ڕەزا پیاوێکی نارد بۆ لام بە نامەیەك کە ئەمجارە لەو قەسابە ببوورم، منیش لەسەر داوای کاکە حەمە نووسراوم کرد بۆ بەرە لە سلێمانی کە ئازادی بکەن.

لە مانگی ١١ی ١٩٩١ ڕەحیمی کوڕم لە ئێران گەڕایەوە ویستم جارێکیتر بچێتەوە خوێندن کە چووینە بەڕێوبەرایەتی پەروەردە نوێنەری

یەکێتی لەوێ بوو ناوی مامۆستا کامەران بوو، وتی: بڕیارماندراوە کە خوێندنگاکان وەریانگرن. چووین بۆ ئامادەیی رۆشنبیر وەریاننەگرت، چونکە دەیانووت جێگا نەماوە و خوێندن دوو مانگە دەستیپێکردووە، چووینەوە بۆ پەروەردە نوێنەری پارتی تەلەفونی بۆ بەڕێوەبەری ئامادەیی رۆشنبیر کرد، چونکە ئەندامی خۆیان بوو پێیووت: ئەگەر کورسییەکەی خۆت داوەتێ دەبێت جێگەی بکەیتەوە، دووەم جار چووینەوە وەریانگرت، بەڵام دەبووایە لە پۆلی شەش بخوێنێت، مامۆستاکان پێیانووت: بچیتەوە بۆ پۆلی پێنج باشترە، چونکە دوو مانگە پۆلی شەش دەخوێنن بۆ تۆ باش نییە، ئەویش بە قسەی کردن و چووە پۆلی پێنج بۆ خوێندن.

لە بە هاری ١٩٩٢ هەڵبژاردن بە هەڵمەتی هەڵبژاردن دەستیپێکرد، بەداخەوە بەهۆی شەڕە پەڕۆوە زۆر شتی نەخوازراو روویدا و بووەهۆی پێکدادانی رێکخستنەکانی لایەنەکان بە تایبەتی یەکێتی وپارتی، بەڵام لای ئێمە هیچ روونەدا، لە کاتی هەڵبژاردن مام جەلال هات بۆ پیرەمەگرون بۆ هەڵمەتی هەڵبژاردن، جەماوەری خۆمان زۆریانپێخۆش بوو، چووین بە پیرییەوە بۆ کەڵەوانان لەوێ دابەزین یەك یەك تەوقەی لەگەڵ کردین و پێشوازیمان لێکرد بۆ کۆمیتەی پیرەمەگرون کە پێشتر شوێنی وتاردانی بۆ ئامادەکرابوو. مام جەلال دەستی بە وتاردان کرد و سەیری لافیتەی حیزبەکانی کرد بۆ پێشوازی هەڵیانواسی بوو، هەموو لایەنەکان لافیتەی پێشوازییان هەڵواسی بوو پارتی نەبێت، ئەویش وتی: سوپاسی هەموو ئەو لایەنانە دەکەم کە لافیتەی بەخێرهێنانمیان نووسیوە و سوپاسی ئەو لایەنەش ناکەم کە نەینووسیوە! دیارە لافیتەی برادەرانی پارتی دیار نییە، دوای وتاردان داوای لێبووردنی کرد

و وتی: دەچم بۆ کۆیە مەجالم نییە بمێنمەوە بۆ گفتوگۆکردن و خوا حافیزی لە جەماوەرەکە کرد.

دوای هاتنی مام جەلال زیرەك کەمال هات بۆ لام وتی: هاوڕێ عەزیز محەمەد دێت ئێمە جێگای وامان نییە بۆ وتاردانی هاوڕێ عەزیز دەتوانین سوود لەو جێگایە ببینین کە مام جەلال وتاری لێدابوو؟ منیش وتم: لە خزمەتتاندایە. هاوڕێ عەزیز هات لە شوێنی مام جەلال وتاری دا و لافیتەی بەخێرهێنان و پێشوازییەکی باشمان لێکرد، دوای وتارەکەی من و ئاوات بهادین چووین کۆبووینەوە لەگەڵی و هاوڕێ زیرەك منی پێناسانەوە وتی: ئەمە هاوڕێ حەمە صالّحە سەرلقێکی ئازای خۆمان بووە، هاوڕێ عەزیز مجامەلەیەکی زۆری کردم و پێخۆشحاڵ بوو بە بینینم، تەنها ئێمە و برادەرانی حیزبی شیوعی بینی.

لە بەهاری١٩٩٢ چووم بۆ قەڵاچوالان لەوێ شەهید محەمەدی حاجی عەلیم بینی وتی: من جێگری کاك جەبار فەرمانم بۆ کاروباری هەواڵگری، پێم باشە ئەو خزمە قەرەچەتانیانەی پەرتەوازە بوون هەر یەکی لە شوێنێك پێشمەرگەن، بیانکەیت بە بەتالیۆنێك بە ناوی بەتالیۆنی قەرەچەتان و منیش هەموو هاوکارییەکتان دەکەم. منیش زۆرم پێخۆش بوو پێمووت: دەبێت پشتگیریم بکەیت. منیش چووم بۆچوونی عومەری حاجی عەبدوڵڵا وەرگرم میوانداریم کرد بۆ پیرەمەگرون بۆ پێکهێنانی بەتالیۆنەکە، ئەویش پێی چاك بوو، دوای ئەوە چووم بۆ هێزی سلێمانی کە مامۆستا جەمال محەمەد لێپرساوی هێز بوو، غەریب عەسکەری جێگری بوو، بێستوون سابووراوایی رابەر سیاسی بوو، وتیان: پشتگیریت دەکەین، بەڵام فوئاد ئەحمەد لەم هێزەی ئێمەیە بیکەیت بە جێگری خۆت و رابەر سیاسی بەتالیۆنەکە و

صەلاحی مامە حسەین بکەیت بە لێپرسراوی ئیداری بەتالیۆنەکە، کە بەتالیۆنمان دروستکرد هەموو قەرەچەتانییەکان هاتن شەهید سەلامی حاجی کەریم نەبێت، کە مەرجی هەبوو بکرێت بە جێگرم، بەڵام لە هێزەوە فوئادیان کردبوو بە جێگرم لە دەستی مندا نەمابوو، لەبەر ئەوە ئەو نەهاتە بەتالیۆنەکەوە، تەها حەمەئەمین کرا بە فەرماندەی کەرت، چونکە خۆی و ٥ برا و ئامۆزاکانی هاتبوون. ئەکرەم ئاری مستەفا کرا بە فەرماندەی کەرت کە خۆی و برا و خزمەکانی لەگەڵ بوون، ئەنوەر کەریم حەسەن کرا بە فەرماندەی کەرت کە خۆیی و خزمەکانی لەگەڵ بوون، خالید گەبەیی بوو بە فەرماندەی کەرت ئەویش چەند پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بوو. هەموو ئەو پێشمەرگانەی تاك و تەرا دەهاتن لەو کەرتانەدا جێگیرمان دەکردن. ناوی بەتالیۆنەکەمان نا بەتالیۆنی ٤٣ ی قەرەچەتان. کارمان پاراستنی بارەگای کۆمیتە و بەرەی کوردستانی بوو. دوایی شەهید محەمەد پێیوتم: پێویستیمان بە ١٠ پێشمەرگە هەیە لە قەڵاچوالان دەبێت بۆم بنێریت و کاریان لەوێ بێت، منیش ١٠ پێشمەرگەم نارد بۆ واجب بۆ لای شەهید محەمەد بۆ هەفتەیەك، دوایی ١٠ کەسیترم دەنارد بەوجۆرە. دواتر شەهید محەمەد چەند تۆپێك قوماشی سەوزی بۆ ناردم، منیش ناردم بۆ لای بەرگدروویەکی ناسیاو و بە فوئادم وت: هەفتەی ٧ کەس بنێرێت بۆ لای بەرگدرووەکە بۆ دروینی بەرگی پێشمەرگە، پارەی دروینەکەی لە پارەی نەسرییەی خۆمان دامان، بەوجۆرە هەموو بەتالیۆنەکە بەرگی سەوزی لەبەر کرد کە بەتالیۆنێکی شاز بووین بە پۆشتەیی و رێك پۆشییەوە و بەتالیۆنەکانی تر وانەبوون. بەوجۆرە ئەم بەتالیۆنە وەکو بەتالیۆنەکانی تر بەشداری شەڕی دەکرد ئەگەر رووی بدایە. کاری بەتالیۆنەکەمان لە سنووری

پیرەمەگرون بوو، دواتر چووین بۆ شەڕی سیدەکان لەوێ چەند بەتالیۆنێکی تری لێبوو، رۆژێك من و شەوقی کوێخا سمایل و عەزیزی کوێخا حەمە سەعید لە ژێر دارێك دانیشتبووین، پێشمەرگەکانمان کاریان لە شاخی گارا بۆ دانرا بوو، شەهید محەمەد لە ماڵی کەریم خانی برادۆست بارەگای دانا بوو، سەرپەرشتی ئیداری شەڕی دەکرد، جار هەبوو من یان کاك شەوقی یان کاك عەزیز دەچووین بۆ لای شەهید محەمەد بۆ هێنانی ئازوقەی بەتالیۆنەکانمان، لەو کاتەدا کاك کۆسرەت و مستەفا چاوڕەش کە سەرپەرشتی ئەو شەڕەیان دەکرد، هاتن بۆ لامان وتیان: دیارە ئێوە خەڵکی ناوچەی دوکانن بۆچی غەریب هەڵەدنیتان لەگەڵ نییە؟ منیش وتم: شەهید غەریب لە کاتی شەڕی کەرکوکدا بریندارە و لە ماڵەوە بێ ئیشە. کاك کۆسرەت وتی: کە چوونەوە بچن بۆ لای با بێت سەردانم بکات، دوای تەواوبوونی کارمان گەڕاینەوە بۆ پیرەمەگرون و هەواڵەکەم نارد بۆ شەهید غەریب وتم: کاك کۆسرەت دەڵێت بێت سەردانم بکات. کە چوو بوو بۆ لای کاك کۆسرەت پێیووتبوو: دوای دروستبوونی حکومەتی هەرێم دەتکەم لە ئامر لیوای ٢٢ ی قیادەی مەنتیقەی سلێمانی، ئەویش بە دڵی خۆشەوە گەڕابووەوە.

دوای گەڕانەوەمان غەریب عەسکەری هات وتی: پێویستیمان بە دوو بەتالیۆن هەیە بچن بۆ دەربەندی بازیان واجب بگرن، من و خالید گرژەیی و غەریب عەسکەری چووین بۆ دەربەندی بازیان بۆ دانانی بارەگا بۆ دوو بەتالیۆنەکە، لەوێ بینایەکمان دۆزییەوە کە شوێنی ٤٠ بۆ ٥٠ پێشمەرگە دەبووەوە، ئێمەش ١٠ پێشمەرگەمان لەوێ دانا و پارەی عەرەبانەیەك دارمان دانێ و وتمان: زۆپا دابنێن و بچن بۆ تەکیە ئازوقە بکڕن. کە گەڕاینەوە بۆ پیرەمەگرون من و خالید یەکی ١٠ پێشمەرگەمان

دانا کە بچن بۆ دەربەندی بازیان بۆ واجب و ئەو ١٠ پێشمەرگەیەمان ناردەوە بۆ پشوو. کەلوپەلی ئەو ٢٠ پێشمەرگانەمان بە پیکابێکدا بۆ ناردن بۆ دەربەندی بازیان، هەفتەی ٢٠ پێشمەرگە بە بەردەوامی لەوێ بوون تا دروستبوونی حکومەتی هەرێم.

دوای هەڵبژاردن هەموو لایەنەکان دەرنەچوون کە دەبووایە لە سەدا حەوت بێنن، تەنها یەکێتی و پارتی مایەوە، بەداخەوە سیاسەتی ٥٠ بە ٥٠ پەیڕەو کرا کە بووەهۆی دابەشبوونی هەموو پۆستەکان بەو رێژەیە.

دوای دروستبوونی حکومەتی هەرێم وەزارەتی پێشمەرگە دروستبوو، قیادەی مەنتیقەی سلێمانی پێکهێنرا کە دەروێش ئاغا لێپرسراوی بوو مەحمود سەنگاوی جێگری بوو، دوای کێشمەکێشمی یەکێتی و پارتی لیوایەك پێکهێنرا کە بارەگاکەی لە قەڵاکەی سووسێ بوو غەریب هەڵەدنی لێپرسراوی بوو جێگرەکەی حەمە یادگار بوو، ناوی لیوای ٢٢ قیادەی مەنتیقەی سلێمانی بوو، پێکهاتبوو لە چوار فەوج کە دووانیان ئامر فەوجەکەی یەکێتی بوون دووانەکەی تر پارتی بوون، یەکێك لەو فەوجانە فەوجی یەکی بازیان بوو کە سوهاد خانەقینی ئامر فەوجی بوو، دوو جێگری هەبوو یەکێکیان حەیدەر حاجیتانی بوو یەکێتی بوو جێگرەکەی تر عەبدوڵڵا خرە بوو پارتی بوو، منیش لەو ماوەیەدا سەردانی شەهید غەریب هەڵەدنیم کرد ماڵیان لە قاتعی ٣ بوو لە پیرەمەگرون، لەو رۆژەدا قەرەچەتانییەکان بەردەکەیان بۆ بردبوو لەسەر بەتانییەك دابنابوو لە ژوورێکدا، دەستیگرتم وتی: شتێکت نیشاندەدەم بزانە دەزانیت چییە؟ وتم: نەوەڵا. وتی: ئەوە ئەو بەردەیە لە قەرەچەتان دۆزراوەتەوە و قاچاخچی و ئاسەواردز هاتوون بۆ سەری بۆ

کرێنی ١٥٠٠ دیناریان داوە، منیش بە چاکی دەزانم کە پێشکەشی مۆزەخانەی سلێمانی بکەم. بردی پێشکەشی مۆزەخانەی کرد، بە منی وت: هەموو بەتالیۆنەکان دەکەین بە سریە لە فەوجەکان، بەتالیۆنەکەی تۆ دەکەین بە سریەی ئەسناد لە فەوجی یەکی بازیان لای سوهاد خانەقینی کە هەموو ئیدارەی فەوجەکە لە سرییەکەی تۆدا بێت، عەلی رەباتییان کرد بە جێگرم کە پارتی بوو، ئەم سریەیە پێکهاتبوو لە چوار فەسیلێ، دووانیان یەکێتی بوون من تەهای حەمەئەمین و ئاسۆ سورداشیم کرد ئامر فەسیلێ لای خۆم، دووانە پارتییەکەش صدیق مەنمی و دارا بوو. تەها سێکانیانی ئیدارەی فەوج و لێپرسراوی رێکخستن بوو. لە بەهاری ساڵی ١٩٩٣ من بووم بە ئامر سرییەی ئەسناد لە فەوجی یەکی لیوای ٢٢ قیادەی مەنتیقەی سلێمانی کە بارەگاکەی لەناو بارەگای فەوجدا بوو لە تەینالێ.

هەموو ئەو پێشمەرگانەی لای من بوون خزمی خۆم بوون یان قەرەچەتانی بوون، پێشتر لە بەتالیۆنی قەرەچەتان بوون، لەوانە جەبار ئەحمەد سەعید کاتبی فەوج بوو، فەلاح حسەین و ئەکرەم و ئەنوەر کەریم حەسەن و تایەر حەمەئەمین ئامر حەزیرە بوون، باتیل خەڵکی تەینالێ بوو پێشتر لە سوپای عێراق ڕەیس عەرەفا بوو هەموو رۆژێك دەهات مەشقی پێدەکردن. هیوا حەمەبۆر هەواڵگری بوو، ئاسۆ سورداشی ئامر فەسیل بوو.

ساڵی ١٩٩٢ گرانی بوو، لە لایەن رژێمی بەعسەوە گەمارۆی ئابووری خرابووەسەر هەرێمی کوردستان بە تایبەتی لەسەرڕێگای کەرکوك و بەغداد بە قاچاغ نەبێت هیچ نەدەهات. من و ئەحمەدی برام دەستمانکرد بە چاندنی زەوییەکانمان بە تایبەتی زەوییە درێژ و

چقڵاوی، ساڵێك دەمانكرد بە نۆك و ساڵێكیتر بە گەنم، وەزعمان لە چاو خەڵكدا زۆر باش بوو، یارمەتی زۆربەی خزمەكانمان دەدا بە تایبەتی عومەری برام و خوشك و براكانمان كە منداڵ بوون، زۆر خزمی نزیكی ترمان وەكو پوورزاكانمان و خزمەكانی خێزانم، جگە لەوەش من مامەڵەی ترم دەكرد و دوكانێكم هەبوو لە سەعید تەها كۆیی لەگەڵ تەهای حەمەئەمین و زوورار و سەروەر حاتەم كاسپیم دەكرد.

لە بەهاری ١٩٩٣ شەڕ دەستیپێكرد لە نێوان یەكێتی و بزوتنەوەی ئیسلامی. ئێمە فەرمانمان پێكرا بۆ شەڕ و ناوچەی بازیانمان پاككردەوە. لەو شەڕەدا نامیق یاخسەمری بە سەختی بریندار بوو، بردمان بۆ سلێمانی بە زەحمەت چاك بووەوە، چەند بتڵ خوێنی تێكرا. دوای شەڕی ئیسلامی لە مانگی ١١ی ١٩٩٣ كاك سوهاد بە من و تەها سێكانیانی وت: بچن بۆ لای كاك جەبار فەرمان لە وەزارەت كە چووین سەردانی كاك جەبارمان كرد وتی: هەموو كەمئەندام و بەساڵاچووەكان ناویان لامە بۆ خانەنشینی، بەڵام كاك قادر قادری جێگر رازی نییە، دەیەوێت ئەوانەی پێشمەرگەی ئەیلولن خانەنشینیان بكات. پێم باشە كاك تەها بچێت ببێت بە بەرێوبەری ئاوی دوكان و كاك كەریمیش بچێت بۆ مەڵبەندی سلێمانی لەوێ مەكتەبێكمان دروستكردووە بە ناوی مەكتەبی كۆمەڵایەتی با لەوێ ئیش بكات. نووسراوی بۆ كردین، من نووسراوەكەم هێنایەوە و بردم بۆ مەڵبەند لەوێ شێخ عبدالكەریمم بینی وتی: لە جێگاكەی تۆ حەمەئەمین كوێرەكانی دادەنێن ئەگەر پێت باش بێت و بە خزمەكانی خۆت بڵێیت هاوكاری بكەن، منیش زۆرم پێ باش بوو. ئاوات بەهادین پێیوتم: فەرمانت بۆ دەربكەم بتكەم بە كارگێڕ لە مەكتەبی كۆمەڵایەتی؟ پێمووت: جارێ نووسراو مەكە من دەچم بۆ لایان بزانم پێیانخۆشە

لەگەڵیان ئیش بکەم یان نا؟ ئەگەر پێیانخۆش بوو ئینجا نووسراو بکە.
بۆ بەیانی چووم بۆ ناوەندی سلێمانی کە بارەگاکەی لە فلکەی خاڵە حاجی بوو، لەوێ شێخ عومەر و شێخ دارا و شێخ مەحمود باراوی لێبوو، پاش قسەکردن پێموتن: دێم بۆ لای ئێوە بۆ ئیشکردن ئەگەر پێتانخۆش بێت؟ زۆریان پێخۆش بوو کە من لەگەڵیان کار بکەم. گەڕامەوە بۆ مەڵبەند و ئاوات بەهادین بردمی بۆ لای کاک عومەری سەید عەلی کە لێپرسراوی مەڵبەند بوو، لەوێ کاک عومەری سەید عەلی نووسراوی بۆ کردم بۆ ناوەندی کۆمەڵایەتی سلێمانی بە پلەی کارگێر. چوومەوە بۆ ناوەندی سلێمانی دەستبەکاربووم. لە مانگی ١١ی ١٩٩٣، گەڕامەوە چوومەوە بۆ فەوجەکە بۆ ئەوەی نووسراوی خانەنشینیم بۆ بکەن بۆ قیادەی مەنتیقەی سلێمانی، کە نووسراویان بۆ کردم، بردم بۆ قیادەی مەنتیقەی سلێمانی، لەوێ شەهید قادر کۆکۆیی و شێخ عومەری مامە رەزام بینی لەگەڵم هات بۆ لای کاک مەحمود سەنگاوی و پێیانوت: کاک حەمەکەریم پیاوێکی ئازا و شۆڕشگێرە دەبێت بە پلەیەکی باش خانەنشین بکرێت، کاک مەحمود وتی: من بە جێگری ئامر فەوج خانەنشینی دەکەم کە مانگی ٥٠٠ دیناری پێدەدرێت تا خانەنشین دەکرێت. ئێمە پەیوەندیمان بە کاری ترەوە نییە. خۆیان نووسراویان بۆ کردم و خۆشیان وەزارەتیان ئاگادارکردەوە. دوای ئەوە گەڕامەوە بۆ کۆمەڵایەتی و وەکو کارگێڕی ناوەندی سلێمانی دەستم بە کارکرد.

حەمەی شێخ جەلال لێپرسراوی لیژنەی قەزای دوکان بوو، بۆ بەهاری ١٩٩٤ بارەگامان لە فلکەی خاڵە حاجییەوە گواستەوە بۆ ماڵی بابا تایەر لە تووی مەلیك، لەو کاتەدا کۆمەڵێك چەك بۆ کادر و ئەندامەکانی ناوەند هاتبوو. نێوانی حەمەی شێخ جەلال و خوالێخۆش

بوو بابا تایەر تێكچوو، هەڵبژاردنێك بۆ لیژنـەی قـەزای دوكـان كـرا لـە ناوەندی سلێمانی من خۆم كاندید كرد، بە كـۆی دەنـگ مـن كـرام بـە لێپرسراوی لیژنەی قەزای دوكان.

لە ساڵی ١٩٩١ بە دواوە ئازادی و خۆشگـوزەرانـی بـاڵـی بـەسـەر كوردستاندا كێشا، خەڵكی بەشوێن بووژانەوەی خزمایـەتـیـدا دەگـەڕان. كۆمەڵێك پێشتر جاف نەبوون یان كەس نەیدەزانی كە ئەم خزمانە جافن، خۆیان ناساند بە تیرەكانی جاف، كۆمەڵـێـك دەیـانـوت: گـۆرانـین، بـە تایبەتی ئەو گوندانەی زوو نیشتەجێببوون وەكو: یالانقۆز و تـەڕەمـار و قازان و گەبە و زێویێ و گولیجە و هتد، خەڵكی ئەو گوندانە دەهاتن بۆ لام بە كۆمەڵ دەیانوت: ئێوەش گۆرانن؟ منیش پێمووتـن: لـە وەقـائـیـعـی عێراقی كۆندا ناوی دوو بنەماڵەی قەرەچەتان بە ئاغا یان بەگ هاتووە و لە تاپۆی توركیش بە هەمانشێوە، باووباپیری ئـێـمـە نـازنـاوی بـەگ و ئاغایان پێوەیە، لەبەر ئەوە وازیان لێمانهێنا كە بڵێن گۆرانین! چـونـكـە ئەوەی نازناوی ئاغای پێوە بووایە نەدەبوو بە گۆران، بەڵام لە باپـیرانـی خۆمان هاتبوو كە ئێمە و ئاغاكانی كانی میران یەك رەچەڵەكمان هەیە و باپیرمان یەكە. دوای ئەوە برادەرێكی تیرەی هەمەوەند كە ناوی مەریوان بوو لەگەڵ حەمەی سلێمان هاتن بۆ لام، خەریكی نووسینی كتێبێـك بـوو لەسەر هەمەوەند. وتی: ئێوە ئەو دوو بـنـەمـاڵـەیـەی قـەرەچـەتـان كـە نازناوی ئاغاتان پێوەیە لە تـیرەی سـەفـرەوەنـدن كـە بـە بـەگـزادەی هەمەوەند ناسراوە، ئەو دوو بنەماڵەیە یەكێكیان بنەماڵەی هۆمەر ئاغا و ئەویتریان بنەماڵەی حەمە ئاغای گۆچان بەدەستە، بەڵام ئێمە و گۆران و هەركییەكانی قەرەچەتان پێمانباش بوو قـەرەچـەتـانچـێـتـی بـكـەیـن و تیرەگەری نەكەین، بۆ قوڵ نەبوونەوەی كێشە كۆمەڵایەتییەكان. خـزم و

کەسوکاری خۆم کە راوێژم لەگەڵ کردن هەر وایان پێ باش بوو، دوای ئەو لێکۆڵینەوانە دەرکەوت کە بنەماڵەی حەمە ئاغای گۆچان بەدەست و بنەماڵەی هۆمەر ئاغا ئامۆزای یەکن و یەك رەچەڵەکیان هەیە. ئێمە هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرا و نووسینمان نییە کە تەواو بیسەلمێنێت ئەو دوو بنەماڵەیە هەمەوەند بن، بەڵام ئێمە دۆستایەتی و خزمایەتی هیچ تیرە و تایەفەیەك رەت ناکەینەوە، وەك قاسملۆ دەڵێت: دۆستت هەزار بێت کەمە و دوژمنت یەك بێت زۆرە. لە دوای راپەڕینەوە هیچ دۆژمنایەتی یان ناخۆشی لە نێوان بنەماڵەکانی قەرەچەتان خۆیان یان لەگەڵ گوندەکانی تر رووینەداوە، تەنها ئەوە نەبێت کە ئێمە و قەرەوەیسییەکان تووشی کێشە بووین، بەڵام بەزووترین کات چارەسەرکراوە و ئێستا دۆست و برای یەکین، هەر کێشەیەك روویدابێت خێرا چارەسەرکراوە. کاك مەریوان پێیووتم: کە ناوی حەمە ئاغای گۆچان بەدەست و هۆمەر ئاغا لەناو داری بنەماڵەی هەمەوەند هەیە. من نەمووت: ناتوانم بڵێم وا نییە، چونکە تەنها دەماودەم بیستبووم، بەڵام هیچ بەڵگەیەك نەبوو. کۆبوونەوەی زۆرم لەگەڵ کەریم ئاغای هەمەوەند کرد، بەڵام زۆر بە ئاگاهی بڕیار دەدەم، چونکە ناخۆشی لە نێوان قەرەچەتان و هەمەوەند هەبوو، زۆر لە بنەماڵەی حەمە ئاغای گۆچان بەدەست لە بنەچەی خۆیان سڕابوونەوە وایاندەزانی بۆ پارە یان بۆ سەندنی زەوی هاتوون، بە تایبەتی بنەماڵەی مەلا فەرەج و مەلا مەجید و مەلا قادر، ئەمانە ئامۆزای یەك بوون و لەبەر گرانی و کێشەی کۆمەڵایەتی یەکتریان نەدەناسی و لە بنەماڵەی خۆیان سڕابوونەوە ! دوای راپەڕین دەرکەوت کە بنەماڵەی کوێخا حسەینی هەناران و کانی سپیکەییەکان و کانی میرانییەکان و کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە سەر بە تیرەی هەمەوەندن، بەڵام من خۆم باش

ساغنەکردۆتەوە کە هەمەوەندین یان نا، بەڵام ئەوەی بە لای منەوە گرنگە کە ئێمە پێش هەموو شتێك قەرەچەتانین و نازناوی قەرەچەتانیم پێوەیە، خۆم زۆر بە شتی ترەوە خەریك نەکردووە، چونکە من خۆم بە مارکسی ناساندووە و خۆم بە تیرە و خێڵایەتییەوە خەریك نەکردووە. زیندووکردنەوەی تیرە و خێڵگەرایەتی لە خزمەتی کوردایەتیدا نەبووە، پێمباشە نزیکی لەگەڵ هەموو گوندەکانی نزیك قەرەچەتان هەبێت نەك دوورکەوتنەوە، هەرچەندە دوورکەوتنەوە لە هەموو کەسێك خراپە تەنها دۆستایەتی و خۆ نزیککردنەوە چارەسەری پەیوەندییەکان دەکات.

هیوادارم نەوەکانی دوای من هەمان ڕێگای دۆستایەتی و خۆ نزیککردنەوە بکەن بە ئامانج نەك دوورکەوتنەوە. ئەم سەردەمە سەردەمی جیهانگیرییە و دەبێت هەموو کەسێك بەرژەوەندی گشتی لە بەرچاو بگرێت، نەك خۆ پەرستی و سەرمایەداری کە ببێتەهۆی لێکترازان، بەڵام مێژوو ئەو ڕاستییە دەسەلمێنێت کە بنەماڵەی ئێمە و حەمە ئاغا و هەمەوەندییەکان، کە چوونە کرماشان پێکەوە لە تورکیاوە لە شاخی دەماوەندەوە هاتووینەتە رەبەت لە ئێران، بەشێکمان لەوێ ماوەتەوە و بەشێکی ترمان چۆتە کرماشان و ئێمەش هاتووینەتە شاربازێر لە ئاوکورتێ، بەشێك جیابۆتەوە و هاتووینەتە شاخی پیرەمەگرون و لە قەرەچەتان نیشتەجێبووین، دوای ماوەیەکی زۆر ئەو بەشەی کە خۆیان بە هەمەوەند ناساندووە لەگەڵ نادر شای ئێران تێکچوون و بەشێکیان لە کرمانشان ماونەتەوە و ئەوانی تر کۆچیان کردووە بەرەو ناوچەی سلێمانی لە چەمچەماڵ و بازیان نیشتەجێبوون، نێوانیان لەگەڵ ئیماراتی بابان خۆش بووە دژی دەسەڵاتی تورك بوون. هەمەوەندیش بە مانای هەمووان دێت مەرج نییە یەك پشت بین، بەڵام

پێکەوە هاتووینەتەخوارەوە لە تورکیاوە لە ئێران جیابووینەتـەوە، هـەر کەس مافی خۆیەتی خۆی بە هەمەوەند دەزانێت یان نا.

لە مانگی ١٢ی ١٩٩٣ بارەگای کۆمەڵایەتی گواسترایەوە بۆ تـووی مەلیك لە ماڵی شێخ جـەلالی حـەفـیـد بـوو، لـەوکـاتـەدا وەزع لـەگـەڵ بزوتنەوەی ئیسلامی باش نەبوو، شەوێك لە سلێمانی هێرشیانـکـردەسـەر بارەگای ناوەندی سلێمانی و هەموو کـەلـوپـەلـەکـانـیـان بـرد و دوایـی سووتاندیان، ئێمە لەو باوەڕەدا نەبووین هێرش بکەنـەسـەر بـارەگـاکـە، چونکە بنکەی سەربازی نەبوو، زۆربەی برادەران کەسـانـی بـەسـاڵاچـوو بوون یان سەیدی حەفید بوون، بەڵام ئەوان بـە فـەرسـەتـیـان زانـیـبـوو هاتبوونەسەر بارەگاکە و دەستی خۆیان وەشاندبوو، بەڵام دوایی بـاجـی ئەوکارەیان دا و لە سلێمانی دوورخرانەوە بۆ شاخی گۆیژە و دواتـر لـە ناوچەی سلێمانی نەمان و چوون بۆ ناوچەی شارەزوور و کۆتاییانپێهـات، لەوکارە ناڕەوایەی کە کردبوویان لە بارەگاکە ئەوە بوو کە وێنەی شێخی نەمر شێخ مەحمودی حەفیدیان دابووە بەرگولله کە هەموو وێـنـەکـەیـان شێواندبوو بە گولله، ئەمکارە نامرۆڤایەتییە خەڵکی سلێمانی لە خـۆیـان تووڕەکرد لە بزوتنەوەی ئیسلامی، چـونـکـە شـێـخ مـەحـمـود ڕەمـزی بەرخودانی سلێمانی بوو.

لە ساڵی ١٩٩٤ سەردانی کاك مـولازم عـومـەرم کـرد، پـێـمـوت: برادەرانی پارتی لە پیرەمەگرونن، بە پارەوە دەگەڕێن بە تایبەتـی کـاك عارف تەیفوور، لەوانەیە لە برادەرانی ئێمـەش هـەبـێـت لـەو پـارەیـەی وەرگرتبێت، ئەگەر وریا نەبین لەوانەیە کۆمیتە بـگـیرێـت! کـاك مـولازم عومەر وتی: بە بۆچوونی تۆ چی بکەین باشە؟ بۆچوونـی خـۆم پـێـووت وتم: ناوی کۆمەڵێك پێشمەرگەی دێرینی وەك خالید گـرژەیـی و شـوانـە

موغاغی و بێستوون سابووراوەیی بدە بە ئیزگە بڵێ بچن بۆ بارەگای پیرەمەگرون لە پێش هەموویاندا ناوی من بدە بە ئیزگە، بۆچوونی منی پەسەندکرد، بەڵام بەداخەوە فریانەکەوت ناوەکان بدات بە ئیزگە، بۆ شەوەکەی پارتی بارەگای کۆمیتەی گرت و سووتاندنی، بۆ بەیانی ئاگر و دوکەڵ لە کۆمیتە بەرزبووەوە.

لە شەڕی کۆمیتەدا بەداخەوە پێشمەرگەی دێرین عوسمان صالح جاف شەهید بوو کە تەنها ئەو شەڕی کردبوو، لەگەڵئەوەشدا کە دوو برای ئەنفال بوو بەس خۆی مابووەوە، ئەویش لەو شەڕەدا شەهید بوو، برادەران کۆبوونەوە لە قاتعی چوار و منیش چووم بۆ لایان پێمووتن: بارەگای کۆمیتە چۆڵە و ئەوانەی کۆمیتەیان سووتاندووە بەرەو چەرمەگا رۆیشتوون. دوای کۆکردنەوەی هێز لە سلێمانییەوە بەرەو چەمی رەزان پاشەکشەیان کردووە لەوێش کۆتایی بە شەڕ لە سنووری ئێمە هات، بە داخەوە ئەو شەڕە بە جۆرێك بوو کە شەڕی ناوخۆی لێکەوتەوە و تا ٣١ی ئاب کە یەکێتی پاشەکشەی کرد، لە سنووری ئێمە شەڕی تر روویندایەوە.

لە ساڵی ١٩٩٤ کە پەیوەندیم کرد بە ناوەندی سلێمانی کۆمەڵایەتییەوە، ئەم برادەرانە کارگێڕ بوون، خوالێخۆش بوو حاجی مەحمود گەلاڵەیی لێپرسراوی شاربازێڕ، خوالێخۆش بوو محەمەد حاجی سابیر لێپرسراوی شارەزوور، خوالێخۆش بوو شێخ بەکر سعید حەمەلاو لێپرسراوی بازیان، منیش کرام بە لێپرسراوی دوکان، خوالێخۆش بوو کاك ئەنوەر و کاك ئاوات حاجی مەحمود کارگێڕی ناوەند بوون، خوالێخۆش بوو ئیسماعیل عەرەب ئەندامی ناوەندی فەخری بوو، کاك محەمەد فەرەج موشریف بوو، شێخ عومەری شێخ کەریمی حەفید و

خوالێخۆش بوو شێخ دارای حەفید و شێخ عومەر باراوی وەکو جێگری شێخ بابا تایەری حەفید خوالێیخۆش بێت دەستنیشانکرابوون، بەڵام هەر پلەی کارگێڕیان هەبوو بۆ کاروباری ناوەند، ڕۆژانە کە دەوام دەکرا هەر بە وتەی جوان و سەرگوزەشتەی کۆن و نوکتە و پێکەنین ڕۆژەکانمان بەڕێدەکرد، ئەم برادەرانە زۆر قسەخۆش و زمان شیرین بوون.

پێش من ئەم لیژنەیە محەمەدی شێخ جەلال سەرگەڵویی لێپرسراوی بوو، وازیهێنا و چوو بۆ دەرەوەی وڵات، دوای ئەو من بە هەڵبژاردن بووم بە لێپرسراوی لیژنەکە. ئەم لیژنەیەی کە من لێپرسراوی بووم سنووری چالاکی فراوان بوو، بریتی بوو لە ناوچەکانی پیرەمەگرون و سوورداش و دوکان و خەلەکان و بنگرد، کۆمەڵێك کادێری باش لەگەڵم بوون وەکو مەلا بەکری جاسەنە کە یاریدەدەرم بوو، ئەحمەد هەڵەدنی و نەوزاد حەمەسووری قەرەچەتان و کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە و مەلا صدیقی بۆکدی و شەوقی کوێخا سمایلی تەلان و عەبدوڵلا حەمەخورشیدی جاسەنە و عەبدوڵلا مەلا عەلی تەلان و سەلیم هەڵەدنی و سەلمان فەتاح جاسەنە و بەکر حسەین یاخسەمەری و مەلا بەکری قازیاوا و خەلیل حەمەئەمینی گەبە و مام مەحمود شارستێنی و مەلا مەحمود و جەمال زێوێیی و مەلا ڕەسووڵ شارستێنی و حەمەڕەشید چوبڵاخی و جەمالی مەلا ڕەسووڵی سەرگەڵوو و مام جەمال سەرگەڵوویی ئەنجوومەن و هیوا حەمەبۆر سورداشی و محبوبە مەلا حەسەن کوێرەکانی و کەریم سلێمان قامیشی و محەمەد سوارە هەڵەدنی و ئیبراهیم شاقووڵی و حاجی مەحمود سەرگەڵوویی و حاجی عەبدولڕەحمان تەلانی و ئەکرەم سێکانیانی و خەسرەو نوری گورون قەرەچەتانی و عەلی حاجی ڕەشید قەرەچەتانی. ئەم برادەرانە چالاکییان زۆر بوو لە ناوەند دەیانووت: ئەم ناوچەیەی ئێوە پڕ کێشەیە نەیاندەووت زۆر چالاکن .. بە داخەوە.

لە بەهاری ساڵی ١٩٩٤ کاتێك ئەحمەد رەزا پەیوەندیکرد بە ناوەندەوە، پێمووت: پێویستە فۆڕم دروست بکرێت بۆ کێشە کۆمەڵایەتییەکان، هەر کەسێك دێت بۆ ناوەند بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی پێویستە نووسراو ئاڕاستەی ناوەند بکات و داوا بکات کە ناوەند هاوکاری بکات بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی. ئەحمەد رەزا فۆڕمی دروستکرد و مۆری ناوەندی سلێمانی هەڵگەند، ئەو فۆرمەی کە دروستکرا ناوی لایەنی یەکەم و لایەنی دووەم تێدا نووسرا و لەگەڵ ناوی لێپرسراوی ناوەند بۆ ئەوەی ئیمزای کۆتایی بکات، جۆری کێشەکە نووسرا بۆ ئەوەی بزانرێت بە بەرامبەر یان بێ بەرامبەر چارەسەرکراوە، کێ لە چارەسەرکردنی کێشەکەدا دەوری هەبووە، بەوجۆرە چارەسەرکردنی کێشەکان بە جۆرێك رێڕەوی رەسمی خۆی وەرگرت.

لە سەرەتای دروستبوونی ناوەندی کۆمەڵایەتی سلێمانی وەکو دیوەخانێك وا بوو، رۆژێك عەبدوڵڵا هەمزە کە لێپرسراوی ئیداری مەکتەبی کۆمەڵایەتی بوو، دوو عەلاکە پارەی هێنا و لە ناوەندی سلێمانی دانا و خوالێخۆش بوو بابا تایەری حەفید دابەشی دەکرد بە بێ ئیمزا و لیستی مووچە، کاتێك ئەحمەد رەزا هات کە گەنجێکی تێکۆشەر و زیرەك بوو، لەگەڵێدا کەوتمە گفتوگۆ پێمووت: لەگەڵ کاك یاسین و خوالێخۆش بوو کاك ئەنوەر قسە بکە با لیست دروست بکرێت بۆ مووچە و خەرجی، دیار بوو خوالێخۆش بوو کاك ئەنوەر پێیناخۆش بوو، بەڵام یاسین کە کورێکی گەنج بوو حەزی لە رۆتینات نەدەکرد، دواتر لەگەڵ شێخ بابا تایەر قسەیان کرد و پێیباش بوو فەرمانی کرد کە نابێت بەبێ ئاگاداری ئەو هیچ کارێك بکرێت، دەستکرا بە دروستکردنی لیست بۆ مووچە و خەرجی لە لایەن کاك ئەحمەد رەزاوە بە ئاگاداری شێخ بابا تایەر.

لە ساڵی ١٩٩٤ بەدوواوە ناوەندی سلێمانی زۆر گەشەی کرد، دەستکرا بە چارەسەری کێشە کۆن و تازەکان، ئەو فۆرمەی ئێمە دروستمان کردبوو و ئیمزامان دەکرد لەسەرەوە لای دادگا و دادوەر پەسەند دەکرا، جارێك کێشەی کوشتن هەبوو لە ناوچەی دوکان چارەسەر کرابوو بەرامبەر ١٠٠ هەزار دیناری سویسری، ئەو پارەیە لای ناوەند پارێزراو بوو تا خاوەن کێشەکە نەچووایەتە دادگا، کاتی دادگاییکردن دایکی کوژراوەکە پەشیمان بووبووەوە کە چووبووە لای دادوەر، دادوەر ئێمەی بانگکرد و پێیووتین: ئەم رێککەوتنەتان چۆن کردووە؟ بۆچی دایکی کوژراوەکە سکالای یاسایی هەیە!؟ منیش بە دادوەرم وتم: تەماشای فایلی کێشەکە بکە و بزانە ئەم ژنە رەزامەندی داوە یان نا!؟ کاتێك تەماشای فایلەکەی کرد لە ژنەکە تووڕە بوو پێیوت: تۆ سکالا لە کوڕەکانت بکە کە پارەیان نەداویتیً، لە کاتێکدا تۆ رەزامەندیت نیشانداوە لە رێکەوتنەکەدا، دادوەر سوپاسی ئێمەی کرد و گەڕاینەوە. ناکرێت دەوری ئەم بەڕێزانە لە بیر بکرێت وەکو شێخ دلێر و مەحمود کوێخا سمایل و ئەحمەدی برای و بەختیاری عومەری حەمە عەلی و سەلیم ئەحمەد و مستەفا بەردەگەڕی و سەلام مامەند و محەمەدی حاجی مەحمودی پڵنگە و هتد کە لە ماڵی خۆیان بە بێ بەرامبەر یان لە ناوەندی سلێمانی چارەسەری کێشەی کۆمەڵایەتی جۆراوجۆریان کردووە.

لە سنووری ناوەندی کۆمەڵایەتی سلێمانی کێشەی هەمەوەند هەبوو کە زیاتر لە ٥٠ کوژراو هەبوو کۆتایی هات.

لە مانگی ٦ ی ١٩٩٥ شێخ عزەدین عبدولڕەحمان هات بۆ ناوەندی سلێمانی، پێشتر لە وەزارەتی تەندروستی راوێژکار بوو، گرووتینێکی

زۆری دا بە کۆمەڵایەتی زۆر چالاك بوو، چونکە کاری تەندروستی لە گوندەکان ئەنجامدەدا بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندە وێرانبووەکان. لە ناوەندی کۆمەڵایەتی سلێمانی کاری زۆر باشی دەکرد، بە پلەی کارگێڕ دەستبەکار بوو لەگەڵ من و شێخ مەحمود رۆژانە کاری کۆمەڵایەتی ئەنجامدەدا، دواتر بوو بە لێپرسراوی لیژنەی چوارتا دوای مردنی حاجی مەحمود گەلاڵەیی. کوێخا کەریمی ماوەت خوالێیخۆش بێت بوو بە لێپرسراوی لیژنەی ماوەت لەگەڵ عەلی ئاغای ئاوکورتێ خوالێیخۆش بێت بۆ ناوچەی شارباژێڕ، بۆ چالاکی زۆر لێهاتووبوون، لە چوارتا کوێخا عەبدوڵڵای گەنگێ و عەبدوڵڵا حاجی عومەر و رێبوار کەریم کادری باش بوون.

لە هاوینی ١٩٩٦ کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە هاتە لام وتی: بەهادین نوری ئەنوەری کوڕمی لای مام جەلال داوە بەگرتن، دەچمە هەر شوێنێك دەڵێن تا بەهادین نوری رازی نەبێت ئازاد نابێت، دەڵێن شوعییە و تۆ دەیناسی، (کاتێك بەهادین نوری چووبوو بۆ هەولێر بە چەکەوە ئەم لە بازگە نەیهێشبوو بڕوات پێیوتبوو تۆ فەرمان و مۆڵەتت پێ نییە)، کە چووین بۆ لای بەهادین نوری نامەی ئازادبوونی بۆ نووسی بوو، ئەنوەری کوڕی کوێخا نەریمان لە شەڕی ناوخۆدا شەهید بوو بەداخەوە.

دوای شەهیدبوونی ئەنوەر مام جەلال بروسکەی کردبوو بۆ ناوەندی سلێمانی کە کوێخا نەریمان بنێرن بۆ لام، شێخ باباتایەر بە منی وت: کوێخا نەریمان لەگەڵ خۆتدا ببە بۆ لای مام جەلال، منیش راپۆرتێکم نووسی کە تیایدا دەستنیشانی ئەوەم کردبوو ئەو هێزەی لە سەرجادەی دوکان سلێمانی دانراوە ئاڵوگۆڕی پێبکرێت، چونکە خەڵك زۆر ئازار دەدرێن، ئاوەدانکردنەوەی چەمی رەزان کە خۆی ئاشنای ئەو

ناوچەیەیە، پاراستنی شوێنەوارەکانی ناوچەکە، کە خەڵك بۆ بازرگانی بەکاریدەهێنا، کە چووین بۆ لای مام جەلال بریتی بووین لە من و کوێخا نەریمان و ئەحمەد چەقڵی و سەرداری کوڕی کوێخا نەریمان و برازاکەی، ڕێزی زۆری لێگرتین و ڕاپۆرتەکەم داپێی، کە خوێندیەوە پێی باش بوو، هێزەکەی گۆڕی بە هێزی بادینانی، لیژنەیەکی لە ڕێکخراوی کرا نارد بۆ ناوچەکە بۆ ئاوەدانکردنەوەی، بۆ پاسەوانی شوێنەوارەکان نامەی پێدا ناردم بۆ لای کاك عومەری سەید عەلی کە ئۆتۆمبیلێك و ٣٠ پێشمەرگە دابین بکات بۆ من، بەڵام ٣١ی ئابی بەسەرداهات. مام جەلال ڕوویکردە کوێخا نەریمان وتی: کوڕەکەت شەهید بووە و سەرەخۆشی لێکرد و وتی: کوڕی کەت هەیە لە شوێنی دایبنێم وتی: بەڵێ ئەوە سەرداری کوڕمە، نامەی بۆ نووسی بۆ مامۆستا جەمال و غەریب عەسکەری کە لە شوێنی ئەنوەر سەردار دابنێن.

لە بەهاری ١٩٩٦ شێخ عێزەدین هات بۆ کۆمەڵایەتی کە ڕاوێژکاری وەزارەتی تەندروستی بوو، ئەندامێکی زۆر چالاك بوو زۆر هاوکاری هاوڵاتیانی دەکرد بەهۆی ئەوەی کە دانانی زۆربەی بنکە تەندروستییەکانی گوندەکان بە هەوڵی ئەم بووە، کردنەوەی ئەم بنکانە داخوازی هاوڵاتیانی گوندەکان بوو بەشێك بوو لە چالاکی کۆمەڵایەتی، بەیانییەکی زوو لە کاتی هاتنی بۆ سەرکار لە ناوەند پیاوێکی ریشن بەنیازی شەهیدکردنی لەسەر شەقامی تووی مەلیك تەقەی لێکرد، کەس نەیزانی کێیە، بەڵام خۆشبەختانە جێگای کاریگەری نەگرت، من و حاجی مەحمودی گەڵاڵە پاش چەند خولەکێك گەیشتینە نەخۆشخانە، دوای دوو ڕۆژ کە باش بوو چووەوە بۆماڵەوە، بۆ چارەسەر ناردیان بۆ ئێران، دوای گەڕانەوەی کەوتەوە کار و چالاکی لە کۆمەڵایەتی و وەزارەت.

لە کاتی ٣١ی ئابدا یەکێتی پاشەکشەی کرد بەرەو سنوورەکان، ئێمەش بەڕێکەوتین شەوی ١ / ٢ی مانگی ئەیلول بوو خۆمان ئامادەکرد کە بریتی بووین لە من و یاسین و کاوە و یوسف و جەبار و رەحیم، کاك یاسین پێی باش بوو کە ئۆتومۆبیلی بەڕێوبەرایەتی گەیاندن بێنێت کە خۆی فەرمانبەری ئەوێ بوو، ئێمەش خێمە و کەلوپەلمان ئامادەکرد و بۆ شەو بەڕێکەوتین، بەرەو ماوەت رۆیشتین و شەو گەیشتینە ئەوێ و ماوەیەك پشوومان دا و بەڕێکەوتین، لە هەورازەکەی ئەزمەك ئۆتۆمۆبیلەکەمان پەکیکەوت و ناچارماینەوە تا چەند کاتژمێرێك، دوایی بەڕێکەوتین بۆ گوندی مەروێ و لەوێ کەلاوەیەکمان دەستکەوت و خێمەکەمان دابەسەریدا و پشووماندا، بۆ بەیانی هەموو سەرکردایەتی یەکێتی لەوناوەبوون، تا ئێوارە لەوناوە بووین دوایی هەواڵ هات لە لایەن کاك فوئاد ئەحمەد و خێزانەکەیەوە وتیان: سەرکردایەتی بەرەو سەرچەم رۆیشتوون. ئێمەش دوای ئەوان کەوتین بەرەو قاسمە رەش، لە چەمی چۆمان بەرینەوە و لەوبەر دەستمانکرد بە ناوساجی سوورکردنەوە لەلایەن خێزانەکەی کاك فوئادەوە بۆمان ئامادەکرا، دوای کردنەوەی مەرزەکە ئەوەی چەکدار بوو بەرەو قاسمەڕەش بەڕێکەوت و ئەوەی بێ چەك بوو بۆ سە یرانبەن ناردیان، ئێمە بەڕێکەوتین بۆ قاسمەڕەش، بۆ بەیانی گەیشتینە کەپران و نان و چامانخوارد، بینیمان پیاوێك لەوناوەیە کە نزیك بووەوە وتم: ئەوە تەیبە ئەویش نانی لای ئێمە خوارد و گەڕایەوە بۆ مەهاباد کە ماڵی لەوێ بوو، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە بنەوخەڵەف کە کوڕی کاك محەمەدی سەنگەسەر کە ناسرابوو بە دێوەسپی لەگەڵ رەحیم چاك و چۆنیان کرد و میواندارییان کردین بۆ ماڵی خۆیان لە بنەوخەڵەف، بەڵام وتمان دەچین بۆ قاسمەڕەش، لە رێگا

ویستمان بچینە سەردەشت پاسدار نەیانهێشت لابدەین لە جادە تا گەیشتینە قاسمە ڕەش، لەوێ دوو شەو ماینەوە لە خێمەی کاك فوئاد، کە بۆ خۆی و خێزانەکەی وەریگرتبوو، چونکە خێمەیان دەدا بە خێزاندار، دوای چەند ڕۆژێك بەرەو زەڵێ ڕۆیشتین و لەوێ بارەگای خۆمان دانا بە خێمەی خۆمان، نزیکی خێمەی شێخ باباتایەر بووین، بەڵام خێمەکەی ئێمە چونکە هی خۆمان بوو گەورەتر بوو. لە کاتی خێمە هەڵداندا پێویستیمان بە دارێکی درێژی شەش مەتری هەبوو نەماندەزانی چۆنی پەیدا بکەین، بینیمان لە دوکانێکدا پیاز دەفرۆشرا داری بەو جۆرەی لێبوو، لەگەڵ ڕەحیم و هادی ئەکرەمدا بەرنامەمان دانا بۆ بردنی ئەو دارە، چونکە دوکاندارەکە پێمانی نەفرۆشت، بە ڕەحیمم وت: بچۆ معامەلەی فەردە پیازەکە بکە بە نیازی کڕینی پیاز تا دوکاندارەکە بخلافێت و ئاگای لە بردنی دارەکە نەبێت، منیش دارەکەم لە کەپرەکەی دەرهێنا و دام بە هادی بردی بۆ لای خێمەکەی خۆمان، کابرا ویستی بچێتە دەرەوەی کەپرەکە من پێمووت: کاکە ئیشمان هەیە خێرا پیازەکە بکێشە بۆمان، کابرا گەڕایەوە بۆ کێشانی پیازەکە و ئاگای لە بردنی دارەکە نەمابوو! ؟ دوای چوونمان بۆ لای خێمەکەی خۆمان دارەکەمان کرد بە ژێر خێمەکەدا و کابرا هەر سەیری لای ئێمەی دەکرد و نەیدەزانی دارەکە لەوێیە ! دوای هەڵدانی خێمەکە وەك بارەگای لێهات زۆربەی کادرانی کۆمیتەکانی بازیان و پیرەمەگرون دەهاتن بۆ خۆگەرمکردنەوە، ئێمە خۆمان بریتی بووین لە من و یاسین و کاوە و هادی و یوسف و جەبار و ڕەحیم، دواتر صەلاح و سەرکەوتیش هاتن. لەگەڵ شێخ باباتایەر و شێخ دارا و شێخ عومەر کۆبوونەوەمان کرد و بروسکەیەکمان دا بە ئیزگە کە هەموو کادر و ئەندامانی کۆمەڵایەتی لە زەڵێ کۆببنەوە

یان بە نامە پەیوەندیمان پێوە بکەن، پاش ماوەیەك شێخ نەورەس و ئاواتی حاجی مەحمود سەردانیان کردین و هەواڵی سلێمانیان پێڕاگەیاندین، پاش ماوەیەك نیوە مووچە خەرجکرا، بڕیارمان دا کە یوسف و رەحیم و جەبار بچنەوە بۆ سلێمانی، چونکە رەحیم لە وانەیەکدا کەوتبوو دەبووایە تاقیکردنەوە بکات، لە کاتی ناردنەوەیان ویستمان لە سونێوە بڕۆن، کچەکانی شێخ داراش خوێندکار بوون لەگەڵ ئەوان ناردمانەوە، بەڵام بۆ ئێوارە گەڕانەوە، چونکە لەو ناوچەیە شەڕ دروست ببوو، بۆ رۆژی دواتر لە رێگەی کێلێوە ناردمنەوە. شێخ باباتایەر نامە و پارەی بە رەحیمدا ناردەوە، پاش چەند رۆژێك چووم بۆ لای عەلی فەتاح کە لێپرسراوی ئیداری بوو بۆ دابینکردنی ئازوقە، پێیوتم: تۆ لەگەڵ کۆمەڵایەتیت دەبێت لای ئەوان ئازوقە وەربگریت. وتم: من بارەگای خۆم جیایە. وتی: دەبێت بچیت نامەی مام جەلال بێنیت. منیش چووم بۆ لای مام جەلال کە خێمەکەی نزیکی خۆمان بوو ئەویش نامەی ئازوقەی ٢٥ کەسی بۆ دابینکردم کە چووم کمال میران و فوئاد مەعسووم لەوێ بوون کاك کەمال منی بە مام جەلال ناساند وتی: ئەوە حەمەکەریم قەرەچەتانییە، دواتر چوومەوە بۆ لای عەلی فەتاح و ئازوقەی ٢٥ کەسی بۆ دابینکردم. پاش ماوەیەك حاکم قادر فەهمی نارد بۆ لامان بۆ وەرگرتنەوەی ئۆتۆمۆبیلەکە، چونکە هەموو ئۆتۆمۆبیلەکانی حکومەتیان وەردەگرتەوە، منیش چووم نامەکەی شێخ باباتایەرم برد بۆ لای حاکم قادر کە ئەو ئۆتۆمۆبیلە بۆ کاری بارەگاکەی خۆمان بەکاردەهێنین، چونکە کاك یاسین خۆی فەرمانبەری گەیاندنە خۆی هێناویەتی و خۆشی لێی بەرپرسیارە، ئیتر وازی لێ هێناین و کاك یاسین دوای گەڕانەوەمان بردیەوە بۆ فەرمانگەکەی خۆی. کاك عومەری سەید

عەلی داکۆکی لێکردین کە ئێمە پێویستە ئەو ئۆتۆمۆبیلەمان لابێت و خۆمان بەرپرسیارێتی هەڵبگرین. کاتێك رەحیمم ناردەوە وتم: بچۆ بۆ لای عەبدوڵڵا خڕە با ئاگای لێت بێت، رەحیم کە چووبووەوە سەردانی ئەوی کردبوو ئەویش ناردبووی بۆ لای قادر قادر، ئاگایان لێی ببوو تا تاقیکردنەوەی کردبوو.

لە ساڵی ١٩٩٦ بە دواوە کۆمەڵێك کادێری کۆمەڵایەتی تێکۆشەر کۆچی دواییان کرد لەوانە شەهید شەوکەتی حاجی موشیر لێپرسراوی مەکتەبی کۆمەڵایەتی و بەکری حاجی سەفەر لێپرسراوی مەکتەبی کۆمەڵایەتی و شێخ باباتایەر لێپرسراوی ناوەندی سلێمانی و شێخ دارای حەفید و کوێخا نەریمانی کەڵەشێرە و شێخ بەکری سەید حەمەلاوی ماوەت و عەبدولڕەحمان قەرانگوێیی و ئەنوەر کارگێری ناوەندی سلێمانی و ئاواتی حاجی مەحمود کارگێری ناوەندی سلێمانی و حاجی مەحمودی گەڵاڵە کارگێری ناوەندی سلێمانی و کوێخا غەفووری حاجی مامەند و کوێخا عەبدوڵڵای کەناروێ و کەریم هەباسەگوڵە و عارف مارف و تەها بەرزنجی و سمایل عەرەبی کافرۆشی و خدری حاجی تۆفیقی تەلان و شەوقی کوێخا سمایلی تەلان و جەمالی مەلا رەسووڵی سەرگەڵو و شێخ جەمیل و شێخ کەمالی برای کە قەرەداغی بوون و مەولود گورباسی و صالّح قادر بەراز لە بەشی پەیوەندییەکان و حاجی کەریم سێ تیر لە ئەڵڵایی و حاجی قادری بازیان و شێخ غەفووری عەبابەیلێ و مەلا شێخ نەجم هانەسوورەیی و دارا کوێخا تۆفیق سوورەبانی و عارف چۆڕکی و مەلا سەعیدی زمناکۆ و جەمال کوێخا رەسوولی مالوومە و صەلاح مەجید رۆستەم جەرمەگا و ئەحمەد رەشید گەڵاڵی و مەلا رەسووڵ خەراجیانی و مامۆستا مستەفا ئابلاخی و عەلی ئاغای ئاوکورتێ و مەجید حاجی عەلی

شانەخسێ و حاجی حەمەئەمین گێڵدەرە و عابید مەنمی و شێخ محەمەد باساکی و شێخ عەلی برای و ئازاد ئەنوەربەگی حەمەڕەشید خانی بانە و حاجی عەلی باخان و شێخ حسەین باراوی و سەید رەزای کانی هەنجیر کە شۆفێری ناوەند بوو و حەمەی دێوانە شۆفێری ناوەند بوو، حەسەن سلێمان هەمەوەندی و عوسمان حاجی حەسەن گۆمەیی و شێخ خالیدی تەکیەی قەرەداغ و مەلا مستەفا ئەتروشی و عەبدولڕەحمان گۆمەشینی و کاك ئەحمەد باوکی عەشرەت کە کادرە لای ئێمە و کوێخا کەریمی ماوەت و حەمەڕەشید جوبلاخی و عەبدوڵڵای حەمەخورشیدی جاسەنە و عەبدوڵڵای مەلا عەلی تەلان و کەریم سلێمان قامیشی و محەمەدی حاجی سابیری قاینەجە کارگێری مەکتەبی کۆمەڵایەتی خوالێیان خۆش بێت. ئەمانە کۆمەڵێك کادێری کۆمەڵایەتی بوون ماندونەناسانە کاری کۆمەڵایەتییان کردووە داوای لێبووردن لە کەسوکاری ئەوانە دەکەم کە ناویانم بیرچۆتەوە.

کۆمەڵێك ئەندام و کادێری بەتوانا ئێستا بەهۆی نەخۆشییەوە لە کاری کۆمەڵایەتی دوورکەوتوونەتەوە وەکو عەبدوڵڵا حاجی عومەر سیرەمێرگی و کوێخا قادر کانی شوانی و کوێخا عەبدوڵڵا گەنکێ و حاجی عەزیزی گوێزڵێ و کوێخا رەئوف بارۆیی و حاجی رەئوفی ئابلاخ و حەمەی سوارەی هەڵەدن و شێخ مەحمود باراوی و محەمەد فەرەج قادر هەڵەبجەیی کە دامەزرێنەری کۆمەڵایەتی بووە و خەلیفە ئەحمەد مایاوەیی و چەند کەسێکی تر کە ناویانم بیر نییە داوا لێبووردنیان لێدەکەم.

لە مانگی ١١ی ١٩٩٦ من و یاسین و فوئاد گەڕاینەوە بۆ ناوشار لە سوونی و قەڵادزێوە، ئەوانەی کە رێکخستن بوون لەگەڵ مەڵبەند

هاتنەوە، کە گەڕاینەوە ماڵی سەلیمە سوورمان داگیر کرد و کردمان بە بارەگای مەکتەب و ناوەندی سلێمانی کۆمەڵایەتی، پێشتر ماڵێکی تێدابوو. لەگەڵ عەبداللە هەمزە هەوڵماندا کە رازی بێت بە چۆڵکردنی، کاتی هاتنی مووچە کاك عەبدوڵڵا هەمزە دەبووایە بچوایە بۆ ئیدارەی گشتی لە زەڵێ بۆ هێنانی مووچە. کە ئیدارەی گشتی گەڕایەوە بۆ سلێمانی مووچەی کارگێر خەرج نەدەکرا، ئێمەش پێمانناخۆش بوو چونکە مووچەکەمان مووچەی ئەندام ناوەند بوو نەك کارگێر، چووین بۆ لای مام جەلال بۆ چاککردنی مووچەکە، مام جەلال وتی: ئەوە بڕیاری گشتییە بۆ هەموو لایەکە، بەڵام دەتوانین بڕێك پارە بۆ یارمەتیدانی ئێوە بنێرین، کە ناردی بۆمان شێخ باباتایەر وتی: بۆ من هاتووە بەشی ئێمەی نەدا، نەشمانتوانی بچینەوە بۆ لای مام جەلال.

پاش دروستبوونەوەی لیژنەکان لە ناوەند من کرام بە لێپرسراوی لیژنەکانی دوکان و پیرەمەگرون بە پلەی کارگێری ناوەند تا ساڵی ٢٠٠٤، شێخ باباتایەر دوای خانەنشینکردنی وازی لە کاری کۆمەڵایەتی هێنا و جەلالی عەلی ئاغا کرا بە لێپرسراوی ناوەند کە پیاوێکی سادە و قسەخۆش بوو، لە بواری کۆمەڵایەتیدا زۆر چالاك بوو، دوای ئەوە کە ناوەندی سلێمانی بوو بە دوو ناوەند من کرام بە کارگێر لە ناوەندی دووی دەوروبەر و سەرپەرشتیاری لیژنەی سورداش و لیژنەی پیرەمەگرون، لێپرسراوی ناوەند خەباتی شێخ جەناب بوو. نزیکەی ٣٠ هەڤاڵ دەبووین زۆر چالاکانە کاری خۆمان دەکرد، لەو ئەندامانە حاجی قادر و جەبار شاوەیس و مەلا ئەحمەد و قانع مۆریاسی و خوالێخۆش بوو شێخ بەکر و ڕێبوار گەڕەدێی و شێخ جەمال نوری کارگێر بوون و عەبدوڵڵا هەمزە لێپرسراوی ئیدارە بوو کە ئیدارەیەکی زۆر باشی هەبوو،

رێبوار گەڕەدێی لێپرسراوی چوارتا، شێخ بەكر لێپرسراوی بازیان، شێخ كەمال لێپرسراوی قەرەداغ، ئیبراهیم حاجی عەزیز لێپرسراوی ماوەت، حسێن مەلا عەلی لێپرسراوی راپەڕین و بەكرەجۆ بوون. كاتێك هەردوو ناوەندەكە بووەوە بە یەك ناوەند، چووینەوە ناوەندی سلێمانی و لێپرسراوەكەی حەمەی مام عەلی بوو. لەوكاتەدا بڕیاری خانەنشینكردنی كادرە حیزبییەكان درا لە بەرواری ٢ / ٦ / ٢٠١٢ منیش بە پلەی عەمید خانەنشین كرام، بەڵام بەخۆبەخشانە لە كاری كۆمەڵایەتی بەردەوام بووم، دوای خانەنشینكردنم بە ساڵێك گواسترامەوە بۆ مەكتەبی كۆمەڵایەتی بە پلەی ئەندامی ئەنجوومەنی مەكتەب لە بەشی پەیوەندییەكان تا ئێستا بەردەوامم، لە بەشی پەیوەندییەكان شێخ عێزەدین لێپرسراوێتی و شەش ئەندامی هەیە لە بریتین لە من و عوسمان فەتاح و قادر كوێخا تۆفیق و نەجم مۆریاسی و ئەسعەد گەلاڵی و شێخ مەجید سیرێنی.

لەدوای ٣١ی ئاب بە بڕیاری مەڵبەندی سلێمانی چووم بۆ جووتیاران وەك لێپرسراوی قەزاكانی سلێمانی، كە چووم جەلالی عەلی ئاغا لێپرسراوی لقی سلێمانی بوو، خوالێخۆش بوو قادر قەرەچوغی لێپرسراوی كوردستان بوو لەگەڵی نێوانم خۆش بوو، خەسرەو شاڵی كارگێری لقی سلێمانی بوو، كاك قادر پێووتم: تۆ لە قەزاكان لیژنە دروست بكە بۆ كاروباری جووتیاران، منیش هەڵسام بە دروستكردنی لیژنەكان بۆ لیستی سەوزی یەكێتی نیشتمانی، چونكە جووتیاران وەكو بەرەی كوردستانی كاریاندەكرد، یەكەم لیژنەم لە قەزای شارباژێر دروستكرد كە ئەحمەدی فەقێ رەشیدی قەشانم كرد بە لێپرسراوی لیژنەكە خوا لێی خۆش بێت، دواتر لە قەزای دوكان لیژنەمان دروستكرد

خەلیل گەبەییمان کرد بە لێپرسراوی، لە قەرەداغ لیژنەمـان دروسـتـکـرد شێخ کەمال شێخ حامیدمان کرد بە لێپرسراوی، لە بازیانیش لـیـژنـەمـان دروستکرد ئازادی حاجی کەریم ئەڵڵاییمـان کـرد بـە لـێـپـرسـراوی، لـە بەرزنجەش لیژنەمان دروستکرد و خەلـیـل هـۆنـەرێـنـەیـیـمـان کـرد بـە لێپرسراوی، لە عەربەتیش لیژنەمان دروسـتـکـرد خـۆم سـەرپـەرشـتـیـم دەکردن، ئەم لیژنانە مانگانە کۆبوونەمان پێدەکردن و کێشەکانـیـان بـە راپۆرت بەرزدەکرایەوە بۆ لقی سلێمانی. کاك جەلال عەلی ئـاغـا و قـادر قەرەچوغی زۆر لە کارەکانمان رازی بوون، تا وایلێهات لەگەڵ کاك جەلال بەشداری سەرکردایەتی جووتیارانم دەکرد تا ئەو کاتەی بڕیـار هـات کـە نابێت کادێری پێشکەوتوو دوو کاری حیزبی بکات، منیش لەبەرئەوەی لە کۆمەڵایەتی کارگێری ناوەندی سلێمانی بووم، وازم لە کاری جـووتـیـاران هێنا و تەنها کاری کۆمەڵایەتیم ئەنجام دەدا.

لە ساڵی ۱۹۹۷ رۆژێك چووم بۆ پیرەمەگرون بۆ لای سلێمانی مـام حسەین، لەسەر بەدالەیەك کاریدەکرد کە کـاك یـاسـین دایـنـابـوو وەك موبایل کاریدەکرد پێیاندەووت: سیناو. کە دەوروبەری پیرەمەگرونی پێ وەردەگیرا، بە ئاسانی تەلەفۆنی پێوەردەگیرا کە سوودی خـۆی هـەبـوو لەوکاتەدا، لەوێ حەسەنی مام حەمەڕەشیدی ئامۆزام بینی گلەیی دەکرد لێم و وتی: تۆ کارت بۆ هەموو خزمان کردووە بۆ من نەبێت! وتم: چـیـت دەوێت بۆت بکەم؟ وتی: کوڕەکانم بۆ دابمەزرێنە. منیش وتم: بەسەرچـاو ئەگەر شوێن هەبوو وەڵامتدەدەمەوە، یەکەمجار شـێـرزادی کـوڕیـم بـۆ دامەزراند و کردم بە پێشمەرگە لە ناوەندی کـۆمـەڵایـەتـی و چـاوی لـە پشکنین دەرنەچوو، لەبەر کاری یاسایی ناردم چاویان بۆ نەشـتـەرگـەری کرد، دوای ماوەیەك فەرهادی کوڕیمان کرد بە پێشمەرگە هەر لە ناوەندی

کۆمەڵایەتی، دواتر کاك حەسەن گلەیی نەما. لەبەر دڵسۆزی کاك شێرزادی کوڕی شێخ باباتایەر ئۆتۆمبێلی بۆ کڕیوە و بووە بە خاوەنی باخ لە سیتەك.

لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە خەڵکی گوندی قەرەچەتانم کۆکردەوە لەسەر کارێزەوشکی قەرەچەتان بۆ هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی ریشسپییانی گوندەکە، چونکە باوی کوێخایەتی نەمابوو، پاش هەڵبژاردن ئەم ناوانە هەڵبژێران بە ئەنجوومەنی ریشسپییانی قەرەچەتان: من یەکەم دەنگم هێنا کە زیاتر ٪٩٠ بوو، مەلا کەریم و یاسینی حاجی حەسەن و گورون عەزیز خوالێیان خۆش بێت و مامۆستا صالح حسەین کە بریتی بووین لە ئەو ٥ کەسە، کاری ئەم ئەنجوومەنە بۆ ئاوەدانکردنەوەی گوندی قەرەچەتان بوو بۆ دروستکردنی مزگەوت و خوێندنگە و نەخۆشخانە و رێگاوبان و پڕۆژەی ئاووکارەبا و خزمەتگوزارییەکانی تر، لە خوار ئێمەوە کۆمەڵێك ریشسپیمان دانا لە هەر بنەماڵێك ریشسپییەکمان دانا بۆ تەبایی و خزمایەتی کە هەر مانگە و لە ماڵی یەکێکیان کۆبوونەوەمان دەکرد، لە بنەماڵەی جومعە، عەبدوڵڵای مام حەسەنمان دیاریکرد دوای مردنی لیوا سالار ئەحمەدمان لە شوێنی دانا، لە بنەماڵەی ئەحمەدی سمایل، محەمەدی مەلا صالحمان دیاریکرد، لە بنەماڵەی حەمە ئاغای کۆچان بە دەست، حاجی محەمەدی قادرمان دیاریکرد، لە بنەماڵەی کوێخا پیرۆت، یاسین محەمەدمان دیاریکرد، لە بنەماڵەی لاوە، کەریم حەمە عەلیمان دیاریکرد.لە بنەماڵەی هیمەت، ئەیووب نەجمان دیاریکرد، لە بنەماڵەی عەزۆلی، وەتمان تەیب محەمەدمان دیاریکرد. ئەم ناوانە کۆدەبوونەوە ئەگەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی روویبدایە لەگەڵ گوندەکانی تر یان خێڵەکانی ناوچەکە

هەڵدەساین بە چارەسەرکردنی. بەهۆی دروستکردنی ئەم لیژنانەوە پێشتر قەرەچەتان تەبایی وای بە خۆیەوە نەدیبوو، هیوادارم نەوەکانی دوای منیش ئەمکارە بکەن بۆ ئەوەی هەر کێشەیەك روویدا زوو چارەسەری بۆ بدۆزرێتەوە و تەشەنە نەکات و ببێتەهۆی لێکترازان و دووبەرەکی.

لە ساڵی ٢٠٠٥ لە کۆتا کۆبوونەوەی هەردوو لیژنەی سوورداش و پیرەمەگرون، مەکتەبی کۆمەڵایەتی بڕیاریدا کە ئەم دوو لیژنەیە بکرێت بە ناوەند و ناویان نا ناوەندی دوکان هاوشانی مەڵبەندی ٢٥ ی دوکان، دەبووایە من بکرێم بە لێپرسراوی ناوەندەکە، بەڵام مەکتەب بڕیاریدا مەلا حسێنی شارستێن بکرێت بە لێپرسراوی ناوەندەکە و کارەکانی باش بەڕێ نەدەکرا، ناچار هەردوو ناوەندی سلێمانی کە بوو بەیەك ئەم ناوەندە هەڵوەشایەوە و کرا بە لیژنەی پیرەمەگرون و سابیر کۆکەیی کرا بە لێپرسراوی.

لە ساڵی ٢٠٠٤ لەگەڵ برادەرانی ناوەند سەردانی ناوچەی خۆشناوەتیمان کرد، ئەو برادەرانەی لەم سەردانەدا بەشداربوون بریتی بوون لە شێخ عزەدین و شێخ مەحمود باراوی و ئەنوەر قەرەوەیسی و عەلی حاجی مەحمود و ئاواتی حاجی مەحمود خوا لێی خۆش بێت و کاك ئەنوەر خوالێیخۆش بێت، ئەم سەردانە زۆر هاوکاری کرا لە لایەن صباح حاجی تایەر کە نەقیبی ئاسایش بوو لە رانیە، سەرەتا چووینە بێتواتە بۆ سەردانی ماڵی محەمەد ئاغا و دواتر لەگەڵ مەلا جەلال چووینە زێوە لە مێرگەسەر لە ماڵی کەمال ئاغا ماینەوە، دواتر چووینە قەندیل، ئەم سەردانە یادی ئەو ساڵانەم دەهاتەوە یاد کە بە ماڵەوە لە سوورەدێ بووم پێش چوونم بۆ ئێران لە ساڵی ١٩٨٨، کە چێژێکی تایبەتی

پێدەپەخشیم، یان بینینی چەند دیمەنێك کە پێشتر نەمدیبوو، بە گشتی بە خۆشترین سەردانی دەزانم کە دڵم زۆر پێیخۆش بوو، لەم سەردانەدا سەردانی گۆرستانی شەهیدانی شێخ وەسانان کرا و سەردانی گۆڕستانی بنەماڵەی کەمال ئاغا و صباحی حاجی تەها و مەلا جەلال کرا لە نێوان مەرگە و زێوە، لە زێوە چووینە سەرچاوەکە کە بە پێ هەورازێکمان بڕی، لەگەڵ ئەوەشدا ماندوو بووین، بەڵام دیمەنەکانی دڵمانی کردەوە بە تایبەتی ئەو هەموو باغە کە بینیمان لە سەری هەرتەل، کە شوێنێکی داخراو وەکو زێوێی ناوچەی خۆمان بە شاخ دەورەدرابوو، لەوێ زانیم کە دروستکردنی رووبە هەنار لە کاتی هەڵچووندا بە گەڵا هەنجیر هەڵچوونەکەی نامێنێت. زۆر هەوڵمدا سی دی ئەو سەردانەم دەست بکەوێت، بەڵام بە داخەوە دەستمنەکەوت.

لە ساڵی ٢٠٠٤ شێخ بەکر کە لێپرسراوی لیژنەی بازیان بوو کۆچی دوایی کرد خوالێیخۆش بێت، بە چاکمزانی کە عومەر حاجی سەعید وێڵەیەری کە ئەندام ناوەند بوو شوێنی شێخ بەکر بکرێتەوە، برادەرانی ناوەند هەموویان پێیانباش بوو، پاش کۆبوونەوەی ئەم لیژنەیە پێمڕاگەیاندن کە کاك عومەر لە شوێنی شێخ بەکر دەستنیشانکراوە و پێویستە هەموو لایەك هاوکاری بێت بۆ سەرکەوتنی لە کارەکەیدا، هەرچەندە چەند کەسێك دانانی کاك عومەریان بە دڵ نەبوو، بەڵام لە کاتی کارکردنیدا هەموویان پەشیمانبوونەوە، چونکە کاك عومەر پیاوێکی کۆمەڵایەتی و کارا بوو لە کاروباری کۆمەڵایەتیدا، دوای دەستبەکاربوونی کاك عومەر کۆمەڵایەتی لە سنووری بازیان گەشەی زیاتری کرد.

لە ساڵی ٢٠٠٤ لە ناوەندی سلێمانی بڕیار دەرچوو کە بە پلەی ئەندام مەکتەب مووچە وەربگرم لەگەڵ شێخ مەحمود باراوی، بەڵام هەر

ئەو رۆژە بڕیارەکە راگیرا و بڕیاریاندا ئەو مووچەیەمان لێوەربگرنەوە، ئەحمەد رەزا کە ئیدارەی ناوەند بوو هاتە لامان وتی: لە مەکتەبەوە تەلەفۆن کراوە کە دەبێت ئەو پارەیەتان لێوەربگرمەوە، ئێمەش پارەکەمان دایەوە. دواتر مووچەی بەڕێوەبەری تەنفیزیمان بۆ هات، ماوەیەك بەوشێوەیە مووچەم وەرگرت، منیش ویستم لە رێگەی رێکخستنەوە بە دوای کێشەکەدا بچم، چوومە لای مەولود تەلانی و ئەویش پێی باش بوو و وتی: داوایەك بنووسە لە ناوەندەوە بۆ مەکتەب، هاتم داوایەکم بەرزکردەوە کە شێخ خەبات زۆر یارمەتی دام و لە مەکتەبیش مەولود تەلانی پشتگیری کردم و بردم بۆ مەکتەبی سیاسی، کە چووم شێخ عومەری سەید عەلی لەوێ بوو نەیانهێشت بچمە لای وتیان: نووسراوەکە دانێ منیش نووسراوەکەم دانەنا و وتم: پێویستە خۆی ببینم، هەرچەند زۆریانکرد نووسراوەکە دانێم، بەڵام من دامنەنا، پاشان گەڕامەوە بۆ ناوەند شێخ خەبات وتی: چوویت بۆ مەکتەبی سیاسی؟ وتم: بەڵێ، بەڵام نەیانهێشت بچمە لای شێخ عومەر منیش نووسراوم دانەنا، شێخ خەبات تەلەفۆنی کرد بۆ شێخ عومەر پێیوت: کاك حەمەکەریم قەرەچەتانی هاتووە بۆ لات، بەڵام لە پرسگە نەیانهێشتووە چاوی بێت بکەوێت، ئەویش زۆر باش وەڵامی دایەوە و وتی: با بەیانی بێت خۆم بە پرسگە دەڵێم کە بێت بۆ لام، بۆ بەیانی کە چووم لە پرسگە بردیانم بۆ لای شێخ عومەر و کێشەکەی خۆمم تێگەیاند و وتی: من بڕیارت بۆ دەردەکەم، بەڵام دەبێت دوو مەکتەبی سیاسی تر رازی بن بۆ ئەوەی بتکەن بە ئەندام مەکتەب. کاك شێخ عومەر زۆر یارمەتی دام و نووسراوی بۆ کردم بۆ مەکتەبی ئیدارە، بەڵام وەڵامی ئەو نووسراوە نەدرایەوە، نزیکەی شەش مانگی پێچوو، زۆر سوپاسی کاك عەبدوڵڵا

هەمزە دەکەم کە هات لەگەڵم بۆ لای کاك سالار کە لێپرسراوی مەکتەبی ئیدارە بوو، تا ڕۆژێك کوێستانی کچم لەگەڵ کچەکەی قادر کۆکۆیی خوالێیخۆش بێت بە ناوی سنوورخان کە هەردووکیان ئەندام مەڵبەند بوون چووبوون بۆ دۆزینەوەی نووسراوەکە بۆ مەکتەبی ئیدارە، هەرچەندە کاك سالار ویستبووی ساردیان بکاتەوە وتبوی: من خۆم بە کاك کەمالی ئیمزا دەکەم، بەڵام هەردووکیان ڕازی نەبووبوون خۆیان چووبوون بۆ لای کەمال فوئاد خوالێیخۆش بێت، پێیانووتبوو: چۆن دەبێت نووسراوی حەمەکەریم قەرەچەتانی دوای شەش مانگ وەڵامی نییە؟! کاك کەمال زۆری ڕێزی گرتبوون، بڕیاریدابوو کە بە تەواوکاری مووچەی ئەندام مەکتەب خەرج بکەن، تا ئەو کاتەی کە خانەنشینکرام ئەو مووچە تەواوکارییەم وەردەگرت، لە کاتی خانەنشینیدا مافی خۆمیان نەدامێ کە زیاتر لە چل ساڵ لە خەباتی پێشمەرگایەتی و حیزبیدا بووم، بە مووچەی عەمید خانەنشین کرام، هەبوو دوای ڕاپەڕین هاتبووە ناو یەکێتی بە پلەی لیوا خانەنشینکرا!؟ نازانم کەی دەبێت ئەو تێکۆشەرانە مافی خۆیان وەربگرن، هیوادارم مافی ئەو کەسانە کە خوراوە بۆیان بگێڕنەوە و هیچیتر مافی تێکۆشەران زەوت نەکرێت.

لە ساڵی ٢٠٠٥ بارەگای ناوەند گوێزرایەوە بۆ گەڕەکی زەرگەتە، چەند خوشکێك لەم ناوەندە زۆر چالاکانە کاری مووچە و ئەرشیفیان دەکرد، وەکو شنە کەمال و نەمام عەلی و شاگوڵ و بێریڤان و ژاڵە سەردار و شنە باڵخێی لە ئەرشیفی مەکتەب بوو، هەروەها شەهلا ئەندام ناوەند بوو زۆر ژنێکی قسەخۆش بوو، چەند خوشکێکی تر دەرچووی زانکۆ بوون و شارەزای کاری خۆیان بوون وەکو مهاباد کەریم و سەیران مستەفا بەرگوردی، ئەم خوشکانە هاوشانی براکانیان کاری خۆیان

کردووە لە ناوەندی دەوروبەر، من زۆر لە کارەکانیان رازیبووم. ناکرێت دەوری ژن باس نەکرێت لە رێکخستن و کۆمەڵایەتی، ئەم بەڕێزانە تا چوونە دام ودەزگاکانی دەوڵەت هەموو رۆژێك دەوامی خۆیان دەکرد بەڕێکوپێکی، ئەگەر ئیشیان هەبووایە داوای پشوویان دەکرد.

برادەرێکمان هەبوو پیاوێکی قسەخۆش بوو، بەڵام دەنگێکی بەرزی هەبوو لە قسەکردندا ناوی شێخ تەیب بوو، شێخ جەمالمان لابوو سەرەتا چایچی بوو، بەڵام لەم دواییەدا من و مەنسووری مەحمودخان تەسکییەمان کرد کە خانەنشین بکرێت.

لیژنەی پیرەمەگرون و سووورداش زۆر چالاك بوون لە چارەسەرکرنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان کە بە ڕاپۆرتی مانگانە بەرزدەکرایەوە بۆ ناوەند، پیاندەووتین ئێوە لە چاو لیژنەکانی تردا کێشەی زیاترتان چارەسەر کردووە لە بری دەست خۆشی دەیانووت: ناوچەکەی ئێوە کێشەی زۆرە ! زۆری ئەم کێشانە بە هەوڵی چەند کەسایەتییەکی ناوچەکە چارەسەرکراوە، وەکو سەلیمی حاجی ئەحمەد هەڵەدنی و ماڵی کوێخا سمایلی تەلان بە تایبەتی کوڕەکانی کاك ئەحمەد و کاك مەحمود و خوالێخۆش بوو کاك شەوقی لە سنووری دۆڵی جافایەتی، محەمەد حەمە عەلی رۆستەم و بەختیار عومەر حەمە عەلی و کوێخا جەمال و دارای حاجی برایم لە گوندی چەرمەگا و کوڕانی رەشید قادر گۆمەیی و ماڵی هەمزە ئاغا و شێخانی عەوەڵان بەتایبەتی شێخ صلاح و کەریم بەگی موخاخ و مەحمود خانی میشاو لە دەشتی شلێر و مولازم صدیق حاجی شەریف قەرەوەیسی و شوانەی حاجی شەریف و جەمالی حاجی شێخ رەئوفی سووسێ و شێخانی شیلەخان بەتایبەتی جەعفەر شێخ محەمەد و شێخ مەحمود لە گوندی شەدەڵە و شێخ هاوڕێ

و شێخ عومەر لە گوندی كلكەسماق و مەلا رەسووڵی شارستێن و مەلا سەید و رەفیقی مام رەئوف قەرەچەتانی و خەسرەوی نوری حاجی گورون قەرەچەتانی و محەمەدی حاجی مەحمودی پنەڵە و مستەفا بەردەكەڕی و مەلا مستەفای شوانكارە و هیوای تیلەكۆ و خوالێ خۆش بوو كەریم ئاغای هەمەوەند و كوڕەكانی و خوا لێخۆش بوو كوێخا نەریمانی كەڵەشێرە و عەبدوڵڵای مەلا صالح و كوڕەكانی و مام ڕۆستەمی قولەرەیسی و خوالێ خۆش بوو حاجی سابیری یەڵانقۆز و شێخ دلێری شێخ مستەفا و چەند بەڕێزێكی تر كە ناویام لە یاد نەماوە، هەمیشە هاوكاری ناوەند و مەكتەب بوون بۆ چارەسەری كێشەكان، من زۆر لێیان رازیبووم كە هەموو كاتێك یاوەری من بوون بۆ چارەسەركردنی ئەو كێشانەی كە هەبوون. زۆربەی كێشەی خێزانی بوون كە هەندێكیان كێشەی كۆن بوون و چەند ساڵێك مابوونەوە كە هەندێكیان لە شۆڕشی ئەیلولەوە مابووەوە وەكو گەورە بە بچووك و ژن بە ژن و سێ بە گایی كە هەندێكیان ئەوەندە ئاڵۆز بوون زۆر سەرقاڵی كردبووین تا چارەسەركراون، هیوادارم دانەبڕێن لە چارەسەری ئەو كێشانەی ماون یان روودەدەن، هیوادارم ئەم ناوچەیە باڵی ئاشتی سەردا بێت و دوور بێت لە كێشە. لەو كێشە ئاڵۆزانەی كە زۆر ماندووی كردبووین و هەندێكیان زۆر كۆن ببوو، حەز دەكەم بەشێك لەو كێشانە بخەمەڕوو كە ببێت بە ئاماژەیەك بۆ چارەسەركردنی كێشەكانی تر:

لە ساڵی ١٩٩٣ لە بارەگای بەتالیۆنی پێشمەرگە برادەرێكی جاسەنە برادەرێكی سەرمۆردی كوشت كاتێك ئەم برادەرە نەخۆشی خەمۆكی هەبوو، ئەم كێشەیە زۆر سەرقاڵی كردبووین، ماڵی كوژراوەكە داوای بكوژەكەیان دەكرد پێش رێككەوتن، ئێمە وامانزانی كە هیچی

لێناکەن کە زۆر نیگەرانی کردین و کەوتینە هەڵەوە، داوای بکوژەکەمان کرد ناردمان بۆ ماڵی کوژراوەکە، سەرمۆردییەکان ئەم هەلەیان قۆزتەوە و بکوژەکەیان دوورخستەوە و کوشتیانەوە؟! دەبووایە لەبەر ئەوەی کە کۆمەڵایەتی کەوتبووە نێوانیان بەوجۆرە تۆڵەی کوژراوەکەی خۆیان نەکردایەتەوە، تا ئێستا و لە رابردووش شتی وا رووینەداوە لە ژێر چەتری رێککەوتن تۆڵە بکرێتەوە، یان داوای رێککەوتن نەدەکرا و خۆیان هەوڵی تۆڵەی خۆیان دەدا یان لە پێناوی رێککەوتندا لێخۆش بوون دەکرا بە هەوێنی چارەسەری کێشەکان، دوای کوژرانی بکوژەکە هەردوولا رێککەوتن.

لە ساڵی ١٩٩٩ کێشەی نێوان هۆزی بێسەری و گوندی مۆریاس سەریهەڵدا کە بوو بەهۆی کوژرانی چوار کەس لە هەردوولا، دوو کوژراو لە هەر لایەك، ئەم کێشەیە زۆر سەرقاڵی کردبووم، دوو ساڵی پێچوو تا چارەسەر بوو، ئەم کێشەیە بە هۆی ئاژەڵداری و باخدارییەوە دروست ببوو، ئەوەی جێگای نیگەرانییە هاوڵاتییەکی مۆریاس بۆ ترێ فرۆشتن چووبووە دەرەوەی گوندەکە کوژرابوو.

لە گوندی وێڵەیەر کێشەیەکی گەورە هەبوو لەسەر مەرێك بوو کە دیار نابێت وادەزانن دزراوە و خرابووە ملی کەسێك، دواتر مەڕەکە دەدۆزنەوە کە دەستی یەکێکی تری تێدا دەبێت، کە لەگەڵ برادەرێکی ئێرانی کاسپی دەکات لە ئەنجامدا دەیکوژێت، کە دێتەوە گوندەکە کەشف دەبێت و کێشەکە سەرهەڵدەداتەوە، شەڕی کۆنە قین سەرهەڵدەدات دەبێتەهۆی کوشتنی چوار کەس، ئەم کێشەیەش سەرقاڵی کردبووین و کاك عومەری حاجی سەعید زۆر پێوەی ماندوو ببوو تا چارەسەرکرا.

کێشەی گوندی قەرەچەتان و دەروێشەکانی تەکیەی شێخ محەمەد کەسنەزانی، ئەم کێشەیە لەسەر ئەو خانووە بوو کە ئێستا تەکییەی شێخە، ئەم کێشەیە ساڵی ١٩٩٨ روویدا کە بوو بەهۆی قاچ شکاندنی نەجمەدین ئەحمەد. پاش سەردانیکردنی شێخ نەهرۆ و دکتۆر قەلەندەر و محەمەد مامە عەبدوڵڵا و محەمەد سلێمان بۆ لام، چووین سەردانی نەجمەدینمان کرد، کاك نەجمەدین زۆر بە هەڵوێست بوو لەبەر چوونی ئێمە وەك کۆمەڵایەتی و پاش چوونمان بۆ قەرەچەتان لەگەڵ شێخ مەلاس و خەلیفە قادر لێیانخۆش بوو و کێشەکە کۆتایی هات.

کێشەی گوندی قەرەچەتان و قەرەوەیسییەکان، ئەم کێشەیە بەڕێز مەحمود سەنگاویش زەحمەتی تێدا کێشا، بوو بەهۆی کوژرانی دوو کەس لە هەردوولا، بەداخەوە یەکێکیان حسەین سۆیلەی ئامۆزامە، چونکە زۆر پاڵپشتم بوو لە کاتی پێشمەرگایەتیدا.

کێشەی گوندی هۆمراغ هەبوو لە نێوانماڵی ئەحمەد حمە حەلێ و حمە رەسولێ کە بووبەهۆی کوشتنی چەند کەسێك، بە هەوڵی بەڕێز شۆڕش ئیسماعیل و برادەرانی کۆمەڵایەتی چارەسەرکرا.

کێشەیەك لە ناوچەی هەڵەبجە هەبوو کە بەڕێز حامید حاجی خالید مەبەستی بوو زوو چارەسەر بکرێت، چونکە لایەنێکیان خزمی خۆی بوون، لەگەڵ حەسەنی حاجی مەحمود نەوڕۆڵی و قانع مۆریاسی و رێبوار گەڕەدێیی و سەلیم هەڵەدنی چووین بۆ سەردانی ماڵێکیان کابرا تەلاقی خواردبوو کە رێکنەکەوێت! کاك حەسەن وتی: ئەوە مەلای دوانزە عیلمە لەگەڵمان، دەستی بۆ من راکێشا، منیش دامام نەمزانی چیبکەم وتم: برا با بچینە ژوورەکەی ئەودیو. کە چووم دەستنوێژم گرت و لێم پرسی کاکە تۆ چەند جار تەلاقت خواردووە وتی: یەك جار. وتم:

تەلاق سیانە تۆ دوو تەلاقت ماوە لەبەر ئەوە تەلاقت ناکەوێت، پاشان چووین بۆ مزگەوتێکی هەڵەبجەی شەهید هەر دوولا رێککەوتن.

کێشەی نێوان ماڵی مام وەهاب و ئەنوەر ئازاد کە خزمی یەك بوون، کاك خەبات زۆر هەوڵیدا بۆ چارەسەرکردنی، حەسەنی کوڕی مام وەهاب برازای ئەنوەری کوشتبوو، حەسەنی مام وەهاب هات بۆ لامان وتی: وەرن دەست و قاچم ببەستن و بمبەن بۆ ماڵی ئەنوەر با من بکوژێت و ئەم کێشەیە کۆتایی پێ بێت! کێشەکە کۆتایی هات بە هەوڵی بەڕێزان ئەنوەر دۆلانی و خەباتی شێخ جەناب و چەند بەڕێزێکی تر.

کێشەی گوندی تەڕەمار لە نێوان ماڵی حاجی حەمەتاڵ میراڵەیی و ماڵی لوقمان و بورهان تەرەماڕی کە ببوو بەهۆی کوشتنی برازای لوقمان تەرەماری لە لایەن کوڕی حاجی حەمەتاڵەوە، پاش هەوڵێکی زۆر لە لایەن کوێخا جەمال و برادەرانی کۆمەڵایەتی هەردوولا رێککەوتن.

کێشەی گوندی شیلەخان لە نێوان ماڵی حاجی حەمەخان و ماڵی رەئوف و کەریم، کە ببوەهۆی کوشتنی کوڕێکی حاجی حەمەخان لە بری تاوانبارێك لە لایەن ماڵی رەئوف شیلەخانییەوە، ئەم کێشەیە زۆر ئاڵۆز بوو چارەسەرکرا بە هەوڵی کاك سابیر کۆکەیی لە مزگەوتی پیرەمەگرون.

کێشەی هۆزی گۆمەیی لە نێوان ماڵی خوالێخۆش بوو حاجی وەلی و ماڵی خوالێخۆش بوو ئەحمەد زەرد کە ببوەهۆی کوشتنی کوڕی ئەحمەد زەرد لە لایەن ماڵی حاجی وەلییەوە، کێشەکە بە هەوڵی عوسمانی حاجی حەسەن و برادەرانی کۆمەڵایەتی چارەسەرکرا.

کێشەی گوندی چەرمەگا لە نێوان ماڵی خوالێخۆش بوو عومەری حەمە عەلی و ماڵی کوێخا جەمال، ئەم کێشەیە لەسەر شایی روویدا، لە دوکان تەقەیان لە یەك کردبوو، بوو بەهۆی بریندار بوونی حەمەی

ئەحمەدی فارس، كێشەكی ئاڵۆزی لێكەوتەوە كە خوالێخۆش بوو شەوكەتی حاجی موشیر و بەڕێزان شالاوی عەلی عەسكەری و شێخ عومەری حەفید بە هاوكاری برادەرانی كۆمەڵایەتی چارەسەریان كرد.

كێشەی گوندی قەرەچەتان لە نێوان بنەماڵەی هۆمەر ئاغا و بنەماڵەی ئەحمەدی ئیسماعیل كە ٥٠ ساڵ بوو چارەسەر نەكرا بوو، ئەم كێشەیە بە ساردی مابووەوە، بە هەوڵی زۆری خزمانی قەرەچەتان خۆیان بە تایبەتی رەفیقی مام رەئوف لە مزگەوتی قەرەچەتان كۆتایی پێهات.

كێشەی هۆزی سمایل عوزێری كە حاجی عەلی و مەلا غەفوور لەگەڵ هۆزی دێكۆنییەكان كە بە بنەڕەت ئێرانی بوون كە كاك ئەحمەد گیاخۆر بوو، ئەم كێشەیە كێشەیەكی كۆمەڵایەتی بوو، نزیكەی ٢٣ كەسیان لەیەك كوشتبوو، مەلا غەفووری باوكی نەوشیروان كە دوو كوڕی كوژرا بوو لەگەڵ چوار برازای، هاتە لام بۆ كۆمەڵایەتی پێمووتم: حەمەكەریم قەرەچەتانی ئەم قایش و قڕوشەم لێكەرەوە و ئەو كێشەیەم بۆ چارەسەر بكە! منیش توانای خۆم خستەگەڕ دووجار برادەرانی كۆمەڵایەتیم نارد بۆ هەولێر بۆ لای دارای حاجی براهیم و موبارەكی كوڕی حاجی عەلی بۆ رازیكردنیان بە رێككەوتن، كە بریتی بوون لە عوسمانی حاجی حەسەن و چەند خزمێكی خۆی، من و خوالێخۆش بوو كاك ئەنوەر چووین بۆ هەڵەبجەی شەهید بۆ لای ماڵی ئەحمەد گیاخۆر كە زۆریان ماڵیان لەوێ بوو، لە ئەنجامدا ئەم كێشەیە لە مزگەوتی تاسلوجە كۆتایی هات، كە بردمانن بۆ ماڵی یەكتر، جارێك لە ماڵی مەلا غەفوور بووین گەنجێك وتی: مەلا غەفوور بیرتە ئێوارەیەك لە جووت دەهاتیتەوە ئێمە سەیارەیەكمان پەكخستبوو كە تۆ بكوژین، بەڵام كاتێك هاتیت ئێمەت نەدەناسی وتت: وەرن بۆ ماڵی ئێمە نان بخۆن دوایی

سەیارەکەتان بە تەراکتۆر بۆ رادەکێشم بۆ تاسلوجە خزمێکم فیتەرە بۆتان چاکدەکاتەوە! ئێمەش چوار کەس بووین لەناو خۆماندا وتمان: ئەم پیاوە بکوژین خوا نامانپارێزێت، چونکە هاتووە پێشوازیمان لێدەکات و نامانناسێت، ئەمەش بۆیە دەنووسم کە خەڵك بیر لە کارەساتی ناخۆشنەکاتەوە بۆ دوژمنایەتی، چونکە نەدیو و نەناس پێوەدەبن.

بەشێك لە کێشەکان کێشەی سنووری گوندەکان بوو، کە ببوون بەهۆی لێکترازانی گوندەکان لە رووی کۆمەڵایەتییەوە بۆ نموونە:

– کێشەی گوندی قەرەچەتان و گوندی گردەبۆر کە گردەبۆرییەکان دەیانووت: سنووری ئێمە دەچێتە خڕی زێویێ، بەڵام بە تاپۆ سنووری قەرەچەتان دەچووەسەر ماڵەکانی گردەبۆر، پاش هەوڵێکی زۆری کۆمەڵایەتی و ریشسپییانی قەرەچەتان رێککەوتن کە ئەم سنوورەی گوندی گردەبۆر دەیانویست ئاژەڵی تێدا بلەوەڕێنن بەرامبەر ٥٠٠٠ دیناری سویسری بۆ مزگەوتەکەی قەرەچەتان خەرج بکرێت. لەم دواییەدا گوندی قەرەچەتان رازی بوون بە بێ بەرامبەر سنووری قەرەچەتان بەکاربهێنن بۆ ئاژەڵەکانیان.

– کێشەی گوندی سێونگ و گوندی کانی شوان کە زۆر هەوڵی تێدادرا سەرئەنجام کۆتایی هات کە شێخ عزەدین زۆر پێوەی ماندوو بوو لەگەڵ کەمال مەلا عەلی و رەحیم موبرەیی.

– کێشەی گوندی پریسك و گوندی سێونگ لە سنووری سیوەیل دوای ٣١ی ئاب دروست ببوو، لە کاتێکدا چەندینجار هەوڵی چارەسەری دراوە لە لایەن قائیمقام و مامۆستای ئایینی و کەسایەتییەکانی ناوچەکە بێ کۆمەڵایەتی، پاش بەشداریکردنی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردنی، من و

شێخ عزەدین و کوێخا عەبدوڵڵای کەنکێ و کوێخا قادری کانی شوان و چەند مامۆستایەکی ئایینی چووین بۆ گوندی پریسك بۆ چارەسەرکردنی بەڵام کاکە حەمە رازی نەبوو، ئێمە هەڵسایین بڕۆین وتمان نان ناخۆین، خێزانی کاکە حەمە وتی: نابێت بڕۆن ئەوەی ئاشتی نەوێت لەم گوندە دەری دەکەم. دوای نانخواردن هەردوو گوندەکە ئاشتبوونەوە و لیژنەیەکمان دروستکرد بۆ دانانی سنووری هەردوو گوندەکە، ئەو سنوورەی دانرا تا ئێستا بەردەوامە و کێشەکە کۆتایی هات.

– کێشەی گوندی گەڕەدێ و گوندی وڵاغلو کە کێشەی سنووری گوند بوو، کاتی خۆی ئاغاکانی گاپیلۆێن دەستی بالایان هەبووە، سنووری گوندی گەڕدێیان نەهێشتووە، بە یاسا کە تا نزیك ماڵەکانی گەڕەدێ زەوی وڵاغلو بوو، ئەم کێشەیە چارەسەرکرا بە هەوڵی برادەرانی ناوەند و چەند کەسایەتییەکی ناوچەکە.

– کێشەی گوندی گۆمەزەڵ و گوندی گەورەدێ لەسەر کانییەك دروست ببوو کە بە کانی تازە ناودەبرێت، پاش چوونی کۆمەڵایەتی بۆ چارەسەرکردنی، کانییەکە بۆ گوندی گەورەدێ گەڕایەوە، چونکە لە سنووری گوندەکەی ئەواندا بوو.

– کێشەی گوندی مالومە و گوندی گوێزیلە کە گوندێکی تازە بوو سنووری گوندی مالوومە دەچووەسەر ماڵەکانی گوندی گوێزیلە، پاش بەشداری کۆمەڵایەتی و کوێخا کەریمی ماوەت و کوێخا سمایلی تەلان خوالێیان خۆش بێت لەگەڵ بەشی کشتوکاڵی دوکان و ماوەت چارەسەر بوو، چونکە سنوورەکە هی هەردوو ناحیەی ماوەت و سورداش بوو، وامان بە چاکزانی کە شەخسەکانی کۆتەڵ بکرێت بە سنووری هەردوو گوندەکە و کێشەکە کۆتایی هات، لە کاتی گەڕانەوەمان بۆ گوندی مالومە

بۆ نانخواردنی نیوەڕۆ، کوێخا رەشید خوا لێی خۆش بێت روویکردە دانیشتوانی گوندی مالومە و وتی: ئەوە ناوەندی کۆمەڵایەتی و کوێخا سمایل و کوێخا کەریم هاتوون و کێشەکە کۆتایی هاتووە کەس بۆی نییە شەکر بخوات، مەلا بەکری جاسەنە وتی: مام کوێخا بۆ زوو قسەت نەکرد من کەمێکم خوارد بوو بە پێکەنین و کۆتایی هات.

– کێشەی گوندی باڵخ و گوندی قولەجاخ کە تەها بابانی پارێزەر زۆر پێوەی خەریك بووە و لە کاتی شۆڕشی ئەیلولدا حاکمی شۆڕش بووە، بە بەشداری کۆمەڵایەتی کۆتایی هات و سنوورەکە بۆ گوندی باڵخ دیاریکرا.

کێشەی گوندی سەرمۆرد و گوندی قەمچۆغە، کاتی خۆی رێککەوتبوون کە ئاژەڵەکانی گوندی سەرمۆرد بێنە سنووری گوندی قەمچۆغە و لە بەرامبەردا داری سووتان بۆ مزگەوتەکەی گوندی قەمچۆغە دابین بکەن، بەڵام گوندی سەرمۆرد دەیانوت: ئەو سنوورە هی خۆمانە، بەڵام بە یاسا سنووری گوندی قەمچۆغە بوو، پاش بەشداری کۆمەڵایەتی کۆتایی هات و رێککەوتنەوە، لە کۆتاییدا برادەرێکی کۆمەڵایەتی بە دانیشتوانی گوندی قەمچۆغەی وت: داروبەرد ئەوە دێنێت کێشەی لەسەر دروست بکەن! لە بەرامبەردا خوالێ خۆش بوو حاجی عەبدوڵڵای مەلا عارف وتی: ئەی کڵاوقاسم چی لێیە وا ئێوە ئەو هەموو کوڕە گەنجەی لەسەر بە کوشت دەدەن!؟

– هەروەها چەند کێشەیەکی کوشتن هەبوو بە هەوڵی ناوەند و مەکتەبی کۆمەڵایەتی چارەسەرکراون، بۆ نموونە کێشەی حسەین قەڵەباڵغ کە برای کوژراو بوو، کێشەی گوندی زێویێ و خزمانی ئابڵاخ، کێشەی مام بیلال قەرەچەتانی و حاجی رەشید کە خزمی یەك بوون، کێشەی گوندی تەپەڕەش لە نێوان عەبدوڵڵای حاجی نەسرەدین و خزمەکانی، و چەند کێشەیەکی تر.

– چەند کێشەیەکی ئاژاوە و ناخۆشی وەك کێشەی گوندی ١٢٠ لە نێوان عومەر حەمە سەعید و چەند کەسێك، کێشەی نێوان گوندی کلکەسماق و ماڵی حاجی سابیر لە گوندی کانی دڕکە، کێشەی خزمانی صاڵح کاکەبرا و عوسمانی پورزای لەگەڵ بنەماڵەی رەفیق تۆفیق تەیارە، کێشەی هۆزی گۆمەیی و بنەماڵەی رەفیق تۆفیق تەیارە کە کوڕی رەفیق تەیارە بە ناوی سامی بە کارەساتی ئۆتۆمۆبیل گیانی لە دەست دابوو. کێشەی گوندی زەرزی لەسەر خزمەتی ئەشکەوتی قزقاپان، لە نێوان کوڕانی شێخ کەریم و شێخ باوەدین.

لە ساڵی ٢٠٠٦ برادەرێك هات بۆ لام ناوی کاك حەمە تایەر بوو وتی: من باوك و باپیرم قەرەچەتانییە، باسی خۆی بۆ کردم دیار بوو لە بنەماڵەی حەمە ئاغای گۆچان بە دەست بوو، بەڵام ئامۆزاکانی خۆیان لێ نەناس کردبوو لە میراتی بێبەشکرابوو، بەڵام کۆڵی نەدابوو تا مافی خۆی لێوەرگرتبوون، ئەمەش ببووەهۆی دوورکەوتنەوەی لە خزمانی، بەڵام دەرکەوت ئەو زۆر لە خزمەکانی چاکترە، ئەم پیاوە کۆمەڵێك کوڕی هەیە نزیکەی ١٠ ماڵ دەبن لە گوندی کۆیك، رۆژێك بانگهێشتی نزیکەی ٥٠ کەسی کردبوو کە یەکێك لەوانە بەڕێز کەریم ئاغای هەمەوەند بوو خوالێیخۆش بێت، منیشی بانگهێشتکردبوو، بەڵام بۆم نەکرا بچم بەداخەوە، خزمە نزیکەکانی خۆشی بانگهێشتکردبوو نەچووبوون، بەڵێنم پێدا کە بە خێزانی سەردانیان بکەم، رۆژێك چووین بۆ دانیشتین لەگەڵیان بۆ عەسر کە چووین زۆر هەستی خزمایەتی تێدابوو، بریتی بووین لە ماڵی رەحیم و صاڵح و کوێستان و کەژان کە هەموو منداڵەکانیان پێبوو نزیکەی ٢٠ کەس دەبووین، دوای چاخواردن بە رەحیمی کوڕم وت با بڕۆین! پێیوتم: باوکە بۆ کوێ بڕۆین عەیبە ئاژەڵی سەربڕیوە، منیش

قسەم نەکرد و لە دڵی خۆمدا وتم: بۆچی دەبێت خزمی وا فەرامۆش بکرێت لەسەر میراتی، هەموو کوڕ و برا و برازا لە دەوری ئێمە بوون تا نیوەشەو بە ناو باغەکەدا گەڕاین، ئەم خزمەتەی ئەم ماڵەم هەر لە یادە کە زۆر دڵسۆزن و کۆمەڵایەتین بۆ خزمایەتی.

لە ساڵی ٢٠١٣ لەگەڵ شێخ عزەدین چووین بۆ رێکخراوی ئاسوودە بۆ چارەسەرکردنی کێشەی خێزانی، بینیمان چەند کچێك لە دەست باوك و برایان هەڵهاتبوون و لەوێ ژیانێکی پارێزراویان هەبوو، مەلا عەلی قەرەچەتانم برد لەگەڵ خۆم هەر ئەو رۆژە ٣ کچی هەڵاتوومان ئازاد کرد و لەو کوڕانەمان مارەکردن کە ئارەزوویان لێبوو، یەکێك لەو کچانە لەسەر دینی کاکەیی بوو، باوە سەید لە کوڕێکی کاکەیی مارەکرد، کاتێك تەلەفۆنمان بۆ کرد وتی: بەڵێ من مارەم کرد و بەوشێوەیە تەڵاقی دەکەوێت، ئێوەش لەو کوڕە ئیسلامەی مارە بکەن، ئێمەش بە مەلا عەلیمان وت: کە دەیزانی چۆن دەبێت لە کوڕە ئیسلامەکەی مارە بکات، من زۆر مەبەستم بوو کچێکیان بەرینە ماڵی باوکی و لەوێ مارەی بکەین، مامی کچەکە توورە بوو وتی: بزانە ساردی و پاقلاوەشمان پێ ناگێڕیت. با لێرەوە بیبات و مارەی بکات و نەیەتەوە بۆ ماڵەوە بۆ بەرچاوی براکانی، منیش وامکرد وەك ئەو چۆنی پێخۆش بوو لەوێ مارەمان کرد و دەستی من و شێخ عزەدین و مەلا علییان ماچ کرد و کۆتایی بەم کێشەیە هات. هەر سێ بنەماڵەکە بە خۆشی لە رێکخراوی ئاسوودە چوونەدەرەوە. چارەسەرکردنی ئەم کێشانە هەرچەندە ئەرکە و پاداشتی خۆی هەیە لای پەروەردگار، بەڵام خاوەن کێشەکان یەکەمجار زۆر توورەن و بێ حەوسەڵەن، بەڵام دوای چارەسەرکردنی کێشەکە کارەکانمان بەرزدەنرخێنن، چونکە ژیانی چەند کەس ئاسوودە دەبێت و

بەدوور دەبن لە کولانەوەی برینەکان و قولکردنەوەی کێشەکان و رەنگە ببێتەهۆی مردن و سەرگەردانبوونی چەند کەسێکی تر، بە تایبەتی ئەو کچە بێ نەوایانە کە لە دەست باوك و برا هەلدێن و جێگای تر شك نابەن بۆ حەوانەوەیان، ئەمەش مشتێکە لە خەرمانی کاری کۆمەلایەتی کە ئەنجاممداوە لە رابردوودا.

لە سالی ٢٠١٥ لەسەر ئەرك و گیرفانی خۆم کتێبی (قەرەچەتان بە دەوری رەشکیدا) بە چاپ گەیاند، زۆر پێوەی ماندووبووم، پاش تەواوکردنی کاری کۆمپیوتەری لە لایەن رەحیمی کورمەوە ویستم لە رێگەی بەرێوەبەرایەتی رۆشنبیری ئەم کتێبە بە چاپ بگەیەنم کە شێخ محەمەد بەرێوەبەری چاپ بوو، زۆر هەولیدا ئەمکارە بکرێت، بەلام دەستێك هەبوو لە بەشی چاپ کە نەیدەویست ئەم کتێبە کارەکانی تەواو بکرێت، تا ٣١ی ئاب ئەم کتێبەیان بە بیانووی جیاجیا لێ ون کردبووین، هەرچەندە شێخ محەمەد شاکەلی کە وەزیری رۆشنبیری بوو زۆری پێباش بوو بۆمی چاپ بکات، بەلام نەکرا، بۆیە ویستم کتێبەکە رابکێشمەوە و لەسەر ئەرکی خۆم بە چاپی بگەیەنم، پاش پێداچوونەوە تەنها داری خێزانی بنەمالەکان مابوو ئەویشمان بە کۆمپیوتەر چاپ کرد و خستمانە بەردەم چەند کەسێکی بەرێزی تر وەکو مامۆستا عەبدوللا قەرەداغی کە پێشتر بەرێوەبەری رۆشنبیری بوو، حاکم حەبیب و دکتۆر ئەرارات کە ویستی لەسەر ئەرکی خۆی بە چاپی بگەیەنێت، بەلام چەند خزمێك بیانوویان بێگرتبوو ساردیان کردەوە، دکتۆر عەبدوللا شەریف و شێخ سالار وشێخ تەیب و مامۆستا جەمال حەمەئەمین کە بەردەکەی قەرەچەتانی لە عەرەبییەوە کرد بە

کوردی، خوالێخۆش بوو ئازاد خانەقینی، سەرەنجام لە مانگی ٧ی ٢٠١٥ بە چاپمان گەیاند بە تیراژی ٥٠٠ دانە، خۆشبەختانە ئەوەی ئەم کتێبەی دیبێت دەستخۆشی کردووین، زۆر سوپاسیان دەکەین، سوپاسی هەموو ئەو کەسانەش دەکەین کە زەحمەتمان داون و ئەو ئەرکەیان خستۆتەسەر شانیان بۆ دەستکەوتنی زانیاری و کۆکردنەوەی زانیارییەکان کە خزمەتی ئەم کتێبەیان کردووە و داوای لێبووردنیش لەو کەسانە دەکەین کە گلەییمان لێدەکەن بە هەر جۆرێك بێت.

لە ساڵی ٢٠١٧ ڕۆژێك لەگەڵ عەبدوڵڵا هەمزە و شێخ عزەدین لە بارەگای مەکتەب دانیشتبووین، پیاوێك هاتەژوورەوە پاش سڵاوکردن پێمووت: تۆ من دەناسی؟ وتی: نەوەڵا. وتم: من و تۆ لە خوێندنگە پێکەوە خوێندکار بووین لە قەرەچەتان ساڵی ١٩٥٧. وتی: ڕاستە من ئەو ساڵە لەوێبووم، بەڵام تۆ ناناسم. وتم: تۆ کوڕی مامۆستا ناصر ئەفەندیت و مەسیحیت و ئیسلام نیت. وتی: ڕاستە وایە. وتم: ناوت ئومێدە و من و تۆ لەسەر یەك ڕەحلە دادەنیشتین. لەوکاتەدا لەگەڵ مستەفا ئەفەندی ماڵتان لەناو خوێندنگەکەدابوو. وتی: ڕاستە، بەڵام تۆ لە من زیرەکتربوویت، منیش پێمووت: ئێستاش لە تۆ زیرەکترم ئەوەتا من تۆم ناسییەوە و تۆ منت نەناسییەوە!

لە ساڵی ٢٠١٧ ڕۆژێك لە گۆڕەپانی گواستنەوەی پاسەکانی پیرەمەگرون بووم کارێکم هەبوو لەوێ، چەند برادەرێك هاتن بۆ لام و یەکێکیان وتی: کاك حەمەکەریم من دەناسی؟ تۆزێك لێی وردبوومەوە

وتم: ناتناسم تۆ کێی؟ وتی: تۆ منت ناوناوە، ئەوکاتەی پێشمەرگە بوویت لە گوندی قزلەر هاتویتەتە ماڵمان تازە لە دایك ببووم. وتی: من سیروانم کوڕی محەمەد ئیسماعیلم، وتم: تۆ ساڵی ١٩٨٠ لە دایك بوویت، گەنجیت بۆ وا پیر بوویت!؟ پێمووت: زۆرباش دێتەوە یادم ئەوکاتەی سەردانی ماڵی ئێوەم کرد تۆ تازە لە دایك ببووی، گەنجانی قزلەر هاتن وتیان: کاك حەمەکەریم مەڵێ پێشمەرگەین وەرن یاری بکەین، ئێمەش دەستمانکرد بە یاری کلاوکلاوێن لەگەڵیان. وتمان دەبێت لەسەر قەلەنێرە یارییەکە بکەین، دیار بوو ئەوان لە ئێمە باشتر یارییان دەکرد، ئێمە دۆڕانمان.

بەردەوامم لە کاری کۆمەڵایەتی پاشئەوەی خانەنشینکرام بە خۆبەخشانە لە مەکتەبی کۆمەڵایەتی رۆژانە دەوام دەکەم، حەز دەکەم ناوی هەندێك لەو بەڕێزانە بێنم کە کارم لەگەڵ دەکەن لەوانە: حامیدی حاجی خالید کە لێپرسراوی مەکتەبی کۆمەڵایەتییە و فەلاح محەمەد بۆر جێگری لێپرسراوی مەکتەبە، شێخ سەردار جەباری و عەبدوڵلا کوێخا هەمزەی ئاوکورتێ و دڵشاد مەرگەیی و شێخ جەمال گڵەزەردەیی و حەسەن قەڵادزێیی و ناجیح قادر گردەنازێیی، محەمەدی پارێزەر کە کوڕی خوالێخۆش بوو ئاوات مەحمودە و حەبیبی پارێزەر و پشتیوانی پارێزەر و محەمەد خدر گاپیلێۆنی و ئەحمەد کوڵکنی و دکتۆر حسەین. لە بەشی ژنان کەوسەر حەسەن و نیعمەت خان و مهاباد خانی قەرەداغ. هەڵۆ عەبابەیلێیی و حسەین گەلاڵی مەساح و محەمەد مام عەلی کە لێپرسراوی ناوەندی سلێمانییە

و لە بەشی كێشەكانی ناوەند سەلیمی حاجی ئەحمەد هەڵەدنی و وەستا حەسەن كەڵەكنی و لە بەشی كارگێڕی ناوەند مەنصور مەحمود خان و موزەفەری ئەنوەر بەگی حەمەڕەشید خانی بانە و ڕێبوار گەڕەدێی وموزەفەر ئەنوەر بەگ و عەلی حاجی مەحمود گەلاڵەیی و نامیق نۆڕكی و خەلیل شەریف هۆنەرێنە و دكتۆر عوسمان و بەكر قادر گلگاشی و ئارام عەبابەیلێیی و شێخ مستەفای حەفید و شێخ عومەر و بەرزی و عوسمان بەرگوردی و بەختیاری پارێزەر، ئازاد كەڵەكنی و محەمەد كەڵەكنی كە پێشمەرگەن.



## مشتێك لە ژیاننامەی حەمەڕەشید عەبدوڵڵا ئەمین ئەحمەدبڕەنەیی

زۆرن ئەوانەی كە سەربازی ونن و بە ئەرك و ماندوێتی و كۆڵنەدانیان هێزێك بوون بۆ وەدەرنانی داگیركەرانی ئەم وڵاتە و دەریاچەیەك بوون بۆ پاراوكردنی گوڵ و گوڵزاری ئازادی كوردستان. یەكێك لەوانەش حەمەڕەشید ئەحمەدبڕنەییە، كە لە ساڵی ١٩٢٩ لە گوندی ئەحمەدبڕنە لە دایكبووە و برای كوێخا قادری ئەحمەدبڕنەیە.

ئەم تێكۆشەرە دێوانەیەكی رێبازی كوردایەتی و دڵسۆزێكی چینی هەژاران و ستەملێكراوانی كوردستان بوو، لە سەرەتای پەنجاكانی سەدەی بیست چۆتەناو ریزەكانی حیزبی شیوعی عێراقی، كە ئەوكات بە پەناگای ستەملێكراوان و زەحمەتكێشان ناسرابوو، لە رێكخستەنەكانی ئەوكاتەی حیزب كاریكردووە و پیاوێكی چاونەترس و گورجوگۆڵ بوو، هەر لەبەرئەوەش لەناو شیوعییەكاندا نازناوی (سارۆخ)ی پێبەخشراوە. لەگەڵ كاری رێكخستندا خەریكی كاری جووتیاری بووە و هەمیشە دڵسۆز بووە بۆ خاك و نیشتمانەكەی و بەردەوام لەگەڵ جووتیارانی گوندەكەی و ناوچەكەیدا پەیوەندییەكی كۆمەڵایەتی باشی هەبووە و كەسێكی خۆشەویست و متمانەپێكراو بووە.

ئەم تێكۆشەرە لە ساڵی ١٩٦٣ لە لایەن ئەحمەد بانیخێڵانییەوە ئاگادار دەكرێت كە لەگەڵ ئەو خزمانەی سەر بە حیزب بوون بڕۆن بۆ بنكە و بارەگاكانی حیزب لە شاخی بەمۆ، كاك حەمەڕەشید و هاوڕێكانی بەڕێدەكەون بۆ بەمۆ، پاش گەیشتنیان لە لایەن حیزبەوە دەنێردرێن بۆ ناوچەی سورێن و وەڵەسمت، بە مەبەستی هێنانی چەك و پێداویستی بۆ بارەگاكانی حیزب لە بەمۆ.

کاك حەمەڕەشید و هەشت کەس لە هاوڕێکانی بەرەو سورێن بەرێدەکەون، هەرچەندە لەوکاتەدا باران و تۆفانێکی زۆر مەترسیدار بووە، بەڵام خۆیان دەگەیەننە ناوچەی نەورۆڵی و لەوێشەوە لە لایەن کەسێکەوە بەناوی حاجی رەشید کە دۆستی حیزب بووە، هاوکاری دەکرێن تا دەچنە ماڵی (میرزا حسنی نەورۆڵی) و لەوێ پشوو دەدەن و هاوکاری دەکرێن و بەرێدەخرێن بۆ سورێن و وەڵەسمت. لەوێ چەك و پێداویستییەکان لە سەرپەرشتیاری بارەگاکانی حیزب (خدر شەوکەت) وەردەگرن و دەگەڕێنەوە بۆ شاخی بەمۆ.

پاش ماوەیەك و لە بەهاری ١٩٦٣ دا لە لایەن پارتی و هەندێك خەڵکی عەشایەری ناوچەکە، پەلاماری بنکە و بارەگاکانی حیزبی شیوعی درا و پاش رووبەڕووبوونەوەیەکی سەخت و شەهیدبوونی چەند پێشمەرگەیەك لە هەردوولا، کاك حەمەڕەشید و کاك عەلی عەبدولقادر کە ناسراوە بە (عەلەڕەش)، لەگەڵ چەند پێشمەرگەیەکی تردا کە ژمارەیان چل پێشمەرگە دەبێت، دەکەونەڕێ بەرەو گوندی خێڵی باوە و لەوێ دەزانن کە بنکە و بارەگاکانیان سووتاوە و ماڵی دۆست و هاوسەنگەرەکانیان تاڵانکراوە. دوای هاوکاریکردنیان لە لایەن چەند کەسێکی خێڵی باوە بەرەو ئێران دەڕۆن و دەگەنە گوندی بانەهار، بۆ ماوەی چل رۆژێك لەو ناوچانە دەمێننەوە و دواتر دەگەڕێنەوە بۆ ناوچەی وارماوا و لەوێ حیزب بڵاوەیان پێدەکات.

ساروخ بە دەیانجار بە نهێنی چۆتەناو شارەکانەوە بەمەبەستی وەرگرتنی چارەسەری نەخۆشی، لە یەکێك لەو جارانە لە ماڵی کاك شێخ عوسمان نێرگسەجاڕی دەگیرێت و پاش پێنج مانگ ئازاد دەکرێت و

ده‌گه‌ڕێته‌وه‌ بۆ گوندی ئه‌حمه‌دبرنه‌ و په‌یوه‌ندی به‌ حیزب ده‌كاته‌وه‌ و تا نسكۆی ساڵی ١٩٧٥درێژه‌ به‌ خه‌باتی پێشمه‌رگانه‌ی خۆی ده‌دات. دواتر هه‌ر له‌ناو حیزبدا به‌رده‌وامی به‌ خه‌بات داوه‌ تا ساڵی ٢٠٠٤ خانه‌نشینكراوه‌، مه‌خابن ئه‌م پیاوه‌ ماندووه‌ خه‌باتگێڕه‌ له‌ ٢٢ / ١٠ / ٢٠٠٩ دڵه‌ گه‌وره‌كه‌ی له‌ لێدان كه‌وت و له‌ زێدی خۆی له‌ گۆڕستانی گوندی ئه‌حمه‌دبرنه‌ به‌ خاك سپێردراوه‌.



## وەسێتنامەی نووسەر

لەگەڵ ژیاننامەدا وەسێتنامە بۆ نەوەکانی دوای خۆم.. برایان و کوڕەکان و خزمەکان لەگەڵ یەکتر باش بن و چاوتان لە ماڵ و مولکی یەکتر نەبێت، لەکاتی بۆنەکاندا کۆببنەوە و لەکاتی ناخۆشیدا بەدەم یەکەوە بچن و گوێ لە وتەی خراپی ئەم یان ئەو مەگرن کە لەسەر یەکتر دەیلێن، لێبوردەبن بەرانبەر بە یەکتر، هیج نەبێ وەکو من بن کە تا ئێستا لەگەڵ هیچ خزمێك نێوانم ناخۆش نەبووە. نەوەکانی دوای من سوود لەم وەسێتنامەیە وەرگرن چەژنان بۆ لای یەکتر بچن و لە پرسەدا هەموو بەپێوەبوەستن، بەرگری لەیەك بکەن، هەولبدەن ئەو خزمەی لەگەڵ خزمێکی تر قسەی نییە ئاشتیان بکەنەوە. لە کاتی هەر ڕووداوێکی نەخوازراودا کۆببنەوە و لە خۆتان گەورەتر گوێ بگرن، بەتایبەتی ئەو خزمەقسەزان و بەساڵاچووانەی کە بەرژەوەندی خۆی لەپێناو بەرژەوەندی خزمایەتی دادەنێت. نەوەکان هەولبدەن لەگەڵ هەموو کەسێك باش بن و دۆستایەتی هەموو کەسێك بکەن و ناپیاویش لە کەس قبول مەکەن کە بییەوێت خۆی بسەپێنێت بە سەرتاندا. خوالێخۆشبوو دکتۆر قاسملۆ فەرموویەتی: کە ١٠٠٠ دۆستت هەبێت کەمە، بەڵام یەك دوژمنت هەبێت زۆرە. دەبێت هەولبدەن دۆستتان زۆر بێت و دوژمنتان نەبێت، بەقسەی هەموو کەس باوەڕ مەکەن، دۆستایەتی و هاوڕێیەتی هەموو کەس بکەن، ئەو کەسەی کە لەگەڵێ تێکەڵ دەبن با زۆربەی خزمان بە چاکی بزانن ئینجا لەگەڵێ تێکەڵ بن ئەگەر وانەکەن دوایی بە زیان دەشکێتەوە بە سەرتاندا. لەبەر حیزبایەتی دژایەتی یەکتر مەکەن هەولبدەن لەگەڵ هەموو حیزبێك باش بن حیزب نەتانکەن بەداردەستی خۆی و تووشی دوژمنایەتیتان بکات لەبەر بەرژەوەندی

خۆی. هەولبڎەن لەدەزگا سیاسییەکان ئیش بکەن نەك سەربازی. هەولبڎەن زیانی زۆر نەدەن، ئاگاتان لەو توندڕەوانە بێت کە کێشەتان بۆ دروست دەکەن، دەبێت بەقسەی نەکەن. هەولبڎەن ئاگاتان لە هەژارەکان بێت لەناو خۆتان هەرکاتێ شتێکی لێ رووبدات کۆمەکی بۆ بکەن با نەفەوتێت، هەر نەخۆشێك توانای نەبوو یارمەتی بدەن لە هەموو روویەکەوە.

خزمەکان نەوەکانی دوای من لەگەڵ هەموو تیرە و بنەماڵەکانی قەرەچەتان خزمین لای ئەم بنەماڵە لایەنگیری مەکەن و بنەماڵەکانی تر فەرامۆش بکەن، لەگەڵ خێڵ و تیرە و بنەماڵەکانی ناوچەکە نێوانتان باش بکەن بەتایبەت جافەکانی دۆڵێ سورداش، چونکە لە مێژوودا ئەوان لەگەڵ ئێمە باشبوون و کێشەمان نەبووە ئەگەر بووبێت ئەوا بە برایانە چارەسەرکراوە، لەبەرئەوە دەبێت نەوەکان ئەو دۆستایەتییە بپارێزن. هەولبڎەن لەگەڵ خێلەکانی تر هەر وەکو جاران نێوانتان باش بێت ئەگەر شت روویدا ئەوا هەولبڎەن زوو چارەسەری بکەن. هەولبڎەن با منداڵەکانتان خوێندەوار بن وەکو من و حەمەسۆیلە نەبن، ئەگەر ئێمە خوێندەواری باش بووینایە ئەوا لە سەرکردایەتی حیزبەکان جێگەی خۆمان دەکردەوە، لە هەر هەلبژاردن یان پلنیۆمێك ئێمە دەستنیشان نەدەکراین دەمانکرد بە هەرا وەلامیان دەدایەوە دەیانووت: ئێوە نەخوێندەوارن بۆ لێپرسراوی سەربازی دانراون، لێپرسراوی سەربازی یان پیشمەرگایەتی هەر خوێندەواری پێویست بوو. با نەوەکانی دوای من زۆر گرنگی بدەن بەخوێندن هەم بۆ ژیانی خۆیان هەم بۆ خزمەتی وڵات پێویستە ئەم جۆرە بڕوانامانە بە دەستبێنن وەکو دکتۆر و موهەندیس و محامی و بەرەو سەرەوە. هەولبڎەن ئەو پلانە بەدەستبهێنن نەك خوار ئەو پلانە. من

زۆر کاسپیم کرد، زۆریشم خزمایەتی کرد لە عێراق و لە ئێران نانی کەمم نەبووە، بەڵام رەفیق کەم بووم لە نەبوونی بڕوانامە.

لە ساڵی ١٩٩١ لێپرسراوی بەرەی کوردوستانی قەزای دوکان بووم لەبەر تەمەنم هەموو حیزبەکانی تر پرس و راوێژیان بە من دەکرد زۆر سەرکەوتوانە کارم بەڕێوەدەچوو، هیچی گەورە روویی نەدا ئەو ماوەیەی کە من لێپرسراوی بووم ئەگەر رووشی دابێت ئەوا برایانە چارەسەرمان دەکرد لەگەڵ علی سەرگەلوّیی و سەلامە سور و حەمەی ئاموزا کە ئەمانە هیچی نەماون، زۆرشت فێربووین لەو بوارە. ئەم ماڵێ ئەوی بردبوو بۆیان دەشاردەوە هەتا خزمی یەك بوون ئێمە بە وریایی ئەم کارەمان چارەسەر دەکرد بۆ ئەوەی هیچ شتێك روونەدات لە نێوان ئەم خزم و ئەو خزم. ئەو خزمانەی خۆم لەگەڵم بوون زۆرباش بوون بەتایبەتی کوڕەکانی مامە حسێن و مامە عەلی لەناو ئەوان صلاح زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوو رێبوار و سەرکەوت وریابوون لە بواری پێشمەرگایەتی. دوورەپەرێز مەبن لەگەڵ پیاوەکانی حکومەت وەکو بەڕێوەەری ناحیە تا وەزیر، دەبێت هەولبدەن خۆتان بناسێنن، پێتان کەم نەبێت ئێوە بنەماڵەیەکی شوڕشگێڕن و سەرتان بۆ دوژمنە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق شۆڕنەکردووە، کوردبووین و کوردایەتیمان کردووە، ئینجا بۆچی شەرم لە ئەم یان ئەو دەکەن؟! ئێوە خاوەنی ئەم ئازادییەن چەندین شەهید و ئەنفالتان هەیە، چەندین تێکۆشەرتان هەیە بۆ لای هەر کاربەدەستێك بچن دەبێت رێزی تایبەتی لە ئێوە بگرێت. ئەوەی کە دەیناسن زۆر گرنگی پێبدەن، بەڵام ئەوەی نایناسن هەولبدەن خۆتانی پێبناسێنن. ئەو کەسانە مافخوراون کە خۆیان بە زل ئەزانن ناچن بۆ لای کەس یان خۆیان بەو لێپرسراوانە ناناسینن.

نەوەکانی دوارۆژ لە دوای نەمانی من خۆتان لەو کەسانە دوور بگرن کە لەناو کۆمەڵگا نامۆن وەکو بەکتریا لەسەر لاشەی مرۆڤەکانی تر دەژین، هەوڵ دەدەن لە رێگای نامەشروعەوە خۆیان بژێنن، پارە لەم یان لەو وەردەگرن ئەڵێن ئەو مەشروعە زۆر قازانج دەکات با بۆ تۆ بێت باشە. ئەو کەسە پاکو بێگەردانە دەکەونەژێر ئەم قسەزل و هیچ لەبارانەبووانە هەر کە پارەکەی لێ وەرگرت ئیتر مەرحەبایی ناکات، هەولدەدات خۆی لێ بشاریتەوە ئەگەر ئەو کەسە پاکو بێ فێڵە تووشی بوو بەتووشییەوە بە درۆی زل فریوی دەدات تا وای لێ دێت دەبێت بەشەڕ و ناخۆشی، برایان خزمان لەبەر ئەوە خوتان بە دوور بگرن لەو کەسانە.

هەولبدەن کە بازرگانیتان کرد لەگەڵ ئەو مرۆڤانە بیکەن کە رابردوویان پاکە و بنەماڵەیەکی باشن چاویان لە ماڵێ مرۆڤەکانی تر نییە، دەبێت ئێوە نەپارەی خۆتان بە بەلاش بدەن بە کەسێکی تر نە پارەی مرۆڤی تر بخۆن، دەبێت ئێوە لە بازرگانیدا راست و پاك بن سەردەکەون ئەگەر وانەبێت ئەوا دوایی تووشی شکستی گەورە دەبن. ئینجا برایان خزمان تاقی کردنەوەی ٦٠ ساڵێ تەمەنم هەیە لەبەر ئەوە ئەم وەسێتانەم بە باشی بخوێننەوە باتوشی گێروگرفت نەبن ئەنجامی بەندیخانە یان مردن بێت. هەر کارێك بێ پرس و راوێژ بکرێت ئەوا ئەنجامی پەشیمانییە لەبەر ئەوە ئەبێت خۆتان دوور بگرن لەو کارە و مەڵێن ئێمە ماڵ و سەروەتمان زۆرترە لە گەورەکان یان خوێندەوارترین و بڕوانامەمان هەیە.

ئەو ماوەیەی کە من ژیام لەگەڵ خزمایەتی هەمووان ئەگەر کارێکی بچووك کرابێت ئەوا لەژێر کاریگەری لەخۆباییەکان بووە گوێ مەدەن بەو شتە

بچوکانەی کە کراوە لەناو خۆتان با وای لێ نەیەت، لە خۆتان زیاتر کەس نەیزانێت کە ئێوە لەگەڵ یەکتر ناکۆکن و ناگونجێن پێکەوە، دەبێت لای بێگانە قسەی خراپ بە یەك نەلێن و بەرگری لەیەك بکەن، ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت درز نەکەوێتە ناو خزمایەتی با هەمووان پشتگیریان لێ بکەن بۆ ئەوەی ئەوان براگەورەی چاك بن، ئەگەر شت روویدا زوو بچن بەدەمیەوە بۆ چارەسەرکردنی بۆ ئەوەی گەورە نەبێت و زوو چارەسەری بکەن، کاتێك گەورە بوو بە ئاسانی چارەسەر ناکرێت.

نەوەکان چاوتان لە ماڵی یەکتر نەبێت ئەگەر یەکێك لە یەکێکی تر زۆرتر ماڵ و سامانی هەبوو، باشە بۆ هەمووان سوودی هەیە. هەوڵبدەن ئەگەر پێویستیتان بە یارمەتی بوو شەرم مەکەن داوایان لێ بکەن بۆ یارمەتیداندان. هەولمەدەن بە زۆر لێیان بستێنن.

خزمان نەوەکانی دوای من.. باوکم هەموو جارێك دەیووت: کەس نەیتوانیوە زیانم پێبگەیەنێت ئەگەر خزم نەبووایە، لەبەر ئەوە دەبێت ئێوە ئەگەر خوانەخواستە خزمێك زیانی بە خزمێکی تر گەیاند هەموو سەرزەنشتی بکەن بۆ ئەوەی دووبارەی نەکاتەوە، ئەگەر دووبارە و سێ بارەی کردەوە لێی قبوڵ مەکەن هەموو کۆببنەوە و پێیبلێن ئەوەی کردووتە لەگەڵ هەموو خزمان کردووتە نەك لەگەڵ ئەو خزمە.

سەردانی یەك بکەن و خۆتان لە خزمێکیتر بە گەورەتر مەزانن، گوێ مەدەن بەوە کە فلان یان فیسار نەهاتوە بۆ ماڵم منیش ناچم، من و احمدی برام ماڵی هەموو خزمێك دەچین، بەڵام هەندێك لە خزمان خۆیان دوورەپەرێز دەگرن، بەڵام هەولبدەن زۆر سەردانیانیان بکەن تاسوودی لێ وەردەگرێت.

هەولبدەن کە نێوانتان باش بێت، من زۆر خۆم ماندووکرد، بەلاّم کەس بە چاکی نەئەزانی. خزمەکان من لە بەرەی سلێمانی هۆمەر ئاغا کەس نییە کە قسەم لەگەلیّ نەبێت، ئێوەش وەکو من بن منیش لە کردەوەی زۆر خزم رازی نیم، بەلاّم دژایەتیشیان ناکەم ناهێلمّ کەس بزانێت من لەو خزمە رازی نیم، هەولدّەدەم کە ئەو خزمە واز لەو کردارانە بێنێت ئەگەر وازی نەهێنا ئەوا خزمێکی تری لیّ ئاگادار دەکەم کە هەولیاّن لەگەلّ بدەن بوّ ئەوەی واز لەو کارانە بهێنێت کە لەگەلّ خزم دەیکەن. رێنمایی نەوەکانی دوای خوتان بکەن ژیان لە ولاّتی خۆیدا بەسەربەرێت، چونکە زۆرینەی ئەو کەسانەی کە چوون بۆ دەرەوەی ولاّت دوای چەند سالێك پەشیمانی لای دروست دەبێت بەتایبەت ئەو کەسانەی کە ژن و مندالیاّن هەیە، ئینجا وا باشترە کە هەولبدّەن لە ولاّتی خۆی ژیانی خۆی مسۆگەر بکات زۆر لەو برادەرانەی کە لەگەلّ من پێشمەرگە بوون و چوونە دەرەوە لەم دوایەدا یەك لە دوای یەك دەهاتنەوە لە ولاّتی خۆیان دووبارە ژنی تریان دەهێنایەوە و لەو ژیانەی دەرەوە بێزار دەبوون. نەوەکانی دوای من زۆر خەریك مەبن بە دروستکردنی باغی گەورە ئەگەر هەر کردیشتان بۆ سەیرانی خوّتان یەك دونم دوو ژووری تێدا بکەن دوای ٣٠ سالّ دێتەبەر دوایی وێران دەبێت و نەوەکانی دوای خۆتان ناتوانن وەکو خۆتان خزمەتی بکەن. نەوە لەدوای نەوە توانا کەم دەبێتەوە. دەبێت حکومەت باخ و سەیرانگا دروست بکات بۆ حەوانەوەی هاوولاّتیان و گەشتیاران کاتێك لە سەیرانگاکان بمێننەوە. نەوەکانی دوای من وەسێت بێت ئەگەر پارە و سەرمایەتان هەبوو لە لادێکان بەفیرۆی مەدەن، لە شارە گەورەکان بیدەن بە ملكێ بەقەدەر پارەکە ئەگەر لە شارەکان بێت رۆژ لەدوای رۆژ پەرە دەستێنێت،

بەڵام ئەگەر لە گوندەكان بێت هەر ٣٠ ساڵ جارێك گۆڕانكاری دەبێت وێران دەبێت لەبەر ئەوە هەولبدەن لە شارەكان نیشتەجێ بن و ژیان بەسەر بەرن. منداڵێ ئەوانەی خاوەن بڕوانامەن وردە وردە بنەماڵەكەی گەشە دەكات لە زۆر كێشە دوور دەكەوێتەوە و ژیانی ئاسوودە دەبێت. وەسێت بو نەوەكانی خۆم كوڕ و كوڕەزاكانم و كچ و كچەزاكانم و نەوەكانیان دوای نەمانی من ئێوە تەمەن درێژ دەبن كە گەورە بوون جارجار كۆ ببنەوە و یادی ئەوكاتە خۆشانە بكەن كە دەهاتن بۆ لای باپیرەتان، دەستە بچوكەكانتان لەملی باپیرەتان دەكرد و ئەویش روومەتە ناسكەكانتانی ماچ دەكرد و لای باپیرەتان كاتێكی كەم دەمانەوە و بە قسەخۆشەكانتان دڵێ باپیرتان دەگەشانەوە.

نەوەكانم خۆتان لە كەس بە گەورەتر مەزانن و شتی بچوك تا دەتوانن گەورەی مەكەن یارمەتی یەكتر بدەن لە كڕینی خانوو و ئۆتۆمۆبێل بۆ ئەوەی رەفیق كەم نەبن، رێگای باش و چاك لەبیر مەكەن هەولبدەن وڵات ئاوەدان بێت نەك وێرانی بكەن، نیشتمانپەروەربن سوود لە بیرەوەرییەكانی دوای باپیرتان وەرگرن و فەراموشی مەكەن.

نەوەكانم تا بۆتان دەكرێت وریابن لە خەڵكی درۆزن و دەستبڕ لە مامەڵەكانتان و پرسیار بكەن لە دەوروبەری بۆ ئەوەی ئەو كەسە لەگەڵێ تێنەكەون، ئەگەر پرسیارتان كرد بۆتان دەردەكەوێت ئەو كەسە چۆنە و بەتایبەت ئەو كەسانەی كە نایناسن، دوایی داد و پاڕانەوە سوودی نییە و كەس بەرگریتان لێ ناكات، دەڵێن بۆچی پرست نەكرد؟ ئەوسا بكەویتە داوی، چونكە ئەوانە زۆر لەوكارەیان كردووە و زۆر لێزانن و كارێكی وا دەكەن كەس باوەڕ ناكات كە ئەم برادەرە دەستبڕبێت.

نەوەکانم هەولبدەن ئەو بنەمالانەی ژنیان لێ دەخوازن پاکو بێگەرد بن باشە، پرسیار لە کەسوکار بکەن کە ئەم مالە چۆنن بەکەلکی خزمایەتی دێت لەگەلیان تێکەلّ بین لە خۆتان بایی مەبن وابزانن کەسی لە خۆتان ئاقلتر نییە دوای پەشیمان دەبنەوە و پەشیمانی چاری نییە تەنها دەبێت بە خراپی چارەسەر بکرێت یان نەوەکان ئەو بنەمالانەی کە ژنی لێ دەخوازن بەهەمانشێوە پرسیاری باش بکەن بۆ ئەوەی کردە پەشیمان نەبن ئەگەر بنەمالەکە باش بن و کێشە هەبوو باشتر چارەسەر دەکرێت، بەلام ئەگەر خراپ بن زۆر بە خراپی چارەسەر دەکرێت.

•••

وەزارەتی دارایی و ئابووری هەرێمی کوردستان

بەڕێوەبەرایەتی خانەنشینی سلێمانی

ژمارە: ١١/ل

بەروار/ ٢/٦/٢٠٠٣

ناو: كريم علي محمد حسن

ژمارە: ١١/ب

شوێنی دانیشتن: سلیمانی

ئیمزای خانەنشین: —

درەخشان احمد علي

بەڕێوەبەری خانەنشینی سلێمانی

بەڕێوبەری خانەنشینی سلێمانی/٢

رقم الهوية ..........

الاسم والشهرة .......... كريم علي محمد

الجنسية ..........

الصفة النقابية .......... عضو

محل وتاريخ الولادة ..........

المحلة ورقم المسكن ..........

رقم اجازة السوق ..........

مركز الاصدار .......... سليمانية

متزوج ام اعزب ..........

هل يقرا ويكتب ..........

تاريخ الانتساب ..........

رقم دفتر الخدمة العسكرية ..........

دائرة تجنيد ..........

- ٢ -

الرئيس السكرتير

- ٣ -

رقم المحفظة / ٦٨٩٢١
رقم الشهادة / ٥١٢٠٣٨
التاريخ ٢٦ / ٧ / ١٩٧٦

**شهادة الجنسية العراقية**

بناء على تحقق اكتساب كريم علي محمد
المثبتة صورته الشمسية اعلاه الجنسية العراقية وفق
المادة ( ١/٤ ) من قانون الجنسية العراقية فقد
منح هذه الشهادة .

مدير الجنسية

الطوابع ٦٢٥ فلسا

١ - محل وتاريخ ولادة حامل الشهادة سليمانية ١٩٤٩
٢ - الجنسية السابقة عراقي
٣ - الديانة مسلم
٤ - العلامات الفارقة لا
٥ - اسم الأب الكامل علي محمد
٦ - محل ولادته سليمانية
٧ - اسم الأم الكامل خانم
٨ - محل ولادتها سليمانية
٩ - تبعة الأب الاصلية وجنسيته الحالية عثمانية
١٠ - تبعة الأم الاصلية وجنسيتها الحالية عثمانية

الملاحظات ( تكتب بالحبر الاحمر )

توقيع حامل الشهادة ........ بصمة ابهام اليد اليسرى

الجمهورية العراقية

---

شماره ٠٧٨٦٢

نام كريم على محمد

شماره دفترچه پناهندگی ٧٥٧٢

كارت

محل سكونت سردشت

تاريخ صدور ٦٩/٥/٢١

التأريخ ١٨/٥/٩٥٩ درجات الامتحان النهائي

لسنة ١٩٥٨ – ١٩٥٩

اسم الطالب: كريم علي محمد — المدرسة: قرهچتان للبنين

الصف: الثالث — الدرجة الكاملة (١٠)

| التسلسل | الدروس | الدرجة رقماً | الدرجة كتابة | |
|---|---|---|---|---|
| ١ | الدين والقرآن | ٨ | ثمانية | السلوك: ١٠ |
| ٢ | اللغة العربية | ٨ | = | المواظبة: ١٠ |
| ٣ | الخط العربي | ٩ | تسعة | الترسيم: ١٠ |
| ٤ | اللغة الكردية | ٨ | ثمانية | |
| ٥ | الحساب | ٨ | [illegible] | |
| ٦ | الأشياء والصحة | ٨ | ثمانية | |
| ٧ | الرسم | ٩ | تسعة | |
| ٨ | الأعمال | ٩ | = | |
| ٩ | الرياضة والنشيد | ٩ | = | |
| | المجموع | ٧٧ | سبعة وسبعون | |

النتيجة: ناجح للصف الثالث

مدير مدرسة قرهچتان للبنين



**حاجی عەلی باوکی نووسەر و کوڕ و کوڕەزاکانی**

**لە راستەوە دانیشتوەکان: صالح، حاجی عەلی، رەحیم**

**لە  راستەوە وەستاوەکان: نەریمان، پەری خان، کوێستان**



بەهادین نووری و نووسەر



نووسەر لەگەڵ کاک مەحمود سەنگاوی



نووسەر لەگەڵ کاک حامیدی حاجی غالی



نووسەر لەگەڵ کاک حەسەن قەڵادزێی



نووسەر لەگەڵ کاک عاصی شێخ محەمەدی کارێزە



شەهید شێخ کاوەی حەفید



عەلی شەریف ناسراو بە عەلی سویلە



شەهیدی داستانی قزلەر مامۆستا شەفیق



پۆلی پێشمەرگەی حزبی شیوعی



محمد شەریف ناسراو بە محمد سویلە



حسین شەریف ناسراو بە حسین سویلە



شەهید جلال زەلانی



شەهید تایەری حاجی قادر و شەهید عمر قەڵادزێی


کۆچکردوو کەریم بەگی موغاغ


کۆچکردوو حەمەسەعید قەرەداغی



**لەڕاستەوە: کۆچکردوو شێخ ئەحمەد برنەیی، قادری حاجی محەمەد ناسراو بە (ئەسکەندەر)، قادر فارس بانیخێڵانی، مامۆستا ئەنوەر نامیق.**



شەهید مامۆستا حەسەن وێڵەری، ناسراو بە دارا



شەهید زاهیری محەمەد قڕگەیی



شەهید شێخ محەمەدی نانەوا



شەهید حمەئەمین ئەحمەد گەبەیی (تۆکمە)



کۆمەڵێك پێشمەرگە لەگەڵ نووسەر لە کوێستانی تووژەڵە



پۆلی پێشمەرگەی حزبی شیوعی



کۆمەڵێك پێشمەرگە حزبی شیوعی



نووسەر و پۆڵی پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە کەڕەجاڵ




سامی وەستا سابیر و پێشمەرگەیەکی عەرەب



پەروین عەلی، خێزانی سامی وەستا سابیر هەورامی (پێشمەرگەی ژن)



لەسەر گۆڕی مامۆستا قادر لە گوندی باراو



لە راستەوە: سامی و بێکەس پێشمەرگەی حزبی شیوعی



**نەناسراو ، عبداللەی مام فرج ناسراو بە مەلا عەلی ئەندامی هەرێمی حزبی شیوعی لەگەڵ سامی**



**عەلی بچکۆڵ و برادەرەکانی**



**پۆلێ پێشمەرگەی تێکۆشەری حزبی شیوعی**



**نووسەر و سامی و جەمال، لە شاخی مامەندە**




**پۆلێ شەهیدی حزبی شیوعی لە داستانی بۆڵقامیش**



شەهید سەید تۆفیق سەید قادر صالح عەبابەیلێی



پۆلێ پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە گوندی ئەحمەد بڕنە

لەڕاستەوە: عەبدولقادر فارس، نووسەر، حمەڕەشید قەرەداغی، نەناسراو.



نووسەر، داستانی نەوەر



نووسەر، حمەڕەشید قەرەداغی، عەبدولقادر فارس



کۆمەڵێك پێشمەرگەی حزبی شیوعی لە گوندی دولکان




یەکەم هەڵبژاردنی پەرلەمانی کوردستان / پیرەمەگرون



**لەڕاستەوە: قادری حاجی تۆفیق، ناجحی حاجی قادر، نووسەر، مەلا ئەحمدی پێنجوێنی**



**نووسەر لەگەڵ کەریم ئاغای هەمەوەند**



**نووسەر لەگەڵ شێخ محەمەد کەسنەزانی**



کوێخا سمایلی تەلان و کوڕەکانی



لەڕاستەوە: مەلا ئەحمەد پێنجوێنی، حەبیب جاف، نووسەر



نووسەر لەگەڵ هاوڕێیانی لە مەکتەبی کۆمەڵایەتی



لەڕاستەوە: عومەری حاجی سەعید، نووسەر، نیعمەت خان، وەستا حەسەن کەڵەکنی



ئەحمەد عبداللە کوردە، ناسراو بە ئەحمەد سمێڵ



شێخ مەحمودی شەدەڵە



نووسەر و کۆمەڵێك پێشمەرگەی دێرین



**کەریم قزلەریی، نووسەر، موزەفەر ئەنوەر حەمەڕەشید خانی بانە**

کاک حەمەکەریم قەرەچەتانی بە زمانێکی سادە و دوور لە هەر ئاڵۆزییەک بیرەوەرییەکانی نووسیوەتەوە، لە کاتی خوێندنەوەیدا هەست دەکەیت لە شانۆییەکدا دانیشتوویت و تێکەڵ بە رووداوەکانی دەبیت. من تا ئێستا چەند کتێبێکی بیرەوەریم خوێندۆتەوە، لەناویاندا بیرەوەرییەکانی ئەکتەری کۆمیدی چارلی چاپلن، یەکێک بوو لەوانەی کاریگەری گەورەی لەسەر دانام، بەڵام ئەم بیرەوەرییانەی ئەم پێشمەرگەیە هێندەی ئەوەی چاپلن و زیاتریش کاریگەری خۆی لەسەر دانام، بەشێوەیەک هەستم دەکرد، منیش یەکێک بم لە کەسایەتییەکانی ناوی، لە زۆر شوێندا ناچار دەبووم دووبارە بیخوێنمەوە، تا وردتر رۆبچمەناو رووداوەکان و هەست بە زینگەی کاتی رووداوەکان بکەم.

ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبدەم ئەوەیە، کاک حەمەکەریم زۆر بە وردی ساڵ و شوێن و کەسەکانی ناو رووداوەکانی ئاماژە پێکردووە، لە زۆر شوێندا وەسفی شوێنی رووداوەکانیشی کردووە، ئەمەش وا لە خوێنەر دەکات تەواو بچێتەناو رووداوەکان و هەست بکات مێژوویەکی راست و دروست دەخوێنێتەوە.